# بیرەوەریەکانی

# محەمەد شاپەسندی

ئامادەکردنی

سدیق ساڵح

بنکەی ژین

سلێمانی ٢٠٠٧

٩٢٠,٥
س ٨٤٥ سدیق سالْح
بیرەوەریەکانی محەمەد شاپەسندی/ ئامادەکردنی سدیق سالْح.-
سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٧.
٢٧٢ل: ١٧,٥×٢٥سم، پاشکۆ.- (زنجیرە: ٧٦)
١- شاپەسندی، محەمەد- بیرەوەری. ٢- ناونیشان ٣- زنجیرە؛ ٧٦
کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتاییی پۆلێن و پێرستی ئامادە کردووە

سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق سالْح

زنجیرە: ٧٦
کتێب: بیرەوەریەکانی شاپەسندی
ئامادەکردن: سدیق سالْح
تایپ: سیروان خەلیل
مۆنتاج: لاس
ڕووبەرگ: شاروخ ئەرژەنگی
خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید
تیراژ: ١٠٠٠
نرخ: ٣٥٠٠ دینار
ژمارەی سپاردن: ٩٢٤ی سالْی ٢٠٠٧
شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

لە بلاْوکراوەکانی
بنکەی ژین
بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەلْگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی
هەرێمی کوردستان: سلێمانی، ئەندازیاران، گەڕەکی ١٠٥، کۆلاْنی ٥، خانووی ٢٣
نۆرمالْ: ٣١٢٩١٠٢ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ یا ٠٧٧٠١٤٦٤٨٣٣ سانا: ١١٢٨٣٠٩
E-mail: bnkaizhin@yahoo.com

## پێشەکی

دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ کە کاک جووتیار تۆفیقم ناسی، یادی بەخێر، جاروبار باسی مامۆستا محەمەد شاپەسندیی لەلا ئەکردم. ڕێ نەکەوت لەنزیکەوە بیبینم. ئیتر کاک جووتیار بەسەریدا چووە وڵاتی سوید، بەڵام لەوێشەوە هەر دڵێکی لەلای ئەو پیاوە بوو، هەتا ڕای سپاردم بیناسم و هەوڵ بدەم بیرەوەریەکانی تۆمار بکەم.

سەرەتای ساڵی ٢٠٠١ بەهۆی بەڕێز "سوارە قەڵادزێیی"یەوە بە خزمەتی گەیشتم، لە ماڵیان نزیکی مزگەوتی گەورەو بەپشت (چاپخانەی نەورەس)ـەوە. ئەو ماوەیە دەرفەتم هەبوو، ناوبەناو سەرم لێ دەداو ڕووم لێ دەنا بیرەوەریەکانی خۆی یا بنووسێتەوە یان تۆماری بکەین؛ هێندەی مەبەستم بیرەوەریی خۆی بوو وەك ئاگادارێکی ئەو ڕۆژگارە، ئەوەندەو بگرە زیاتریش نووسینەوەی نهێنی و وردەکاریەکانی ژیانی تایبەت و سیاسیی عەبدوڕەحمانی زەبیحی بوو، کە ئەو بە حوکمی ئەوەی ساڵانێك هاوخەباتێکی هەرە نزیکی بوو، زانیارییەکی زۆری لەبارەوە هەبوو. سەرەتا نەدەچوە ژێر باری کارێکی وا؛ بە بەهانەی ئەوەی کە گوایە بیرەوەریی بابایەکی وەکوو ئەو سوودێکی ئەوتۆی نییە، جگە لەوە، گەلێك ڕاستی هەن ناتوانین، لەبەر هەر هۆیەك بێ، بیاندرکێنین!

دواجار کە لە نیازپاکیم بۆ مەسەلەیەکی وا دڵنیا بوو، قەناعەتی کردو دەستمان پێ کرد. ڕۆژانی ٢١و ٢٠٠١/٥/٢٣ ماوەی سێ سەعات و نیوم لە بیرەوەریەکانی لەسەر شریتی کاسێت تۆمار کرد. بەڵام لە ڕۆژی دووەمیاندا لە ناکاو کارەکەی ڕاگرت، وتی خۆم دەینووسمەوە. منیش پێم باشتر بوو خۆی بیرەوەریەکانی بە وردی و هەمەلایەنە بنووسێتەوە. ئەوەبەدوا کە بەردەوام حەفتانە سەرم لێ دەدا، لێم دەپرسی گەیشتوەتە کوێ، هانم دەدا زۆرترین زانیاری بهێنێتەوە. دیارە ئەویش، لەبەر بەساڵاچوویی و نەخۆشیی بەتایبەت تەنگەنەفەسی، نەیدەتوانی ئەو کارە بەگورجی ڕاپەڕێنێ. ئەو ماوەیە جاروبار هەستم دەکرد لە نووسین سارد بووەتەوە، لەبەر هەر مەبەستێك بووبێ، دوای خستووە. بەڵام کۆڵم نەدا، هەموو جارێك پتر هانم دەدا ڕاستیەکان لەگەڵ خۆیدا نەباتە گڵەوە.

ئاخروئۆخری ٢٠٠٥ نووسینی بیرەوەریەکانیی بە تەواوبوون گەیاند. ڕۆژێکیان سێ دەفتەری گەورەی نووسراوی خستە بەردەستم، گوتی: ((ئەوە بیرەوەریەکانمە. بەڵام تکام وایە خۆت بەوردی بیخوێنیتەوە، باسەکانی کە پاش و پێشیان تێکەوتووە، ڕێکیان بخەیتەوە. لە باری زمانەوانی و بەتایبەت ڕێنووسەوە سازی بکەیتەوە. سەرپشك بە، چۆن باشە وا دەستکاریی بکە. دەکرێ دوایی لێی زیادو کەم بکەین)).

نایشارمەوە، لە دوادواییەکانی (٢٠٠٤)ەوە کە (بنکەی ژین)مان دامەزراند، بەندە پشکێکی زۆر گەورەی هەڵسووڕاندنی کاروباری لەچاپدراوەکانیم کەوتە ئەستۆ، تائێستا نەمتوانیوە وەکوو پێویست پرۆژەکانی نووسینی خۆم درێژە پێ بدەمو بەدوایاندا بچمو تەواویان بکەم. ئەم بیرەوەریانەی ڕەحمەتیش بە هەمان دەرد چوون، چونکە دەمویست سەرجەمی وێنەو چاوپێکەوتنو نووسینەکانیشی کۆ بکەمەوە. ئەگەر بشێ تاقە ژمارەکەی گۆڤاری "ئاوات"یش پەیدا بکرێو بخرێتە تەکیان. ئەم کارە کاتو لێبڕانی گەرەك بوون، کە بەداخەوە لەبەر حاڵوباری خۆم بۆم ساز نەدەبوون. داخو کەسەرێکی گەورەم ئەوە بوو کە چەند مانگێکی کەمی پێچوو، مامۆستا شاپەسندی لە ٢٠٠٦/٢/١٥دا کتوپڕ کۆچی یەکجاریی کردو ئەم بیرەوەریانەی بە لەچاپدراوی نەبینی. ئیتر منیش لە دەرفەتدا لەبەرەوە کەوتمە پێداچوونەوەو ڕێکخستنەوەی بیرەوەریەکانو کۆکردنەوەی نووسینەکان. خۆشبەختانە کاك جووتیار تۆفیق لەم ماوەیەدا کۆپییەکی "ئاوات"ی نارد، کە لە بەڕێز سەیید عەبدوڵڵای صەمەدیەوە بەدەستی گەیشتبوو، سوپاسی هەردوولا دەکەم. جێی وتنە، ئەو گۆڤارە ١ی خەزەڵوەری ١٣٢٤ی هەتاوی (٢٣ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥) بە پێوانەی (١٥×١٩,٥ سم)و بە ٢٠ لاپەڕە دەرچووە.

ئەوەم لەدڵدا گرانە کە لەبەر سەرقاڵیو درەنگ کەوتنی چاپی ئەم بەرهەمە، کەوا پێم باش نەبوو لەوە زیاتر دوا بخرێ، نەپەرژام لە هەلێکدا کۆپییەکی بیرەوەریەکان بنێرمە لای کاك جووتیار تا -وەك خۆیشی پێشتر پێشنیاری کردو هەردوکمان پێمان خۆش بوو- پێیدا بچێتەوە. هیوامە ئەوەم بە سنگێکی فراوانەوە لێ وەر بگرێ.

پێویستە بڵێم کاك ئەحمەدی کوڕی ڕەحمەتی -بەسوپاسەوە- هاوکارییەکی زۆری کردم. ئێستایش ئەگەرچی ئەم بیرەوەریانە بەم شێوەیەی بەردەست دوای چاوەڕوانیو هەوڵێکی درێژخایان ڕووناکییان بینی، نیگەرانم کە شاپەسندی لە ژیانی خۆیدا، وەك زۆر بەعەزرەتەوە بوو، نەیدی؛ دوای مەرگیشی دواکەوت. گیانی بە بەهەشتی بەرین شاد بێ.

**سدیق سالح**

٢٩ی ئەیلوولی ٢٠٠٧

## سەرەتاکانی ژیان

تا ساڵی ١٣٠٧ی هەتاوی (سابلاخ- مەهاباد)، وەك زۆر لە شارەکانی دیکەی کوردستان، دایرەی نفووسی تێدا نەبوو. ئەو بنەماڵانەی کە منداڵیان دەبوو، لەپشت بەرگی قورئانی پیرۆز یا کتێبێکی وەك گولستان و بوستانی شێخی سەعدی ناوی منداڵەکەو تاریخی لەدایکبوونی دەنووسرا.

تاریخی لەدایکبوونی منیش هەر وابووە. باوکم دەیگێڕایەوە: ئەو ساڵەی کە "سمایل ئاغای سمکۆ" سابلاغی تالان کرد، من یەکساڵە بووم. لەگەڵ خوشکێکی لە خۆم گەورەتر بە نەخۆشیی ئاوڵە لەناو جێگادا کەوتبووین، شکاکەکان تەنانەت ئەو پەڕۆو پاڵەی کە لەسەری کەوتبووین، بەتالان بردوویانە. لام وایە هەر لەبەر پەشێوی و ناهەمواریی بارودۆخ بووە کە باوکم ماڵ و منداڵی هەڵدەگرێ و بەرەو (قاجری)ی نزیك (سنە) کۆچ دەکات، پاش ماوەیەك دەربەدەری و هەژاری ناچار دەبێ دیسان بگەڕێتەوە بۆ سابلاخ.

بەهاری ساڵی (١٣٠٧)ی هەتاوی (١٩٢٨ زاینی) دایرەی (نفووس) لە سابلاخ لە گەڕەکی (مزگەوتی سوور) دامەزرا. پاش هەفتەیەك لەگەڵ باوکم بۆ وەرگرتنی ناسنامە لەوێ ئامادە بووین. دایرەی نفووس تەمەنی منی بە لەدایکبووی (١٣٠٢)ی هەتاوی، واتە پێنج ساڵانە، لەقەڵەم دابوو، بەڵام بێگومان تەمەنم لەوە زیاتر بوو، چونکوو بە قسەی باوکم ئەگەر ساڵی تالانی سابلاخ لەلایەن سمکۆوە، تەمەنم یەك ساڵانە بووبێ، پێویستە ساڵی لەدایکبوونم (١٩٢٠) هەزارو نۆسەدو بیستی زاینی، واتە (١٢٩٩) ساڵی هەزارو دووسەدو نەوەدونۆی هەتاوی بووە.

بێگومان ئەم تاریخە زۆر ڕاستترە لە هینەکەی دایرەی نفووس، چونکە ئەوکاتە ساڵی ١٣٠٧ی هەتاوی بوو، هەرای مەلا خەلیل دەستی پێکردبوو، من لە قوتابخانەی پەهلەوی لە کۆڵانی بەرامبەری مزگەوتی سەید نیزام لە پۆلی (تەهییە)، واتا پێش پۆلی ئەووەڵی سەرەتایی، دەمخوێند. کاتێك مەترسی پەیدابوو، خاڵم "میرزا مستەفای ڕەحیمی" بردمیەوە بۆ ماڵی خۆمان. ئەمە جگە لەوەی کە ماوەیەکیش لە قوتابخانەی فەقێ خەلیل، بانگدەری مزگەوتی سەید نیزام، دەرسی قورئانی پیرۆزم خوێندووە. بەداخەوە شارەزایی باشم لە باوانی بابم نییە، تەنیا ناوی باپیرم نەبێ کە ناوی

"سەعیدی شاپەسندی" بووە، دوو کوڕی هەبوە: گەورەکەیان بابم "محەمەدسالّح" شاپەسندی، ئەوی تریان ناوی "لەتیف"و بە گەنجی وەفاتی کردووە. باپیرم "سەعید" لەناو عەشیرەتی (گەورك)ـەوە هاتۆتە سابلاّخ و خەیاتیی کردووە. وشەی (شاپەسند) ناوی دایکی باپیرم بووە، ئافرەتێکی ژیرو بلیمەت و ڕەشید بووە، دیوەخانی تایبەتی خۆی هەبوە. دایکی بابم "خاتوو مرۆت" ئافرەتێکی ویندارو تێگەیشتووی موریدی پیرانی نەقشبەندی "شێخ حیسامەددین"ی تەوێڵە بوو. بابم، وەك باپیرم خەیات بوو، دوو شاگرد خەیات بەردەوام لە ماڵمان خەریکی کاری خەیاتی بوون. لە پاییزدا کە بازاڕ گەرم و کار زیاتر دەبوو، ناچار دەبووین دوو شاگردی تر پەیدا بکەین تا کار دوانەکەوێ. شەوانی پاییز تا نیوەشەو (شەوکار) بەردەوام بوو. شەو و ڕۆژی هەینی بۆ پشوودان تەرخان کرابوو، شەوی هەینی شاگردەکان دوای نانخواردن دەگەڕانەوە ماڵی خۆیان. لەو سەردەمەدا بەشی زۆری کارو کاسبی لە سێ مانگی پاییزدا بوو.

ساڵی لەدایکبوونی بابم بۆ ساغ نەبۆتەوە. ئەوەندە دەزانم لە حەفتا ساڵ زیاتر ژیاوەو لە ١٣ی ڕەشەمێی ١٣٤٦ی هەتاوی (١٩٦٧ی زاین) لە مەهاباد وەفاتی کردووە؛ مرۆڤێکی دڵ و داوێن پاك و دیندارو قورئانخوێنێکی دەنگخۆش بوو. دایکم "ئامینەی ڕەحیمی" کچی میرزا ڕەحیمی (چاوڕەشان) لە بنەماڵەیەکی کۆن و بەناوبانگی سابلاّخ بوو. دوو خاڵم هەبوو: میرزا عەبدولخالق ڕەحیمی و میرزا مستەفای ڕەحیمی. نەنکم، دایکی دایکم، ناوی "ئەشرەفی" بوو، ماڵیان لە بازاڕی (حەمەخرچە)ی نزیك (مزگەوتی حاجی سەیید باین) بوو. بەداخەوە لە ساڵی (١٩٤٦)ـەوە کە لە مەهاباد دوورکەوتمەوە، تائێستا نەمتوانیوە لە پرسەی دایك و باب و هیچ یەك لە کەسوکارو خزمانی خۆمدا ئامادە و بەشدار بم.

پۆلی ئەووەڵ و دووەمی قوتابخانەکەم لە گەڕەکی (ڕزگەریان)ی نزیك (مزگەوتی ڕۆستەم بەگ)، خانووی عەزیز ئاغای (قوڕمیش)، لە قوتابخانەی (سەعادەت) خوێندووە. پۆلی سێیەم و چوارەمم لە قوتابخانەی (پەهلەوی)، لە خانووی (مەلا ناسر)، ڕۆژهەلاّتی (مزگەوتی سەید نیزام)، پۆلی پێنج و شەشم لە قوتابخانەی (سەعادەت) لەپەنا ماڵی موهاجیری خوێندووە. مامۆستاکانمان لە مەدرەسەی (سەعادەت) پیاوانی زاناو بەناوبانگی ئەوکاتە وەك: مەلا قادری مودەڕریسی،

حەسەنی مودەرریسی، میرزا ئیبراهیم قازی، مامۆستا فازیلی، مامۆستا محەمەدی ئەسحابی، مامۆستا عەلی مەحموودی، مامۆستا قاسم قادری، مامۆستا موبەللیغی بوون. ئەم مامۆستایانە هەوڵیان دەدا هەستی فەرهەنگی و ئەدەبی و زانستی لە مێشکی قوتابییەکاندا وەئەگا بێنن؛ لە پۆلی پێنج و شەشەمدا لێکدانەوەو شیکردنەوەی شیعرە فەلسەفیەکانی عومەری خەیام، حافزی شیرازی و سەعدی بەلامانەوە ئاسایی بوون.

## مانگرتنی قوتابیان لە مەهاباد لە ١٣١٤ (١٩٣٥)دا

لە قوتابخانەی (سەعادەت) لە پۆلی شەش بووین، ڕۆژێك دەنگ بڵاوبۆوە کە مەلا قادری مودەرریسی دەگوێزرێتەوە بۆ قوتابخانەیەکی دیکە. ئەم هەواڵە بەلای قوتابییەکانەوە ئەوەندە تاڵ و ناخۆش بوو، باری ئارامی پۆلەکەمان و هێندێك لە پۆلی پێنجەمیشی شێواند؛ بوو بەهۆی ناڕەحەتی و ناڕەزاییی گشت ئەوانەی ئاگاداری مەسەلەکە بوون. ئەوکاتە قوتابخانەکان دوو دەوامیان هەبوو، دەوامی بەیانی تەرخان بوو بۆ سێ دەرس، دوای نانخواردنی نیوەڕۆ دەگەڕاینەوەو دوودەرسی ترمان دەخوێند. ئەو ڕۆژە بەشێك لە قوتابییەکانی دەوامی ئێوارە بۆ دەربڕینی ناڕەزایی نەگەڕانەوە بۆ قوتابخانە. ئێمە تەنیا ١٥-١٧ کەسمان لەوێ ئامادە بووین. بڕیارمان دا مان بگرین و سوور بین لەسەر ئەوەی کە تا ئەمری گواستنەوەی مامۆستا پووچەڵ نەکرێتەوە، لە قوتابحانە دەرنەچین. زۆری نەخایاند بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بە هەناسەبڕکە خۆی گەیاندە قوتابخانەو بەپەلە ناردی بەشوێن باوکی مانگرتوەکانداو هەڕەشەی لێکردن، ئەگەر زۆر زوو کۆتایی بەم (منداڵ بازاڕییە)! نەهێنن، بازداشت دەکرێن و قوتابییەکانیش لە قوتابخانە دەردەکرێن! لام وایە ئەم مەسەلەیە ئەووەڵ مانگرتنی قوتابیان بوو لە مەهاباد کە بە هەڕەشەو گوڕەشەی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە کۆتایی پێهات!

## قەدەغەکردنی جلوبەرگی کوردی لە کوردستان

ساڵی ١٩٢٨ز-١٣٠٧ی هەتاوی، حکوومەتی ڕەزاشا بەکارهێنانی جلوبەرگی کوردیی لە کوردستاندا قەدەغە کرد. بەرگدرووەکان لە سابلاغ و شارەکانی تری کوردستان، هەڕەشەیان لێکرا کە ئیتر جلوبەرگی کوردی ئامادە نەکەن! ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە فەسڵی پایزو سەردەمی کارو کاسبی بوو؛ لەکاتێکدا بوو کە جلوبەرگی ئامادەکراوی بێژمار لە دووکان و بازاڕەکاندا عەمبار کرابوو. مەبەستی

حکوومەت ئەوە بوو خەیاتەکان ناچار بکات دەست لەم ئیشە هەڵگرن؛ بۆ ئەم مەبەستە, شارەبانی دەستی کرد بە مۆرکردنی گشت ئەو جلوبەرگەی کە تا ئەوکاتە لە بازاڕدا هەبوو. چۆنیەتی مۆرکردنەکەش بەم جۆرە بوو: دوو وشەی فارسی (معاینە شد) لەسەر پارچە (چینکۆیەك) هەڵکەندرابوو؛ ئەم کلێشەیە بە فلچەو مەرەکەبی سوور دەخرایە سەر داوێنی بەری کەوا یا مرادخانی, تا خەیات نەتوانێ لەمە زیاتر ئامادە بکاتو بیفرۆشێ؟! بەڵام, لەلایەکی ترەوە, هیچ بەرگدروویەك لە دەروونی خۆیدا ئامادە نەبوو وا سووكو ئاسان دەست لە پیشەی بابو باپیرانیو ڕزقو ڕۆزیی ماڵی هەڵگرێو دابو نەریتی سەدان ساڵی نەتەوەکەی فەرامۆش بکات. بۆیە هەر زۆر زوو بە نهێنی لە ماڵی خۆمان مۆرێکی ئەوتۆ سازکرا. دوای ئەمەش ئیتر ماڵە خەیات نەمابوو لە ماڵی خۆیدا بە نهێنی مۆری شاردراوەی نەبێ!

دوای ماوەیەك لە ئاکامی زەبروزەنگی حکوومەتو ئەزیەتو ئازاری ئەم کوردانەی کە ئەم چەشنە جلوبەرگەیان دەپۆشی, وای لێهات تەنیا ئەو پیرو پەککەوتانەی وا کەمتر پێویستیان بە هاتوچۆی ناو شار دەبێ، بەکاری بێنن. جگە لەمەش، گیروگرفتی شەڵواری کوردی لە گشت کێشەکان زیاترو ناخۆشتر بوو، چونکە پۆلیس شەڵواری لە پێی هەر کەسدا چاوپێکەوتبا، لەپێی کابرادا (نافەك)یان دەبڕیو دوایی حەپسیان دەکرد. بێگومان زۆر کەس ئاگادارە مەسەلەی نافەکبڕین لە کوردەواریدا، خۆی عەیبێکی گەورەو ئابڕووبەرانەیە؛ تەنیا بەرامبەر بەو کەسانە ئەنجام دەدرێ کە تاوانی بێشەرمانەو سەرشۆڕکەرانەیان لە دەست دەقەومێ. هەر لەبەر ئەوە بوو ئەوکاتە زۆر کەس لە خۆیانەوە نافەکی شەڵوارەکانیان بچووکترو تەسکتر دەکردەوەوە، تا بەدەست پۆلیسەوە تووشی سووکایەتی نەبن!؟

### کڵاوی پەهلەوی

ئێستا کێشەی مەلا خەلیل تەواو نەبووبوو، کۆمەڵێکی دانیشتوان لەناو شاری مەهاباد مەزبەتەیەکیان مۆرکرد، داوایان لە ڕەزا شا کرد بیانبەخشێ لە بەکارهێنانی کڵاوی پەهلەویو جلوبەرگی نوێ. دوو هاووڵاتی، میرزا سوڵتانی فیردەوسیو وەستا عەوڵای شوانی ناوان، ئەم مەزبەتەیەیان ئامادەو خەڵکێکی زۆر ئیمزای کردبوو. دایرەی شەهرەبانی نزیکەی سەدوپەنجا کەسی گرت، لە خانووی (موعتەمەد) لە گەڕەکی (مزگەوتی سوور) زیندانی کردن. باوکم، وەستا ساڵحی شاپەسندی، یەکێك

بوو لەو بازداشتیانە؛ هەموو ڕۆژێ لەگەڵ خوشکێکی لە خۆم گەورەتردا خۆراکمان بۆ دەبرد. من منداڵ بووم، حەرەسەکان دەیانبردم بۆ لای باوکم، خواردنەکەم ڕۆدەنا؛ ئەگەر قسەیەکی هەبایە, پێی دەگوتمو دەگەڕامەوە. ئەم گیراوانە ماوەیەکی باش لە زینداندا مانەوە: کاتێ کێشەی مەلا خەلیل دوایی هات, زیندانیەکانیش ئازاد کران.

## حیسابی سیاق

ساڵی خوێندنی (١٣١٣-١٣١٤)ی هەتاوی (١٩٣٤-١٩٣٥ی زاینی) پۆلی شەشەمی سەرەتاییم تەواو کرد. ئەوکاتە مەهاباد قوتابخانەی سەرەتایی زیاتری تێدا نەبوو, ئەوانەی کە خوێندنی سەرەتایی‌یان تەواو دەکردو نیازی درێژەدان بە خوێندنیان هەبوو, پێویست بوو لە ورمێ لە دانیشسەرای سەرەتایی یا قۆناغی ناوەندی بخوێنن. ئەو ساڵە زۆر لە ئاوەڵدەرسەکانم وەك ڕەحمانی حەلەوی, هاشم شیرازی، یووسفی شافیعیو ... بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕوویان کردە شاری ورمێ. بەڵام باوکم کە پێی خۆش نەبوو دوور بکەومەوە, کاسبیی ئازادی بەلاوە باشتربوو تا کارمەندیی حکوومەت! بۆیە بۆ ئەوەی ڕێوڕەسمی بازرگانیو دەفتەرداری فێرببم, لای بازرگانێکی تەورێزی (ئازەری) کە لەمێژ ساڵ بوو دانیشتووی مەهاباد بوو, بە شاگردی دایمەزراندم.

ئەوکاتە بازرگانەکان حیسابێکی تایبەتیان لە ئێران بەکار دێنا کە لەگەڵ ڕەقەمە ئاساییەکانی ئێستادا جیاوازیی زۆر بوو. ئەم حیسابە لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەستی پێدەکردو بەهۆی حاسیبەیەکی خۆماڵیو سەرەتایی کە پێی دەوترا (چۆرت) چوار کاری سەرەکیی بیرکاریی پێ جێبەجێ دەکرا.

## دراوی ئێران لەکاتی پادشایی ڕەزاو حەمە ڕەزا شادا

بچووکترین پارەی ئێران لە سەردەمی پەهلەویدا بریتی بوو لە (شایی)؛ لە مەعدەن دروست دەکراو پێنج دیناری لەسەر نووسرابوو، بەڵام لە زەمانی قاجاریەکاندا یەك شایی (٥٠) دیناری لەسەر دەنووسرا:

شێوەی نووسینی حیسابی سیاق لە یەك شایی‌یەوە تا سەدهەزار تمەن:

| ١ شاي | ٢ شاي | ٣ شاي | ٤ شاي | پێنج شاي | ٦ شاي | ٧ شاي | ٨ شاي |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٩ شاي | ١٠ شاي (پەنابادێك) | ١١ شاي | ١٢ شاي | ١٣ شاي | ١٤ شاي | ١٥ شاي | ١٦ شاي |
| ١٧ شاي | ١٨ شاي | ١٩ شاي | ٢٠ شاي يەك ريال | ٢ ريال | ٣ ريال | ٤ ريال | ٥ ريال |

| ٦ ريال | ٧ ريال | ٨ ريال | ٩ ريال | ١٠ ريال يەك تمەن | ٢ تمەن | ٣ تمەن | ٤ تمەن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٥ تمەن | ٦ تمەن | ٧ تمەن | ٨ تمەن | ٩ تمەن | ١٠ تمەن | ١١ تمەن | ١٢ تمەن |
| ١٣ تمەن | ١٤ تمەن | ١٥ تمەن | ١٦ تمەن | ١٧ تمەن | ١٨ تمەن | ١٩ تمەن | ٢٠ تمەن |
| ٣٠ تمەن | ٤٠ تمەن | ٥٠ تمەن | ٦٠ تمەن | ٧٠ تمەن | ٨٠ تمەن | ٩٠ تمەن | ١٠٠ تمەن |
| ٢٠٠ تمەن | ٣٠٠ تمەن | ٤٠٠ تمەن | ٥٠٠ تمەن | ٦٠٠ تمەن | ٧٠٠ تمەن | ٨٠٠ تمەن | ٩٠٠ تمەن |
| ١٠٠٠ تمەن | ٢٠٠٠ تمەن | ٣٠٠٠ تمەن | ٤٠٠٠ تمەن | ٥٠٠٠ تمەن | ٦٠٠٠ تمەن | ٧٠٠٠ تمەن | ٨٠٠٠ تمەن |
| ٩٠٠٠ تمەن | دە هەزار تمەن | ٢٠٠٠٠ تمەن | سی هەزار تمەن | چل هەزار تمەن | ٥٠ هەزار تمەن | ٦٠ هەزار تمەن | ٧٠ هەزار تمەن |
| سەد هەزار تمەن | دووسەد هەزار تمەن | ٣٠٠ هەزار تمەن | ٤٠٠ هەزار تمەن | پێنج سەد هەزار تمەن | | ٠٠٠ هتا دوایی | |

ئەم جۆرە حیسابە، پێویستیی بە چەند دەفتەر هەیە: وەك:

١- دەفتەری دەستەك: ئەم دەفتەرە وەك دەفتەری موسەوەدە وایە كە پێویستە مەوجوودی نەقدی (پارە) بەردەوام لە سووچی لای ڕاستی دەفتەرەكەدا دیار بێ، ئینجا هەر پارەیەك یا شتومەكێ كە بۆ ئەم بنكە بازرگانییە دێ یا لێی دەردەچێ، پێویستە ئاماژەی پێ بكرێ، تا هیچ شتێك لەبیر نەچێ.

٢- دەفتەری ڕۆژانە (یا ڕۆژنامە): ئەم دەفتەرە بریتی دەبێ لە گوێزراوەی دەستەك بە وردیو بە پوختی، بۆ ئەوەی هیچ شتێك لەبیر نەچێ یا لەبیر نەچووبێ.
٣- هەر قەرزو قەرزدارێ کە لەناو دەفتەری (ڕۆژنامە)دا نووسرابێ، دەگوێزرێتەوە بۆ سەر حیسابی قەرزدارەکان یا ئەو قەرزانەی کە لەسەر ئەم بنکەیەن.
٤- دەفتەری داراییەکانی غەیرە نەقدی، وەك کارخانەو خانووبەرەو زەویوزارو ماشینو ئەو جۆرە شتانە.

## لافاوی مەهاباد

لە تاریخی (نوێ مانگی خەرمانانی ١٣١٥)ی هەتاویدا، لافاوێکی وێرانکەر بەشی زۆری شاری مەهابادی گرتەوە، دوو مەتر لافاو دارو دیوارو خانوو و بازاڕی لە بەرزیو نزمیی شار دابوە بەردەمو بەسەریەکدا وێرانی دەکردن. سەرەتای بارانەکە من لە گەرماوی میرزا ڕەسووڵی (مەیدانی ئارد) بووم. کاتێ مەترسی پەیدابوو، نیو مەتر ئاو دەڕژایە ناو گەرماوەکە. هەرچۆنێك بوو، بە یارمەتیی خێرەومەندان توانیم بگەمە سەربانی توونخانەی گەرماوەکەو لەوێرا بەسەرباندا گەیشتمە ماڵی خاڵم، لەوێشەوە گەڕامەوە ماڵی خۆمان.

دوای کەمبوونەوەی باران، ئاوی ناو شار کەمکەم دەڕەویەوە، ئەگەرچی یەك مەترە ئاو لەناو کاروانسەرای (شافیعی)دا مابوو. خاوەن دووکانەکان پەلاماری دەروازەی کاروانسەرایان داو بە زەحمەتێکی زۆر کردیانەوە. ئاو زۆر دووکانی شکاندبوو، شتومەکی ناویان بەسەر ئاوەکەدا بڵاوببۆوە. خاوەنی دوکانەکان خەریکی چۆڵکردنی بوون. لە دووکانی خۆمان تۆپێك قوماشیان خستە سەر شانم، ئەوەندە قورس ببوو بۆم هەڵنەدەگیرا. لە مەیدانی ئاردی کەوتم، بە جۆرێك لە قوڕ چەقیبووم، نەمدەتوانی ڕاست ببمەوە. یەکدوو برادەر یارمەتییان دامو ڕاست بوومەوە. بەم جۆرە هەرکەسە بە یارمەتیی خزمو کەسی، بازاڕەکە چۆڵ کرا. بۆ ڕۆژانی دوایی پاش وشکبوونەوەی، هەرچی وەبەر لافاو کەوتبوو، دەبرایە چۆمی سابڵاخو دەشۆراو جارێکی تر وشك دەکرایەوەو دەگەڕایەوە بۆ دووکانەکان.

توندوتیژیی ئەم لافاوە بەڕادەیەك بوو ئوتۆمبیلی قەمەرەی دووسێ کیلۆمەتر لەناو شار دوور خستبۆوە. سەیر ئەوەیە کاتی ڕێژنەی بارانەکە "مەلا عوبێد" ناوێك لە مەیدانی مەنگوڕان دەبێ، لەناکاو لافاو هەڵیدەگرێ، دەیبا بۆ قەیسەریی شافیعیو

بەژێر گومبەزەکاندا بۆ حەوشی قەیسەریەکە. لەوێ بە سایەبانی (قەپان) خۆی دەگرێتەوەو بە زیندوویی ڕزگاری دەبێ! ئەم ڕووداوە ئەوەندە بەسامو ترسناك بوو، تا ماوەیەك خەڵکی مەهاباد باسیان دەکرد.

## منداڵیو بەردی میزەڵدان!

ساڵی ١٣١٧ی هەتاوی (١٩٣٨) لە مەهابادا خوشکەزایەکم کە منداڵێکی یەکساڵانەی ساوا بوو، تووشی بەردی میزەڵدان بوو. ئەم بەستەزمانە تا تنۆکێك میزی دەکرد، دەمردو دەژیایەوە. بۆ بەدبەختی مەهاباد تەنیا دوکتۆرێکی لێ بوو، ئەویش نەیدەتوانی ڕێنوێنیمان بکات یا چارەسەرییەکمان بۆ بدۆزێتەوە. ماڵەکەمان وەك تاقیگەیەکی داودەرمانی کوردەواریی لێ هاتبوو، بەڵام بێسوود بوو؛ نەك هەر ئێمە خۆمان، بگرە خزمو کەسوکارو تەنانەت ناسیاوەکانیش لەگەڵ ئێمە بەم مەسەلەیەوە ماندوو و ناڕەحەت بوون.

بە ڕێکەوت، ڕۆژێك برادەرێکی هاوسێمان هەواڵی بۆ هێناین، گوایە بیستوویەتی دوکتۆرێکی عەسکەریی نەخۆشخانەی (ورمێ) دێتە مەهابادو لە شەهرەبانی دادەبەزێ، گوتی بەڵکوو بتوانن چاوتان پێبکەوێو چارەسەرێکتان بۆ بدۆزێتەوە. ئەو ڕۆژە تا ئێوارە دوورو نزیکی شەهرەبانی چاوەڕوان بووم. ئێوارە ماشێنی دوکتۆر "ڕەیاحی" نزیك دەروازەی شەهرەبانی وێستا. پێش ئەوەی دوکتۆر لە ماشێنەکەی دابەزێ، لە بەردەمی ماشێنەکە قوت بوومەوەو بە شپرزەیی مەسەلەکەم تێگەیاند. دوکتۆر داوای منداڵەکەی کرد چاوی پێ بکەوێ، بە ڕاکردن چوومەوە ماڵێ، منداڵەکەو دایکی منداڵەکەم گەیاندە شەهرەبانی. هەر کە چاوی پێکەوت، گوتی پێویستە زۆر زوو نەشتەرگەریی بۆ بکرێ. وا دیاربوو خراپیی باری لەشساغیی منالەکەو شپرزەیی منو دایکی، هەستی بەزەییی دوکتۆری بزواندبوو. گوتی ئەگەر بتوانن سەعات (٩)ی بەیانی لێرە ئامادە بن، بە شۆفێرەکە دەڵێم ماوەتان بدات بەم ماشێنە بتانگەیەنێتە نەخۆشخانەی (ورمێ)، وێدەچێ هەر بەیانی بتوانم نەشتەرگەریی بۆ بکەم.

ئەوکاتە جەنگەی دەسەڵاتی حکوومەتی دیکتاتۆری ڕەزا شا بوو، حکوومەتی ئێران هاوکاریی حکوومەتی ئەڵمانیای نازیی دەکرد؛ زوڵموزۆرو ئازاردانی هاووڵاتیان لەوپەڕی توندوتیژیدا بوون، کەس بۆی نەبوو بێ ئاگاداری پۆلیس سەفەر

بکات، چونکە هاتوچۆ لە شارێك بۆ شارێکی تر وەك وڵاتێك بۆ وڵاتێکی دیکە وابوو، دەبوو لەپێشدا ڕەزامەندیی شەهرەبانی بۆ سەفەر ئامادە بکرێ.

ئەوشەوە لە خۆشیان خەوم لێ نەدەکەوت، سەعات هەشتی بەیانی لەگەڵ منداڵەکەو خوشکم نزیك دەرگای شەهرەبانی ئامادە بووویـن. بەڵام ئەوساتە نە من لەیادم بوو، نە بەرپرسی پسووڵە لە شارەبانی ئامادە بوو تا پسووڵەی سەفەر وەرگرم. کاتی گەیشتنی دوکتۆر بیرم کەوتەوە خۆ ئێمە ئێستا پسووڵەمان وەرنەگرتووە، چی بکەین؟ شۆفێرەکە دوکتۆری تێگەیاند ئێستا بەرپرسی پسووڵە نەهاتووە، دوکتۆر وتی ئەوانە لەگەڵ منن، با پسووڵەیان پێ نەبێ. ئیتر بۆ ئەوەی نەوەك دوکتۆر بەجێمان بێڵێ، زاتم نەکرد پێی بڵێم ئەدی بۆ گەڕانەوە لە ورمێ بۆ مەهاباد، چی بکەین؟!

هەر ئەو ڕۆژە دوای نیوەڕۆ گەیشتینە ورمێ و منداڵەکەمان لە بەشی نەشتەرگەری دامەزراند، بۆ ڕۆژی دوایی نەشتەرگەری بە سەرکەوتوویی ئەنجام درا. وێدەچێ ئەم جۆرە نەشتەرگەریانە بۆ ئەمڕۆ کە (٦٦ شەستوشەش) ساڵ بەسەر ئەوکاتەدا تێدەپەڕێ، شتێکی زۆر ئاسایی و لە یەکدوو ڕۆژ زیاتر نەخایەنێ، بەڵام ئەوکاتە (٢٠) ڕۆژی تەواوی خایاند تا برینەکەی ساڕێژ بوو و توانیمان بگەڕێینەوە بۆ مەهاباد. لە گاراج ماوە نەدراین بە ماشێن بگەڕێینەوە، ناچار لەگەڵ عارەبانەچییەك (خاوەن دروشکەی دووئەسپی) ڕێك کەوتین بمانباتەوە بۆ مەهاباد. ئەو ڕۆژە بۆ ئێوارە لە کەنار دەریاچەی ورمێ لە قاوەخانەیەك ئۆدەیەکمان بەکرێ گرت، ئەوشەوە لەوێ حەساینەوە، بۆ ڕۆژی دوایی ئێوارە گەیشتینەوە مەهاباد.

بەم جۆرە لە سایەی دوکتۆرێکی وەزیفەشوناسی مرۆڤدۆستی وەك دوکتۆری ڕەیاحی، منداڵێکی ساوا لە مردن ڕزگار کرا. هەر بەو بۆنەوە پاش تێپەڕبوونی (٦٦) ساڵ و دووریم لە مەهاباد، تائێستاش ئەم کردەوە مرۆڤانەی دوکتۆرم هەر لەیادو لەبەرچاوەو لە ناخی دەروونەوە سوپاسی دەکەم و هیوادارم هاوتایان زۆربێ. بێگومان مرۆڤی باش، لە ڕەژیمی "ڕەزا شای پەهلەوی"شدا دەیتوانی بە باشی بمێنێتەوە.

### شیرکەتی قوماش لە مەهاباد

ساڵی ١٣١٧ی هەتاوی (١٩٣٨ی زاینی) بارودۆخی سیاسی و ئابووریی وڵاتان، بەتایبەت هی ئێران، بەرەو ئاڵۆزی دەبۆوە؛ بەرهەمە ئابووری و پیشەسازیەکان تا ڕادەیەك ڕوویان لە کزی کردبوو. حکوومەت، ناچاربوو دابەشکردنی زۆر لە بەرهەمە

سەرەکیەکان بخاتە ژێر چاوەدێریی ڕاستەوخۆی خۆیەوە. لە مەهابادیش، وەك زۆر لە شارەکانی تر، بەرهەمەکانی وەك (قەند)و شەکرو چاو کووتاڵو ... لەلایەن حکوومەتەوە دابەش دەکران. باوکم، لە دووکانی تایبەتی خۆی، فرۆشیاری شیرکەتی قوماش بوو. خۆم بە هاوبەشی دووکانی "حاجی ساڵحی میکایلی"م بەڕێوە دەبرد. دابەشکردنی قوماش بەسەر وەکیلەکاندا هەفتانە بوو؛ حەوتوووی دووهەزار تا دووهەزارو پێنجسەد ڕیاڵ قوماشیان وەردەرگرت، بەڵام زۆر ڕێکوپێك نەبوو. زۆر وا دەبوو مانگی جاریکێش دابەش نەدەکرا. ئەم باردۆخە تا شەهریوەری ١٣٢٠ درێژەی هەبوو.

شیرکەتی قوماش، لە بەرانبەری کاروانسەرای سەید عەلی، بەشێکی گەزفرۆشی دامەزراندبوو، کە ڕۆژانە بە گەز قوماشیان بە هاووڵاتیان دەفرۆشت. بەڵام لەبەر ئەوەی خەڵکەکە زۆر و کابرای بەڕێوەبەری فرۆشگاکە تەنیا یەك نەفەر بوو، پێویست بوو بۆ وەدەستهێنانی چەند مەترە قوماش نیوە ڕۆژێك چاوەڕوان بی تا نۆرەت بەردەکەوێ. سەرباری ئەمە، فرۆشیاری فرۆشگاکە کابرایەکی ئازەریو ناوی جەعفەر ئاغا بوو: ئەوەندە بێشەرمو چاوقایم بوو، بە ئاشکرا بە مەیلی خۆی، قوماشی بە تەنیا دەدا بەو کەسانە کە ئاشنای بوون، یا ڕەنگو ڕوویان (بازاڕی) بوو!

ڕۆژێك "قاسمە شەلی خەیات" کە سابلاغییەکی قسەخۆشو نوکتەزان بوو، پاش سێچوار ڕۆژ هاتوچۆ و ماندوبوون بۆ چەند مەترە قوماش، بە خەیاڵی دێ تا فێڵێك لە جەعفەر ئاغا بکات، تا هەم شەرمەزاری بکاتو هەم شەریکەی قوماش لە هەڵسوکەوتو ڕەفتاری جەعفەر ئاغا لەگەڵ هاووڵاتیاندا ئاگادار بکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستە، چارشێو (عەبا)یێکی ژنانە بەسەریدا دەداو وەژوور فرۆشگە دەکەوێو لەناو خەڵکدا بە دەنگێکی ناسك هاوار دەکا: جەعفەر ئاغا! تکایە بەپەلەم ئەوەندە مەترەم لەو قوماشە بۆ بپێوە، لە بەینی ئەم قسانەدا چاوێکی لێ دادەگرێ! جەعفەر ئاغا کە ئەمە دەبینێ، زوو قوماشەکەی بۆ ئامادە دەکاتو دەیداتە دەستیو هەندێکیش دەستی دەگوشێ! قاسمە شەل قوماشەکە وەردەگرێو دەچێتە بەردەمی فرۆشگا؛ لەکاتێکدا جەعفەر ئاغا چاوی تێبڕیوە چارشێو لەسەری دادەماڵێو دەڵێ: جەعفەر ئاغا ببورە! بەم جۆرە نەبێ قوماشم لە تۆ دەست نەدەکەوت. لەناو چەپڵەو پێکەنینی هاووڵاتیاندا فرۆشگە بەجێدێڵێ.

بۆ ڕۆژی دوایی، لە ناوەندی بەڕێوەبەرایەتیی شەریکەی قوماش، باس باسی قاسمە شەلە کە وەك تاوانبار بە فێڵو فەرج قوماشی دەست کەوتووە! ئیتر کەس

ئاماژه بەوه ناكات كه ئەمه شێوەی ڕەفتاری خودی بەڕێوەبەری فرۆشگایه لەگەڵ هاووڵاتیاندا، قاسمه شەلی خەیات بەم كردەوەیه دەیەوێ (چارشێو)ی لەسەر داماڵێ و ڕیسوای بكات!

## دیوانی وەفایی

ساڵی ١٣١٩ی هەتاوی (١٩٤٠ی زاینی) نوسخەیەكی (دیوانی وەفایی)ی دەسخەتی "میرزا مارفی مەعرووفـزاده"م دەست كەوت. ئەو كاته له كوردستانی ئێران خوێندن و نووسینی كوردی ئازاد نەبوو, بەتايبەت نووسینی كوردی به تاوان دەژمێردرا. جگه لەمه، ڕێنووسێكی ئەوتۆش بۆ نووسین نەبوو، پەیڕەویی لێ بكرێ. بوێژو نووسەرەكان به شێوەی نووسینی (فارسی) بەرهەمەكانیان دەنووسی, ئەم شێوەیه بۆ چینی پێگەیشتووی كورد بێ سەرئێشه نەبوو. ئەم دیوانەش بەم شێوەیه نووسرابۆوه.

من كه تاڕادەیەك به شارەزایی له ئەدەبیات و خەتی (شكستەی فارسی)ی خۆم پشتئەستوور بووم, دەستم پێكردو له ماوەی مانگێكدا نوسخەیەكم لەبەر نووسییەوه. دوای ئەمه، خزمێكی بەڕێز داوای لێ كردم نوسخەیەك بۆ ئەو بنووسمەوه. پاش ماوەیەك له ساڵی ١٩٤٨دا كه هاتم به دیوی كوردستانی عیراقدا, ئەم دیوانەو دوو دەوره ڕۆژنامەی "كوردستان"و بڵاوكراوەكانی كۆمەڵه (ژ. ك)و هەروەها گشت بەرهەمەكانی (چاپخانەی كوردستان)، لای كەسوكارم مانەوه. كاتی ڕاپەڕینەكەی ١٩٩١، واتا پاش چل‌وسێ ساڵ، توانیم بۆ سەردانی خزمان سەفەرێكی مەهاباد بكەم. بەداخەوه له گشت ئەو چاپەمەنیه بەنرخانەو ژمارەیەكی زۆری كتێبی كوردی‌و فارسی تەنیا (٨) لاپەڕەم له بەشی فارسیی دیوانەكەی وەفایی له توێی لاپەڕەكانی دیوانی "حافزی شیرازی"دا دۆزییەوه. ئەم هەشت لاپەڕەیەم، وەك بیرەوەریەكی تاڵ‌و ناخۆشی ژیانی دەربەدەری، لەگەڵ خۆمدا هێنایەوه بۆ سلێمانی. دوای بەراوردكردن لەگەڵ بەشه فارسیەكەی (دیوانی وەفایی)ی مامۆستا "محەمەد عەلی قەرەداغی"دا، بۆم دەركەوت كه له سەرەتای بەشەكەوه پارچەیەكی سێ لاپەڕەیی كه به (بشنوید أی دوستان این داستان)ەوه دەست پێدەكات، نەنووسراوەو لەقەڵەم كەوتووه.

هەروەها لە لاپەڕەکانی تریشدا بڕێك جیاوازیی تێدا بەرچاو دەکەوێ. لەبەر ئەوە بەباشم زانی لە گۆڤاری بەڕێزی "ئاینده" (ژمارە ٤)دا بڵاو بکرێتەوە، شایەد مامۆستا قەرەداغی چاوی پێ بکەوێو لە چاپی نوێی دیوانەکەدا چارەسەریان بکات.

## زلهێزەکان پەلاماری ئێران دەدەن

بەیانی ڕۆژی (٣)ی شەهریوەری ١٣٢٠ی هەتاوی (ئووتی ١٩٤١ی زاینی) لەگەڵ باوکم بووم، دووکانمان نەبوو. لەبیرم نەماوە ڕۆژی هەینی بوو یا لە ترسی پەلاماری زلهێزەکان دووکانمان نەکردبۆوە؟ باوکم لای دا بۆ دەرمانخانەی میرزا محەمەدی مەولەوی، منیش دوورونزیك تەماشای ئەو ئەفسەرانەم دەکرد کە لە ورمێ کشابوونەوەو لێرە لە تێلگرافخانە خەریك بوون پەیوەندی بە (تاران)ـەوە بکەن. لەناکاو فرۆکەیەکی ڕەش لە ئاسمانی مەهاباد پەیدابوو و گرمەی لەوناوە هەڵساند کە ئێمەی لێ بووین. ئەفسەرەکان هەریەکەی ڕووی کردە کۆڵانێك.
دیوارێك لە تۆزوخۆڵو قوڕو بەرد بەرچاوی گرتبووم، نەمدەزانی ڕوو بکەمە چ لایەك. هەرچۆنێك بوو کوێرانە ڕووم کردە لای چەم. پاش تاوێك وەبیرم هاتەوە کە من لەگەڵ باوکم بووم، بەپەلە گەڕامەوە. لە گەڕانەوەدا، بۆم دەرکەوت شەهرداری بۆمباران کراوە. ئینجا لەوێ باوکمم دۆزییەوەو بەرەو ماڵی خۆمان گەڕاینەوە. هەر ئەو ڕۆژە دوای نیوەڕۆ یەکدوو جاری دیکەش دیسان فرۆکە ڕەشەکە بەسەر شاردا خولایەوەو هێندێك بەیاننامەی بڵاو کردەوە.

ئەو شەوەمان بە نیگەرانی ڕۆژ کردەوە. ڕۆژی دوایی دەنگ بڵاوبۆوە کە لەشکری ڕووس دەگاتە ناو شار. دانیشتوانی شارو دەوروبەری کە ئەزموونێکی تاڵو ناخۆشیان لە یەکەم شەڕی جیهانی بۆ مابۆوەو کوشتاری ساڵی ١٩١٥ی مەهابادیان لەبیر نەچووبۆوە، کە لەشکری ڕووس بێبەزەییانە سەری سەدان کەس لە دانیشتوانی بە شمشێر پەڕاندبوو، ترسی ئەوەیان لێنیشتبوو نەوەك جارێکی تریش ئەم کارەساتە دووبارە بێتەوە. لەبەر ئەوە شاری مەهاباد تا ڕادەیەك چۆڵ کرابوو. داوام لە بابم کرد با ئێمەش لە شار دەرچین، گوتی ئێوە بڕۆن من دەمێنمەوە، ئاگام لە ماڵەکە دەبێ.

ناچار خۆمو دایکمو دوو خوشکم بە داوێنی (گۆڕستانی مەلا جامی)و (قەبری عەجەمان)و (بەردەڕەشان )دا کەوتینە ڕێو لە دەوروبەری (شیلاناوێ) گیرساینەوە.

له بەیانییەوە (فڕۆکە ڕەشەکە) بەسەر شارەوە بوو، دنیا کپ و بێتەقەوڕەقە بوو. پێشنیوەڕۆ وەڵامیان هێنا کە لەشکرەکە گەیشتە ناو شاری مەهاباد، بە گەیشتنیان بەیاناتی زۆری بڵاو کردۆتەوە بۆ هێمنکردنەوەی شار. منیش بۆ تاقیکردنەوەی بارودۆخەکە بە تەنیا گەڕامەوە بۆ شار، سەرم لە باوکم دا. پاشان بەنزیک دەرمانخانەی (تەهازادە)دا هەڵکشام بۆ گەڕەکی (ڕزگەییان)، بۆ ئەوەی سەر لەماڵی (مەولەوی) بدەم. لەو گەڕەکەدا، لەناو کووچەو پەس‌کووچەکاندا، لەناو کۆڵانەکاندا سەربازو دەرەجەداری بێژماری ڕەژیمی ئێران خۆیان مەڵاس دابوو؛ چاوەڕوانی ئەوە بوون یەکدوو پارچە جلوبەرگی ئەهلییان دەس کەوێ، تا لە جلوبەرگی سەربازی ڕزگاریان بێ‌و بە دیل نەگیرێن.

وا دیار بوو بارودۆخەکە کەم کەم هێمن دەبۆوە، بەڵام دیسان خەڵك مەترسیی ئەوەیان هەبوو نەوەك عەشیرەتەکانی دەوروبەری شار شەو بەسەر شاردا بدەن‌و تاڵانی بکەن. ئەم مەترسییە بوو بە هۆی ئەوە کە هەر کەس لەلای خۆیەوە هەوڵ بدا بۆ پەیداکردن‌و وەدەسهێنانی چەك بۆ پاراستنی شارەکە. ئەو چەکانەی کە لە ئارتەش کەوتبوە دەستی خەڵك‌و کۆنەچەکی زەمانی پێشوو لە پێنج‌تیرو سێ‌تیری کورت‌و درێژ، کۆنە دەمانچەی دەتیرو حەوت‌تیرو تاپرو ... کەوتە بازاڕو هەرکەسە بەپێی توانای خۆی پارچە چەکێکی ئامادە دەکردو لە ماڵی خۆی دایدەناو شەوانە پاسی ماڵەکەیی پێ‌دەکرد. پاش ماوەیەك، دوابەدوای دامەزرانی کۆمەڵەی (ژ. ك)و چاوەدێریی بێوچانی قازی محەمەد، مەسەلەی ئەمنی شار بە ڕێکوپێکی کەوتە سەر بار و لە گشت گەڕەکەکانی شاردا بنکەی تایبەتی پاسەوانی دامەزرا. هەر ماڵەی حەوتووی جارێك یا دووجار کێشکی بەر دەکەوت؛ یەك نەفەر لە خێزانی ماڵەکە کێشکی دەگرت، یا یەك نەفەریان بەکرێ دەگرت‌و چەکیان دەدایە تا حەراسەتیان بۆ بگرێ.

بازاڕی چەك زۆر خۆش بوو، چەکفرۆشەکان فێر ببوون لە کارخانەی تفەنگی (بڕنەو) لە تاران بە نهێنی تفەنگی بێداریان دەکڕی، دەیانهێنایەوە بۆ کوردستان. لە سابڵاخ وەستا "قادری بانەیان" چەخماخساز، هەروەها ماڵی (تۆکمەچی) داریان بۆ ئامادە دەکردو لە بازاڕ دەفرۆشرا. باوکم یەکێك لەو کەسانە بوو مانگی یەکدوو سەفەری تارانی دەکردو هەرجارە ١٠-١٥ تفەنگی بێداری لەناو فەردە قوماشدا دەهێناوە بۆ سابڵاخ.

جارێکیان بەرێکەوت چاوەڕوان بووم بابم لە سەفەری تاران بگەڕێتەوە، یەکدوو ڕۆژ لەکاتی گەڕانەوەی تێپەڕیبوو، زستانێکی سەختو بەفرێکی قورس ناوچەی مەهابادی داپۆشیبوو، ڕێگای تەورێز– مەهاباد بە بەفر گیرابوو. ئێوارەیەك برادەرێك لە گاڕاجی میرزا ڕەسوولی پەروێزی تووشم بوو، پێی گوتم ئەرێ تۆ بۆ ناچی فریای بابت بکەوی کە لەبەینی ورمێ و نەغەدە لەگەڵ چەند کەسی دی لە فلان دێ گیریان خواردووە، چونکە ماشێنەکەیان شکاوە؟! بەپەلە هەواڵەکەم گەیاندەوە ماڵێ و گەڕامەوە بۆ کاڕاج. کاڕاجەکە تەنیا یەك ماشێنی پیکابی لێ بوو، خاوەنەکەی ئاشنا دەرچوو، بەپەلە سوار بووین و کەوتینە ڕێ. ڕێگە زۆر ناخۆش بوو، دوو سەعات لە شەو ڕابوردبوو گەیشتینە دێیەکە. پێیان سەیر بوو بەو نیوەشەوەو بەم ساردو سەرمایە چۆن توانیومانە بگەینە ئێرە؟! بابم پێنج شەش بارە کووتاڵی پێ بوو، ناوەکانیان پڕ بوو لە تفەنگی بڕنەوی بێدار. پیکابەکە تەنیا ئەو چەند بارەی بۆ هەڵدەگیراو خۆمان، بەڵام شۆفێرەکە بەڵێنی دا بەیانی ماشێنێکی گەورەتر بەرێ و ئەوانی دیکەش بهێنێتەوە بۆ مەهاباد.

درەنگێك لەوێ ڕزگار بووین و بەرەبەیانی گەیشتینەوە ناو شار. دوای ئەمە کابرای شۆفێر ماشێنێکی گەورە دەبات بۆ هێنانەوەی ئەوانی تر. بەڵام کاتێك دەگاتە دێیەکە، دەبینێ ئەم برادەرانە لە نیوەشەوەوە تاڵان کراون! تەنیا خۆیان بە سەڵتی ماونەوەو چاوەڕوانی ماشێنن بیانگەڕێنێتەوە بۆ مەهاباد.

## کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد (ژ. ك)

ئەم کۆمەڵەیە لە (٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢١/ هەتاوی ١٦ی سپتامبری ١٩٤٢ زاینی) لە شاری مەهەباد دامەزراوە. بەڵام بەداخەوە ناوی دامەزرێنەران و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کەمێك تێکەڵی و جیاوازیی تێکەوتووە، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بووە کە بەشی زۆری دامەزرێنەران لە کۆمیتەی ناوەندیشدا بەشدارییان هەبوە، بۆیە وێدەچێ لە گواستنەوەی ناوەکاندا ئەم جیاوازییەی تێکەوتبێ. بۆ نموونە، تەنانەت لە لیستی دوو ئەندام لە نزیکترین ئەندامانی دامەزرێنەرانیشدا وەك عەبدوڕەحمان زەبیحی و مەلا قادری مودەڕریسی، ئەم جیاوازییە بەرچاو دەکەوێ. هەروەها ماوەی دوو ساڵ حوسەینی فروهێر سەرۆکی کۆمەڵە بووە.

| زنجیره | لیستی مەلا قادری مودەریسی |
|---|---|
| ١ | محەمەدی نانەوازادە |
| ٢ | ڕەحمان زەبیحی |
| ٣ | حوسەینی فرۆهێر (زێڕینگەران) |
| ٤ | عەبدوڕەحمانی ئیمامی |
| ٥ | قاسمی قادری |
| ٦ | مەلا عەبدوڵڵای داودی (حەجۆکی) |
| ٧ | محەمەدی یاهوو |
| ٨ | مەلا قادری مودەریسی |
| ٩ | سدیق حەیدەری |
| ١٠ | عەبدوڕەحمانی کەیانی |

| زنجیره | لیستی عەبدوڕەحمانی زەبیحی |
|---|---|
| ١ | حوسەینی فروهێڕ (زێڕینگەران) |
| ٢ | عەبدوڕەحمانی زەبیحی |
| ٣ | عەبدوڕەحمانی ئیمامی |
| ٤ | مەلا قادری مودەریسی |
| ٥ | نەجمەدین تەوحیدی |
| ٦ | محەمەدی نانەوازادە |
| ٧ | عەلی ئەحموودی |
| ٨ | محەمەدی ئەسحابی |
| ٩ | عەبدوڕەحمانی کەیانی |
| ١٠ | سدیق حەیدەری |
| ١١ | قاسمی قادری |

میرحاج کە ئەفسەرێکی کوردی خەباتگێڕو ماندوویی‌نەناسی عێراقی‌و خاوەن ئەزموونی خەباتی کوردایەتی بوو، لە دامەزراندنی کۆمەڵەی (ژ. ك)دا دەوری سەرەکی‌و بەرچاوی گێڕاوە، تەنانەت لە ڕیزی دامەزرێنەراندا ناوی بڵاوبۆتەوە. ئەم جیاوازییەی کە لەم دوو لیستەدایە، وێدەچێ زەبیحی پاش سی چل ساڵ ژیانی ئاڵۆزو دوور لە مەهاباد ناوی مەلا عەولای حەجۆکی‌و محەمەدی یاهووی لەبیر نەمابێ کە ئایا ئەم دوانەش لە دامەزرێنەران بوون یان نا؟! لە حاڵێکدا هەردوکیشیان لە کۆمیتەی ناوەندیدا ئەندام بوون؛ بەڵام مەلا قادری مودەرریسی کە بەردەوام لەناو مەهاباد‌و ئەهلی شارەکەی لەبەرچاو بووە، مەسەکەلەی باشتر لەبیر مابێ، بۆیە وێدەچێ لیستەکەی ئەو لەڕاستییەوە نزیکتر بێ. دوای دامەزرانی کۆمەڵە، بۆ ماوەیەکی کەم بەشێکی زۆر لە کوردستانی ڕۆژهەڵات‌و بەشێکیش لە کوردستانی عیراقی گرتبۆوە. کەسایەتێکی وەك مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لە سلێمانی کۆمیتەی ژێکافی بەڕێوە دەبرد. لقی ژێکاف لە زۆر شاری کوردستانی عیراقدا لە چالاکی‌و گەشانەوەدا بوو. لە هەمان کاتدا ژمارەیەکی زۆر کوردی کوردستانی عیراق لە مەهاباد‌و شارەکانی تر بە گیان‌ودڵ هاوکاریی برا کوردەکانی خۆیان دەکرد. لە بەرانبەر ئەوەدا، ئەفسەرە

کاربەدەستەکانی سۆڤیەت، کە بەشی زۆریان ئازەری بوون، لە هاوکاریو نزیکبوونەوەی کوردی کوردستانی ئێرانو عیراق ناڕازیو تووڕە بوون. هۆی سەرەکیی ئەمە، بە پێچەوانەی گەشبینیی گەلەکەمانەوە، ئەوە بوو سۆڤیەت سەبارەت بە گەلی کورد هیچ بەرنامەیەکی نەبوو. سەرەڕای ئەمە، نیازیان وابوو کوردستانیش بخەنە سەر ئازەربایجانو پێشکەشی ئازەربایجانی قەفقاسی بکەن! بەڵێ ئەمە بەرنامەی "باقرۆف"ی سەرکۆمارو سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی ئازەربایجان بوو سەبارەت بە کوردو کوردستان، کە بێگومان لەگەڵ ئامانجو داخوازیەکانی گەلەکەماندا نەدەهاتەوە. ئەمەش وەنەبێ شتێکی شاردراوە بێ.

ڕاستیەکەی لە قسەکانی "باقرۆف" لەبەردەم هەیئەتی کورددا سەفەری یەکەمی بۆ (باکۆ) ڕوونو ئاشکرا بوو. لەسەر ئەوەشڕا کۆمەڵە بۆ وەدەستهێنانی متمانەی ڕووسەکان لە مەهابادو تەورێز سیاسەتی نزیکبوونەوەی گرتبوە بەر. بۆ ئەم مەبەستە عەبدوڕەحمان زەبیحی لە تەورێز پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ کونسوڵگەریی سۆڤیەت دامەزراندبوو، تەنانەت ماوەیان بۆ ڕەخساندبوو چاپەمەنیەکانی کۆمەڵە لە تەورێز چاپ بکرێ. هەر لە ئاکامی ئەم نزیکبوونەوەیەدا بوو کە ژمارە (١)ی گۆڤاری "نیشتمان" و هەروەها "دیاری کۆمەڵە"و بڕێك چاپەمەنیی تر لە " تەورێز" چاپ کرانو لە زوربەی شارە گرنگەکانی کوردستاندا بڵاو کرانەوە؛ بێگومان کاریگەریی باشو ڕاستەوخۆیان هەبوو بۆ بڵاوبوونەوەی ئاوازەی کۆمەڵە لەناو کوردستانو دەرەوەیدا بۆ هۆشیارکردنەوەی گەلەکەمان.

بێگومان لە بەرانبەر نزیکبوونەوەی کۆمەڵەدا لە ڕووسەکان، ئەوانیش چاوەڕوانو مەبەستیان بوو سەبارەت بە بارودۆخی ئەوساو کۆمەڵە زۆر شتیان بۆ ڕوون بێتەوە. جگە لەمە، زەبیحی خۆشی وای پێشان دەدا تا ڕادەیەك گۆڕانکاری لە بیرو بۆچوونیدا ڕووی دابێ! نووسینەکانی، بەتایبەت شیعرەکانی لە گۆڤاری "نیشتمان"دا وەك (نیقابی سوور)، (شەڕابی سوور)و (وەتاغی سوور)و ... گۆڕانکاریەکانی ئەو سەردەمەی بیرو بۆچوونی (بێژەن ٢)مان بۆ باس دەکەن. بەڵام ئەم گۆڕانکاریانە هەرگیز نەگەیشتنە ڕادەیەك بتوانن زەبیحی لە کوردایەتی دوور بخەنەوە، بەپێچەوانەی ئەوانەی کە لەو باوەڕەدا بوون زەبیحی لە سووریا خۆی بە کۆمۆنیست زانیوە! بێگومان نامیلکەی"رد علی الكوسموپولیتیة" وەڵامی ئەو جۆرە کەسانەیە.

* * *

دوای چاپ و بڵاوبوونەوە ژمارە (١)ی گۆڤاری "نیشتمان"، بەهۆی برادەرێکەوە، "دڵشادی ڕەسووڵی"، هەوڵم دا بەڵکوو لە ڕیزی ئەندامانی کۆمەڵەدا وەربگیرێم و شەرەفی ئەندامەتیی ژێکافم پێ ببەخشرێ، بەڵام بەهۆی کەمبوونی تەمەنم ئامۆژگارییان دەکردم پەلە نەکەم. خۆشبەختانە پاش ماوەیەك لەگەڵ باوکم و بە ئامادەبوونی سێ ئەندامی کۆمەڵە: کاك عەلی ڕێحانی، عەبدوڕەحمانی زەبیحی و دڵشادی ڕەسووڵی، لە ماڵی کاك عەلی ڕێحانی مەراسیمی سوێندخواردنمان جێبەجێ کرا. سوێندخواردنمان بەم جۆرە بوو: ((من ... کوڕی ... فلان ... بەم قورئانە پیرۆزە و ئاڵای پیرۆزی کوردستان و بەم خەنجەرە کە ڕەمزی گەل و نەتەوەکەمانە، سوێند دەخۆم تا ماوم لە ڕێبازی کۆمەڵە لانەدەم، خەیانەت نەکەم و نهێنییەکانی کۆمەڵە نەدرکێنم ...)).

هەر لەو مەراسیمەدا من ناوی نهێنیی (م. ش ئازەر)م بۆ خۆم هەڵبژارد، باوکم ناوی (بازرگان)ی بۆ خۆی دیاری کرد. شایانی باسە، لە مەراسیمی سوێندخواردندا وشەی خەنجەر وەك ڕەمزی کورد ناوی هاتووە، نەك بەو جۆرەی (هەژار)ی شاعیر لە (چێشتی مجێور)دا باسی کردووە بۆ ترساندنی سوێندخۆران بێ.

## سەبارەت بە تاریخی دامەزراندنی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد

کاك ئەمیری حەسەنپوور لە لاپەڕە (٢١)ی کتێبی (ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی)دا لە زمانی عەبدوڕەحمان زەبیحی‌یەوە دەنووسێ: ((کۆمەڵەی ژ. ك ساڵی ١٩٣٧ دامەزراوە و ساڵی ١٩٤٣ ئەووەڵی بڵاوکراوەی بڵاو کراوەتەوە)). سەبارەت بەمە بە باشی دەزانم ڕوونی بکەمەوە: ڕاستە زەبیحی و چەند برادەرێکی تر کە لە (حیزبی ئازادیخوازی کوردستان)دا ئەندام بوون، بەڕێکەوت دوای چەند ساڵ لە کۆمەڵەی (ژ. ك)یشدا بەشدارییان هەبوە، بەڵام با لەبیر نەچێ کە ڕێکخراوی ١٩٣٧ ناوی تایبەتی خۆی هەبوە کە (حیزبی ئازادیخوازی کوردستان) بووە. هەروەها لەلایەن کەسایەتێك کە "عەزیز زندی" بووە، ڕێبەری کراوە. جگە لەمە، ماوەیەکی زەمانیی شەش حەوت ساڵ جیاوازی لە تاریخی دامەزراندنیاندا هەیە. بۆیە بە ڕاستی نازانم بوترێ (ژ. ك) لە ١٩٣٧دا دامەزراوە، بەڵکوو تاریخی ڕاستەقینەی دامەزرانی ئەوەیە کە لەکاتی خۆیدا

بڵاو کراوەتەوەو ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢١ی هەتاویو ١٦ی سپتامبەری ١٩٤٢ی میلادییە. من خۆم نە لە ئێرانو نە لە عیراق ئەم باسەم بەم جۆرە لە زەبیحی نەبیستووە، نازانم بۆ دەبێ لە کۆتاییەکانی ژیانیدا کەوتبێتە سەر ئەم بیرو بۆچوونە؟!

* * *

هێندێك کەس لایان وایە ناوی (ژ. ك) :"کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان"ـە، بەڵام مامۆستا برایم ئەحمەد "کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد"ی بەلاوە ڕاستترە، دەڵێ ژیانەوە بۆ گەلو نەتەوەیە. نەتەوەی عەرەبیش هەر بەم جۆرەیان وەرگرتووە: (حزب البعث العربي الاشتراكي)*.

## پێشەوا قازی محەمەدو سەرکردایەتیی کۆمەڵە

ماوەیەك بوو دەنگۆ بڵاوببۆوە قازی محەمەد داوای کردووەو دەیەوێ بێتە ڕیزی ئەندامانی کۆمەڵە. جارجارەش کە خۆمان ئێواران لەگەڵ ئەفسەرە عیراقیەکاندا بەپیاسە دەڕۆیشتین بۆ سەر گەڕاوەکانی پردی سوور، لەوێش دیسان ئەم باسە دەکرایەوەو قسەی لەسەر دەکرا. وا دیار بوو زەبیحیو چەند برادەرێك لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵە، سەبارەت بەم مەسەلەیە دوودڵن، نایانەوێ جڵەوی سەرکردایەتیی کۆمەڵە بکەوێتە مەترسییەوە! نەوەك چارەنووسی گەلەکەمان بە دواڕۆژی ئازەربایجانی قەفقاسی سۆڤیەتەوە ببەسرێتەوە! لەلایەکی ترەوە، چەند کەسێك لەناو سەرکردایەتیدا هەوڵیان دەدا بزووتنەوەی کوردی کوردستانی ئێران وەك درێژەی شۆڕشەکانی شەمزینانو بە ڕابەرایەتیی ئەوان بێ. بەڵام بەشی هەرە زۆری سەرکردایەتیی کۆمەڵەو ئەندامانی "قازی محەمەد"یان بە گونجاوترین کەس بۆ ڕێبەرایەتیی کۆمەڵە دەزانی، بەڵگەشیان ئەوە بوو کە قازی محەمەد بە کردەوە ڕابەری هەموو کوردستانی ئێرانە، کاربەدەستانی سۆڤیەت وەك ڕابەری سەرەکیی کورد پەیوەندییان پێوە کردووە. جگە لەوە، لە سەفەری ئەووەڵی هەیئەتی کورددا بۆ

---

* زەبیحی وەك ئاگادارترین کەسی ناو کۆمەڵە بەدروستی دیاریی کردووە کە (کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان) بووە. بۆ ئەوە بڕوانە: جوتیار حاجی تۆفیق، وەڵامی زەبیحی بۆ نامیلکەکەی ئارشی ڕۆزڤێڵتو چەند ڕوونکردنەوەیەك، "ئایندە" (گۆڤار)، سلێمانی، ژ٤١، ٢٠٠٢، ل١٤٥-١٤٩.

(باكۆ)، وەك كەسایەتێكی ناسراو و قسەكەری گەلی كوردی ئێران پەیوەندییان پێوە گرتووەو لەگەڵ "میر جەعفەر"ی سەرۆكی حیزبی كۆمۆنیستو سەركۆماری ئازەربایجان گفتوگۆی كردووە.

ئێوارەیەك كە "میرحاج"و شەهید "مستەفا خۆشناو"یش لەگەڵمان دانیشتبوون، زەبیحی ڕووی تێكردنو وتی: ((پێم خۆشە لەم بارەوە ڕای ئێوەش بزانم)). میرحاج وەڵامی داوەو وتی: ((من وا دەبینم پێش ئەوەی كۆمەڵە ڕابەرێك بۆ خۆی هەڵبژێرێ، گەلی كورد لەم ناوچەیەدا ڕابەری تایبەتی خۆی كە "پێشەوا قازی"یە دیاری كردووە. ئایا ئێوە وەك (ژ. ك) كەسایەتێك لە قازی محەمەد هەڵكەوتووترو سیاسیتر شك دەبەن؟! ئایا ئێوە وەك حیزب خۆتان لە گەلەكەتان جیا دەكەنەوە؟!)). دوای قسەكانی میرحاج، شەهید مستەفا خۆشناو گوتی: ((بێگومان كۆمەڵەش بەشێكە لەم گەلی كوردە كە قازی محەمەد ڕابەرێتی)). دوای ئەمە، پاش ماوەیەكی كەم پێشەوا قازی محەمەد بە ڕێبەری كۆمەڵە هەڵبژێردرا. بەڵام وا دیار بوو مەسەلەكە لەناو ئەوانەدا كە لایەنگری پێشەوا بوونو بە ژمارەیش لەوانی تر زۆرتر بوون، سەبارەت بە زەبیحی گرژییەكی بەدی هێنا كە تا دوای كۆماریش ئاسەواری هەر مابوو!

بێگومان پێشەوا قازی محەمەد بە قووڵی ئاگاداری ئەوە بوو كە كۆمەڵەی (ژ. ك) لەسەر شێوەی حیزبە نەتەوەییەكانی پێشوو دامەزراوە، كە لەگەڵ بارودۆخی سەردەمی پاش دووەم شەڕی جیهانی جوور نەدەهاتەوە؛ ناوی (ژ. ك)یش وەك ناوەڕۆكەكەی پێویستیی بە گۆڕانكاریی بنچینەیی دیموكراتیانە هەیە، كە ئەمەیان بە دامەزرانی حیزبی دیموكراتی ئێران تا ڕادەیەكی باش چارەسەر كرا، بە جۆرێك كە زۆر كەس پێیان وابوو كۆمەڵە تەنیا ناوەكەی گۆڕدراو بەس! چونكوو بەشی زۆری ئەو ئەندامانەی كە كۆمەڵەیان دامەزراندبوو لە دامەزراندنی (حیزبی دیموكراتی كوردستان)یشدا بەشدار بوون.

## پەیمانی سێ سنوور

كۆمەڵە، زووتر بڕیاری دابوو لە مانگی ئووتی ١٩٤٥دا نوێنەرانی خۆی بۆ كۆبوونەوەكانی سێ سنوور ڕەوانە بكات. بۆ ئەم مەبەستە قاسم قادری، ڕەحمانی زەبیحیو دڵشادی ڕەسووڵی هەڵبژێردرابوون. هەروەها لە كوردستانی توركیا قازی مەلا وەهابو لە كوردستانی عیراق شێخ عوبێدیللای زینوێ لەم كۆبوونەوانەدا

بەشدار بوون. دوای کۆتایی ئەم کۆبوونەوانە، لە گەڕانەوەدا، نوێنەرانی (ژ. ك) لە ئاوایی (باڵانیش)ی نزیك شاری ورمێ لەلایەن لەشکری ئێرانەوە دەگیرێن و قۆڵبەست ڕەوانەی (تاران) دەکرێن.

سەرلەشکر "زەنگەنە" سەبارەت بە گیرانی ئەم برادەرانە دەنووسێ: ((سەرەتای مانگی ئابانی ١٣٢٤ی هەتاوی= ١٩٤٢) هەنگی ژاندارمەریی تیپی ڕەزائیە ئاگادار کراوەتەوە کە هەیئەتێکی ڕاگەیاندن لەلایەن حیزبی کۆمەڵەی مەهاباد و قازی محەمەدەوە بەرەو ڕەزائیە دێن. کاتێ نزیك دەبنەوە، گەمارۆ دەدرێن و دوای چەند تەقە خۆ بەدەستەوە دەدەن. گوایە دوو چەکداریان لەگەڵ دەبێ و ئەوانی تر لە ئاژیتۆرەکانی حیزبی کۆمەڵەی مەهاباد: عەبدوڕەحمان زەبیحی، دڵشادی ڕەسووڵی و قاسمی قادری دەبن، لەناو ئوتومبیلەکەو ساکەکاندا هەشت نامە دۆزراوەتەوە کە دەبوو لەلایەن قازی محەمەدەوە بۆ میر جەعفەر باقرۆف سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی ئازەربایجانی شووڕەوی بە ڕێگەی کونسوڵی شووڕەوی لە ڕەزائیە بنێردرێن، نامەکان بە زمانی کوردی بوون. لە یەکێك لە نامەکاندا کە بە فارسی وەرگێڕدراوە، قازی محەمەد ئاماژە دەکا بە سەفەری خۆی بۆ (باکۆ) و دیتنی سەرانی شووڕەوی و وتووێژی دۆستانەی لەگەڵ ئەوان. لەلایەکی ترەوە، سەفیری ئەمەریکا لە ڕاپۆرتێکدا تاریخی ئەم ڕووداوە بە "١٤ی ئووتی ١٩٤٥ "باس دەکات، کە جیاوازێکی زۆری هەیە لەگەڵ ڕاپۆرتەکەی سەرلەشکر زەنگەنەدا، بەڵام لەڕاستییەوە نزیکترە، چونکوو ڕووداوەکە کە لە سەرەتای ئووت دەستی پێکردووەو (١٤) ڕۆژ ماوەیەکی شیاوە بۆ چوون و گەڕانەوەیان. کەواتە گیرانی ئەم برادەرانە نزیکەی (٤٧-٤٨) ڕۆژ پێشتر لەو تاریخەیە کە سەرلەشکر زەنگەنە نووسیویەتی*.

سەبارەت بە پەیمانی سێ سنوور مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لە (ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی، ل٢٧٥)دا دەنووسێ: ((من ئیمانم بە پەیمانی سێ سنوور نییە!)). بێگومان دەبێ مەبەستی مامۆستا ئەوە بێ کە نوێنەرانی کورد لەو پەیمانەدا

---

* ئەو سی کەسە، ڕاست ڕۆژی ١٩٤٥/٨/٥ گیراون؛ زەبیحی و دڵشادی ڕەسووڵی کە بەردران، ڕۆژی ١٩٤٦/٢/٢٢ گەیشتنەوە مەهاباد. بەڵام قاسمی قادری لە بیمارستانی شووڕەوی لە تەورێز مایەوە بۆ چارەسەر (بڕوانە: ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا، لە ئینگلیزییەوە وەرگێڕانی ئەنوەر سوڵتانی، بنکەی ژین- سلێمانی، ٢٠٠٥، ل١٦٦؛ "کوردستان" (ڕۆژنامە)، مەهاباد، ژ١٩، ٦ی ڕەشەمەی ١٣٢٤، ل٤).

لە ئاستێکدا نەبوون کە بتوانن کاریگەری بخەنە سەر کێشەی کورد، یا توانیبێتیان لەم بارەوە هەنگاوێکیان نابێ.

## گۆڤاری "ئاوات"

لە مانگی (مارسی ١٩٤٥= ڕەشەمەی ١٣٢٣ی هەتاوی)دا عەبدوڕەحمان زەبیحی لە (تەورێز) ئامێرێکی چاپی بچووکی دەس کەوتبوو، نیازمان وابوو لەمەودوا ژمارەکانی گۆڤاری "نیشتمان" لە مەهاباد بەو ئامێرە چاپ بکەین. لەبەر ئەوە بە باشمان زانی تاریخی پەیداکردنی ئامێرەکە بە بناغەی دامەزرانی چاپخانەی (نیشتمان) دابنێین؛ بۆ ئەم مەبەستە لە ژێرخانی خانووی "دوکتۆر ویناثان" دامانمەزراندو حرووفو کەرەسەی پێویستمان بۆ پەیداکرد.

دڵمان بەوە خۆش بوو کە ئەمە ئەووەڵ چاپخانەیە تا ئەوکاتە لە شاری مەهاباد دامەزرێ، جگە لەوەی کە ئیتر بۆ چاپی گۆڤاری "نیشتمان" پێویستمان بە چاپخانەی (خەلیفەگەری) تەورێز نابێ. خۆم چاوەڕوان بووم زەبیحی لە سەفەری سێ سنوور بگەڕێتەوەو دەست بکەین بە چاپی ژمارە (١٠)ی نیشتمان، بەڵام پاش دووسێ هەفتە لە ڕۆیشتنیان، هەواڵ گەیشت کە زەبیحیو هاوڕێکانی لە گەڕانەوەدا لە (باڵانیش)ی ورمێ لەلایەن لەشکری ئێرانەوە گیراونو قۆڵبەست ڕەوانەی تاران کراون.

ئەم هەواڵە ناخۆشە لە دوو سەرەوە بوو بەهۆی ناڕەحەتیو شپرزەییم: سەرێکیان گیرانی ئەم برادەرانە کە خوا دەزانێ ڕەژیم چییان بەسەر دێنێ؛ لەوسەریشەوە بێکار مانەوەی چاپخانەکە، ئەگەرچی هێندێك نووسینو بابەتی ئامادە بۆ چاپ لەژێر دەستمدا بوو. بەڵام بە ئامادەنەبوونی زەبیحی کە سەرپەرشتیی گۆڤارەکەی بەئەستۆوە بوو، نەدەکرا لەخۆمەوە دەستی پێبکەم. پاش ئەمە کەوتمە سەر بیری ئەوە، با لەخۆمەوەو لەسەر مەسئولییەتی خۆم گۆڤارێك بە کوردی بڵاو بکەمەوە. ئەمەم بە بیرۆکەیەکی باش لێك دایەوە.

جێبەجێ دەستم بە ئامادەکاری کرد. بە یادی زەبیحیو بە سەردێڕی (برای دوورم!) بابەتێکم ئامادە کردو سەردێڕی زۆر لە نووسینەکانی "زەبیحی"م لە بڵاوکراوەکانی (ژ. ك)دا تێدا گونجاند، بێئەوەی ناوی "زەبیحی" بێنم. هەروەها چەند بابەتێکی تر لەگەڵ چەند پارچە شیعری هەژارو هێمنو بابەتێکی دیکە بەناوی (محاکەمەی هیتلەر لە دۆزەخ)دا: ئەمانە برێتی بوون لە ناوەڕۆکی گۆڤارەکە (ژمارە

١ی ئاوات). پێش ئەوەی مانگی (ئووت) کۆتایی بێ، (ئاوات) بڵاو کرایەوە. نزیکەی سەد ژمارەم لەناو برادەرانی حیزبو کەسایەتیەکانی ناو شاردا بڵاوکردەوەو دەوری چوارسەد ژمارە بەهۆی کاك محەمەدی ئەنوەری لەناو شاردا فرۆشرا.

"هێمن"ی شاعیر لە پێشەکیی دیوانی (تاریكو ڕوون)دا ئاماژەی بە گۆڤاری "ئاوات" کردووە. هەروەها "کاك غەنی بلوریان" لە (ئاڵەکۆك)دا بە درێژی باسی کردووە، لە چەند جێگەی تر وەك یەکێك لە بڵاوکراوەکانی (ژ. ك) ناوی هاتووە. مامۆستا "سەمەدی" لە لاپەڕە (٤٥٨)ی (تاریخی مەهاباد)دا ئاماژە بەوە دەکا کە "ئاوات" سێ ژمارەی لێ دەرچووە، بێ ئەوەی ئاماژە بەوە بکات کە کێ دەری کردووە؟ بۆ ئاگاداری پێویستە بوترێ: ئەم گۆڤارە لە ئووتی ١٩٤٥دا تەنیا یەك ژمارەی لەلایەن محەمەدی شاپەسندی چاپو بڵاو کراوەتەوە. ساڵی ١٩٩١ کە بۆ سەردانی خزمان لە مەهاباد بووم، هەوڵم دا بەڵکوو نوسخەیەکم لەو گۆڤارە دەست بکەوێ، بەڵام بێسوود بوو، تەنیا (بەرگی ئاوات)م لە ئارشیڤی مامۆستا "عوبەیدیللا ئەیووبیان" چاو پێکەوت.

## چاپخانەی کوردستان لە مەهاباد

پاش بڵاوبوونەوەی گۆڤاری "ئاوات"، کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە بەهۆی کاك "محەمەدی یاهوو" وەڵامیان ناردبوو، سەرزەنشتیان کردبووم کە بۆچی بێ پرسو ئیجازەی ئەوان گۆڤاری "ئاوات"م بڵاو کردۆتەوە؟! ئینجا ویستبوویان ئاگادار بم بەم زوانە ئامێری چاپ کە کاربەدەستانی شووڕەوی بەڵێنیان دابوو، دەگاتە مەهاباد. بۆیە پێویستە ئامادەکاری بکەم بۆ ڕاهێنانی کادری پێویست بۆ وەگەڕخستنی ئەم ئامێرە. زووتریش ڕووبەڕووی (کاروانسەرای سەید عەلی) جێگا ئامادە کرابوو بۆ دامەزراندنی ئامێرەکەو ئیدارەی چاپخانەو هەروەها ئیدارەی ڕۆژنامەی "کوردستان".

لە ئوکتوبری ١٩٤٥دا ئامێرەکە گەیشتە مەهاباد، ماوەی دوو هەفتە دوو ئەندازیاری ڕووسی خەریکی دامەزراندنی بوون. لەو ماوەیەدا کارگەرەکان خەریکی دابەشکردنو جوورکردنی پیتەکانو مەشقکردنو ڕاهێنان لەسەر دەزگای پیتەکان بوونو لە ماوەیەکی کەمدا چاپخانە ئامادە کرا.

بنەماڵەی چاپخانە ئەمانە بوون: مەلا قادری مودەڕریسی بەڕێوەبەری چاپخانە، مەلا سەیید محەمەدی حەمیدی سەردەبیری ڕۆژنامەی "کوردستان"، سەدیق عەلایی

بەرپرسی ئامێری چاپ، محەمەدی شاپەسندی دەرهێنەرو جێبەجێکەری بەرهەمەکان، ساڵح کاکاغازادە حرووفچین، موتەلیبی شێخ محەمەدی حرووفچین، عەزیزی نانەوازادە حرووفچین، یووسفی ئەورامی حرووفچین، ئیبراهیم کەریمی حرووفچین، حوسینی فەقێزادە حرووفچین، سەعیدی زەرگەیی حرووفچین، سەدیقی خاتەمی حرووفچین، کارگێڕ ... .

لە کارگەرانی چاپخانە، جگە لە ئەرکی چاپخانە، تاقمێکی سروودخوێندنەوەمان پێك هێنابوو بە ڕێبەرایەتیی کاك موتەلیبی شێخ محەمەدی؛ ڕۆژانی پشوودان یا دوای دەوام یا شەوانە، لە ماڵی خۆی فێری سروودخوێندنەوەی دەکردین. زۆر لە سرووده باوەکانی ئەو سەردەمەی پێ ڕەوان کردبووین. ڕۆژی ڕاگەیاندنی کۆمار لە چوار چرای مەهاباد سروودی:

((نیشتمانم ڕەنگینە بەهەشتی سەر زەمینە

خاکم وەکوو ئاڵاکەم ڕەنگ سوورو سپی و شینە ...))مان خوێندەوە.

ئەو ڕۆژە مێژوویيە کارگەرانی چاپخانە لەخۆشیان لە پێستی خۆیاندا جێگەیان نەدەبۆوە! ئەم کارگەرە دڵسۆزانە بە هیچ دەوامێکی ڕەسمی و دیاریکراوەوە بەستراوە نەبوون، تا تەواوبوونی ڕۆژنامە یا ئەو کارەی کە لەبەر دەستیاندایە، دەستیان لە کار نەدەکێشایەوە. جگە لەمە، دەستی کەم حەوتووی یەکدوو شەو تا ڕۆژ خەریکی کار بووین، بەرەبەیانی بۆ دەرکردنی ماندوێتی و حەسانەوە ڕوومان دەکردە حەمامی (پووتی) یا حەمامی (شۆر). پاش بەرچایی، دیسان دەگەڕاینەوە سەر کارەکانمان. بەڵام پێش دەست بە کارکردن، دەبوو نەفەری پەرداخێك شیر بخۆینەوە. بەدەم کارەوە گیانێکمان بە خوالێخۆشبوو "سەدیقی خاتەمی"وە بوو، چونکە بە قسە خۆشەکانی خۆی نەیدەهێشت هیچ کاتێك هەست بە ماندوێتی بکەین.

ئەو چاپەمەنیانەی لەو چاپخانەیە چاپ و بڵاو کرانەوە بریتی بوون لە:

## گۆڤاری "کوردستان"

بڵاوکراوەی بیری حیزبی دیموکراتی کوردستان، نیو مانگی بوو، ژمارە (١) لە ١٥ی سەرماوەزی ١٤٢٤ی هەتاوی (١٩٤٥/١٢/٦ )دا بڵاو کراوەتەوە. نووسەرەکانی: سەید محەمەدی حەمیدی، هێمن، م. عیشقی، ب. شیرین، دڵشادی ڕەسووڵی، خالیدی حسێنی (شێواو)، هەژار، محەمەد تۆفیق وردی، محەمەد عەتری گڵۆڵانی، ع.

خوسرەوی، م. نەژادی، محەمەدی شاپەسندی، عەزیز مەولەوی‌و ئەنوەر دڵسۆز بوون. مامۆستا عەلادین سەجادی دەڵێ (١٨) ژمارەی لێ دەرچووە. ژمارە (١)ی ئەم گۆڤارە نوخشەی بەرهەمی چاپخانەی کوردستان بوو کە لەکاتی فێرکردن‌و ڕاهێنانی کرێکاران‌و چاپخانەدا ئامادە کرابوو. من بەش‌بەحاڵی خۆم تەنیا ئاگاداری چاپی ژمارە ئەووەڵی گۆڤاری "کوردستان"م، یا دەکرێ بڵێم هەر ئەوەندەم لەبیر مابێ.

## ڕۆژنامەی "کوردستان"

بەر لە دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان، ئۆکتۆبەری ١٩٤٥ لە یەکەمین کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستان‌دا لە مەهاباد، بڕیاری دەرکردنی ڕۆژنامەی "کوردستان" پەسند کرابوو. دوای ئەمە کاتی وەگەڕکەوتنی چاپخانە، ڕۆژی پێنجشەممە (٢٠)ی بەفرانباری ساڵی (١٤٢٤)ی هەتاوی، ١١ی کانوونی ١٩٤٦ی زاینی، بە ئامادەبوونی نوێنەری پێشەوا قازی محەمەدو گەورەپیاوانی کۆمار، چاپخانەی کوردستان دەستی بە کار کرد. ژمارە (١)ی ڕۆژنامەی کوردستان بڵاو کرایەوە. ئەم ڕۆژنامەیە بە دوو ڕۆژ جارێك دەردەچوو ١١٣ سەدوسێزدە ژمارەی لێ دەرچووە. سەردەبیری ڕۆژنامەکە مامۆستا "سەید محەمەد حەمیدی" بوو. نووسەرە سەرەکیەکانی: عەبدوڕەحمانی "هەژار"، هێمن، حەسەنی قزڵجی‌و کەسانی تر بوون. کارگەرانی چاپخانەکەش جارجارە بابەتیان تێدا بڵاو دەکردەوە.

## "هاواری نیشتمان"

گۆڤارێکی ئەدەبی‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و بڵاوکراوەی بیری جەوانانی دیموکرات بوو، سەدیقی ئەنجیری ئازەر بەڕێوەبەری بوو، لە شاری مەهاباد بڵاو دەکرایەوە. نووسەرەکانی: سەدیقی ئەنجیری، محەمەدی مەجدی، هێمن، سەعیدی هومایۆنی، م. مەولایی‌و ... بوو. مامۆستا عەلادین سەجادی دەڵێ: گۆڤارێکی بەنرخ‌و دەوڵەمەند بوو. وەك گۆڤار تەنیا یەك ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە، پاشان بە شێوەی ڕۆژنامە* بڵاو کراوەتەوە.

---

* پێنج ژمارە لە "هاواری نیشتمان" بە شێوەی ڕۆژنامە لەناو کتێبخانەی تایبەتی خوالێخشبوو ڕەشید باجەلاندا دۆزرایەوە. بڕوانە: ڕۆژنامەی کوردستان: مەهاباد ١٣٢٤-١٣٢٥ی هەتاوی (١٩٤٦)، ئامادەکردنی ڕەفیق ساڵح‌و سدیق ساڵح، بنکەی ژین‌و دەزگای ئاراس- هەولێر، ٢٠٠٧.

## گۆڤاری "گڕوگاڵی منداڵانی کورد"

بیرۆکەی گۆڤارێکی تایبەت بە منداڵانی کورد، لەسەرەتاوە لەلایەن مەلا قادری مودەرریسی هاتە گۆڕێ، بەڵام لەبەر ئەوەی خۆی ئاگادار بوو کە کارگەرانی چاپخانە لە توانای خۆیان زیاتر ماندوو دەبن، نەیدەویست لەوە زیاتر تەکلیفمان لێ بکات. لەسەر ئەوەشرا، ئێوارەیەك کە تەنیا بووین، مەسەلەکەی درکاندو وتی: ((ئارەزوومەندم جێبەجێکردنی ئەم بیرۆکەو ئەم شانازییە بۆ کرێکارانی چاپخانەکەمان بمێنێتەوە. خۆزگە ئەم ئاواتەمان دەهاتە دی!؟)). بەم جۆرە گڕوگاڵی منداڵانی کورد هاتە ناو ڕیزی بەرهەمەکانی چاپخانەی کوردستان، ئەووەڵ بڵاوکراوەیەك بوو کە بۆ ئەووەڵ جار بەناوی منداڵانی کوردەوە لە مەهابادو کوردستان بڵاو دەکرایەوە.

نووسەرەکانی گڕوگاڵی منداڵانی کورد: مەلا قادری مودەرریسی سەرپەرشتیی دەکرد، محەمەد تۆفیق وردی، سەعیدی زەرگەیی، محەمەد عەتری گڵۆڵانی، م. ص. قزڵجی، سەدیق بەکری، محەمەدی شاپەسندیو حوسەینی فەقێزادە بوون. ئەم گۆڤاری سێ ژمارەی لێ دەرچووە: (١) بانەمەڕی ١٣٢٥(نیسانی ١٩٤٦)، ژمارە (٢)جۆزەردانی ١٣٢٥ (مایسی ١٩٤٥)، ژمارە (٣) پووشپەڕی ١٣٢٥ (حوزەیرانی ١٣٢٥).

لە (ژیانو بەسەرهاتی زەبیحی)دا نووسراوە: گۆڤاری "هەڵاڵە"ش لە "چاپخانەی کوردستان" چاپ دەکرا. بەڵام وا نییە. کاتی خۆی کۆمەڵە ئامێرێکی چاکی بچووکی بۆ کۆمیتەی بۆکان کڕیبوو، "هەڵاڵە" بەم ئامێرە چاپ دەکرا؛ گۆڤارێکی بەنرخ بوو، مامۆستا حەسەنی قزڵجی سەرپەرشتیی دەکرد.

## نزیکبوونەوەم
## لە مامۆستا عەبدوڕەحمانی زەبیحی

سەرەتای پادشایی ڕەزای پەهلەوی، (سابڵاخ- مەهاباد) شارێکی بچکۆلەو خونچیلانەی کوردستانی ڕۆژهەڵات بوو. دانیشتوانی شار لەوسەرەوە تا ئەوسەر یەکتریان دەناسی، کەسوکارو خزمو دۆستو ئاشنای یەکتر بوون. ئەوکاتە من لە پۆلی ئەووەڵی سەرەتایی قوتابخانەی (سەعادەت)ی نزیك مزگەوتی ڕۆستەم بەگ دەمخوێند. باش بوو بەشی خۆم وریا بووم. جارجارە ناوی هێندێك لە قوتابییەکانی پۆلی پێنجەمو شەشەم وەك: (ئاسەفی، موفتی، زەبیحیو مەککی ...)م وەبەر گوێ

دەکەوت. وەك باس دەکرا عەبدوڕەحمانی زەبیحی لەناو ئەو ناوانەدا لە هەموان زیرەکترو بلیمەتتر ناوی دەهات. ئەو ساڵەی کە حکوومەتی ئێران خەریکی دامەزراندنی کارگەی قەندو شەکری میاندواو بوو، ڕۆژانە لە هەموو لایەکی کوردستانەوە خەڵك بۆ بینینی ئەم کارخانەیە ڕوویان دەکردە (میاندواو)، چونکە ئەم کارگەیە سەبارەت بە ئەهلی ناوچەکە شتێکی تازەو سەرنجڕاکێش بوو. هاوکات هەر بە بیری خۆمان پیشەسازیکردنی کوردستان لەلایەن ڕەژیمەوە یا هەر نەبوە، یا بە دەگمەنیش بەرچاو نەکەوتووە!

بەم بۆنەوە، ئێمەیش، (منو باوکم)و میرزا موورادی موراد بێگی لەگەڵ عەزیزی کوڕی لە ڕۆژێکی هەینیدا خۆمان ئامادە کرد، بۆ بینینی ئەم کارخانەیە سەرێك لە (میاندواو) بدەین. بەڵام پێش ئەوەی بڕۆین بۆ کاراژ، بە نزیكماڵی مامۆستا "گیو موکریانی"دا تێپەڕین. لەوکاتەدا باوکم داوای کرد با بۆ یادگاری ڕەسمێ لە ماڵی مامۆستا گیو بگرین.

کاتێك وەژوور کەوتین، عەبدوڕەحمان زەبیحیو "میرزا مەنافی کەریمی"مان چاو پێکەوت، خەریکی خوێندنی دەرسی فەڕەنسی بوون. ماڵەکە لەپێشدا بە ماڵی "مام ئەحمەد ئۆمەربل" خزمی مامۆستا گیو و سەید حوسەین حوزنی ناسراو بوو، کەوتبوە نزیك ماڵی هونەرمەندو مۆسیقاری بەناوبانگی سابڵاخ "قادری ئەوڵا" کە ئێستا کراوە بە پاركو کەوتۆتە گۆشەی ڕۆژهەڵاتی خەیابانی ئایەتوڵڵا تاڵەقانی لە مەهاباد. بەڵام ئەوەی کە عەبدوڕەحمان زەبیحی باسی دەکا، لەوکاتەدا مامۆستا گیو لە ماڵی خۆی بوو، بەڵکە کاروانسەری سەید عەلی وێنەگرێکی تری لێ بوو؛ ئەگەرچی ناویم لەبیر نەماوە، بەڵام لەنزیکەوە باش دەمناسی، یەکێك بوو لە برادەرانی ئیسماعیل زادە، واتا مامی هونەرمەندو خۆشنووسی مەهاباد بەڕێز مامۆستا قاسمی ئیسماعیل زادە.

دوای ئەمە ئیتر هەر لەوکاتەوە هەستێکی تایبەتی پڕ لە ڕێزو دڵسۆزی سەبارەت بە زەبیحی لە دەروونمدا پەیدابوو، بێئەوەی تا ئەوکاتە قسەیەکم لەگەڵ کردبێ. دوای ئەمە کە لە ڕێگاوبان چاوم پێدەکەوت، سڵاوم لێ دەکرد، ئەویش ئەحواڵی دەپرسیم. کاتێ لە (شەریکەی نەفتی حاجی ساڵح شاطری) ڕووبەڕووی ماڵی بابە خەلیفە کاری دەکرد، جارجارە سەرم لێ دەداو تاوێك لای ڕادەوەستام. دوای ئەوەی لەگەڵ باوکم شەرەفی ئەندامەتیی کۆمەڵەمان پێ بڕا، پەیوەندیەکانمان کەم کەم گەرمتر بوون.

ئەوکاتە من زۆر هاتوچۆی (تەورێز)م دەکرد. ڕۆژێك لە (میهمانخانەی خورشید)ی تەورێز یەکترمان گرتەوە، داوای لێکردم فێری حرووفچینی بم، تا لە چاپی گۆڤاری "نیشتمان"دا یارمەتیی بدەم. ئەو ماوەیە ئەگەرچی شاری (تەورێز) لەشکرێکی زۆری ڕووسی تێدا بوو، بەڵام تەشکیلاتی ئەمنیو ئیداریی ڕەژیم لە ئازەربایجان، بەتایبەت لە تەورێز، تا ماوەیەك هەر مابوو، سەبارەت بە ئێمە کەمێك جێی مەترسی بوو. بۆیە وێدەچێ لە سەرەتادا هەر کونسوڵگەریی شووڕەوی خۆی چاپخانەی (خەلیفەگەری)ی بۆ زەبیحی دەست نیشان کردبێ بۆ چاپکردنی "نیشتمان"و چاپەمەنیەکانی تری کۆمەڵە. بەڵام دوای چاپی ژمارە (٤)ی "نیشتمان" کە پەیوەندیەکانی کونسوڵگەریو زەبیحی بەرەو ساردی دەبۆوە، دوور نییە خۆیان (چاپخانەی خەلیفەگەری)یان ڕاسپاردبێ گیروگرفت بخاتە بەردەم چاپی چاپەمەنیەکانی کۆمەڵە، بۆیە ئەوانیش پەلپیان لە ماموستا زەبیحی گرتووە کە پێویستە خۆی بە حرووفچینیی ئەو چاپەمەنیانە هەڵستێ، بۆ ئەوەی دەستی کەم کارەکان دوابخەن! وێدەچێ داواکردنی زەبیحی لە من کە فێری حرووفچینی بم، هەر بەوبۆنەوە بووبێ. جگە لەوە، زەبیحی تا ژمارە (٥)ی "نیشتمان" نە جێیەکی ئامادەکراوی هەبوو بۆ ئەم کارە، نە کەرەستەی چاپ، تا بتوانێ ئەم کارە جێبەجێ بکات.

دوای ئەمە بوو کە زەبیحی بە ناچاری جانتایەکی تەختەی بە دروستکردن دا؛ ئەم جانتایە ناوەکەی خانە خانە بوو، کە دەکرایەوە، دەبوو بە دەزگای حرووف. هەروەها تاقمێك حرووفی پەیدا کردبوو، لەناو دەزگاکەدا بلاومان کردەوە. من بۆ ئەووەڵ جار لە سەر ئەم دەزگایە فێری حرووفچینی بووم. هەروەها لەنزیك (ڕێستۆرانی خورشید) خانووێکمان بەکرێ گرت، ئەم خانووە لە جێیەکی وەها هەڵکەوتبوو جێی مەترسی نەبوو. لەبەر کەمیی پیتەکان، هەر جارە تەنیا دوو لاپەڕە حرووفچینی دەکرا، پاش لەچاپدانی ئەم دوو لاپەڕەیە، هەڵماندەوەشاندەوەو دیسان دوو لاپەڕەی ترمان دەست پێدەکردەوە؛ بەم شێوەیە چاپی ژمارە (٥)ی "نیشتمان" کۆتایی هات.

دوای تەواوبوونی چاپی ژمارە (٥)، لە کۆڵانەکانی ئەوبەری (مسافرخانەی شەبوستەری) خانووێکی باشی خۆمانەمان بۆ هەڵکەوت کە برادەرێك لە (بنەماڵەی ئێلخانی زادە) بەکرێی گرتبوو. لەم خانوەدا توانیمان دووسێ دەزگای (پیت)، پۆندی وردو درشت ئامادە بکەین. لە ژمارە (٦ـەوە تا ٩)، واتا چوار ژمارە، لەم خانوەدا حرووفچینی کراوە، پاشان چاپخانەی خەلیفەگەری بۆی چاپ کردووین.

ئێمە برادەرێکی تری"خەلیل ساوجبلاخچی" ناومان هەبوو، بە ناسناوی (خانە) ناوبانگی دەرکردبوو. ئەم برادەرە تا بڵێی ئینسانێکی ڕووح سووك‌و زیرەك‌و قسەخۆش بوو. ئەگەرچی هاوڕازی ژیانی تایبەتیمان بوو، بەڵام ئەهلی سیاسەت‌و حیزبایەتی نەبوو. لە تەورێز لە (میوانخانەی خورشید)، هەرسێکمان بەردەوام بەیەکەوە بووین، تەنانەت خواردنیشمان هەر بەیەکەوە بوو، لەیەکتر دوور نەدەکەوتینەوە.

مامۆستا زەبیحی دوای چاپی ئاخر ژمارەکانی گۆڤاری "نیشتمان" (٧، ٨، ٩) کە بەهۆی دواکەوتنەوە بەسەریەکەوە چاپ کرابوون، بە نائومێدی لە ڕووسان گەڕایەوە مەهاباد. بەڵام پێش گەڕانەوە، بەهۆی کونسوڵگەریی سۆڤیەتەوە لە تەورێز، دوو نامەی بە زمانی کوردی‌و ئازەری سەبارەت بە مەسەلەی کورد ئاراستەی وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت "بێریا" کرد. بێگومان ئەم نامانە نەگەیشتنە دەستی وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت، بەڵام تووڕەبوونێکی زۆری "جەعفەر باقرۆف"ی سکرتێری حیزبی کومۆنیستی ئازەربایجانی شووڕەوی‌یان لێ کەوتەوە، کە دۆستی نزیك‌و بڕواپێکراوی "ستالین" بوو و بە خەیاڵیدا نەدەهات کەسێ بتوانێ بە پێچەوانەی ویستی ئەو بیر بکاتەوە.

بەڵێ، زەبیحی بەم جۆرە لە ناوەندی سیاسەتی ڕەسمیی کوردستان‌و پەیوەندیە دیپلۆماسیەکانی لەگەڵ کونسوڵگەریی سۆڤیەت، دوور خرایەوە. تەنانەت لەوکاتەوە ناوی زەبیحی لەناو هیچ یەك لەو هەیئەتانەی وا بۆ دیداری بەرپرسانی ئازەربایجانی لە (تەورێز)، یا ئەفسەرانی سۆڤیەت لە ئازەربایجان‌و کوردستان دەست نیشان دەکران، دیار نەبوو! وە بۆ هەردوو سەفەری (باکۆ)ش دەعوەت نەکرابوو.

لەسەر ئەوەشڕا، دوای پەنجا ساڵ لە دووەم شەڕی جیهانی، پاش ماوەیەکی دوورودرێژ لە هەرەسهێنانی ڕەژیمی کومۆنیزم لە شووڕەوی، ئێستاش کاك عەلی کەریمی‌و ئەوانەی وەك ئەو بیردەکەنەوە، نایانەوێ دانی پێدا بنێن، کاتی خۆی، هەڵپەساردنی زەبیحی لەلایەن کاربەدەستانی شوڕەوییەوە جێبەجێ کراوە. کەچی ئەم برادەرانە تازە دەیانەوێ مەسەلەکە بە ناڕێکیی بەینی پێشەوا قازی محەمەدو زەبیحی لەقەڵەم بدەن؛ بۆ ئەم مەبەستە، سیناریۆیەکی لاوازی دوور لە گیانی کەسایەتیی زەبیحی، لە (ژیان‌و بەسەرهاتی زەبیحی)دا بڵاو کراوەتەوە، گوایە زەبیحی دوای گەڕانەوەی بۆ مەهاباد لە ساڵی ١٩٤٥دا ماوەیەك لە (قاوەخانەی کەریم سێ بست) بەندکراوەو دەرگای لێ داخراوەو لە کەلێنی دەرگاوە دۆست‌و برادەری

سەریان لێ داوەو ئەحواڵیان پرسیوە!! وەك دەڵێن داوای (مەڕمەشاو دەرزیو دەزووی ڕەشی کردووە!). سەبارەت بەمە پێویستە بوترێ ئەوکاتە ئێمە بەشی زۆری کاتمان بەیەکەوە ڕابواردو لە ژێرخانی خانووی دوکتۆر ویناثان خەریکی جێبەجێکردنو ئامادەکاری بووین بۆ چاپکردنی ژمارە دواکەوتوەکانی "نیشتمان". بەڵام پێش ئەوەی دەستبەکار بین، هەواڵی سەفەری نوێنەرانی کوردستان بۆ کۆبوونەوەی پەیمانی سێ سنوور بڵاوبۆوە. مامۆستا قاسم قادری، مامۆستا زەبیحیو کاك محەمەد دڵشادی ڕەسووڵی بەرەو سنوور وەڕێ کەوتن. دوای ئەم دانیشتنانە، کە وێدەچێ لە یەك حەوتوو زیاتری نەخایاندبێ، بەرەو مەهاباد دەگەڕێنەوە، بەڵام بەداخەوە لە گەڕانەوەدا دەگیرێنو دەبرێنە تاران.

بەم پێیە، لە ١٤ی ئووتی ١٩٤٥ تا ١٩٤٦/٢/١٣ تەنیا (٦)مانگ لە زیندانە ماونەوە، بە پێچەوانەی ئەوەی کە خوشکە ڕەعنا وتوویەتی. ئەم خوشکە ئەوسا کە من هاتوچۆیانم دەکرد بۆ گەیاندنی باسوخواسی کاکیان (مامۆستا زەبیحی)، زۆر منداڵ بوو، وێدەچێ بە باشی لەبیری نەمابێ.

ئەوجار، با جارێکی تر بگەڕێینەوە سەر (قاوەخانەی کەریمی سی بست)، چونکە مامۆستا پاش گەڕانەوەیان لە (تەورێز)، یا لە بارەگای (ژ. ك) بەیەکەوە خەریکی ئامادەکاریی چاپخانە گچکەکە بووین، یا لەگەڵ برادەرەکانی لە سەفەری سێ سنوور بوو، یا لە زیندانی تاران. کەواتە ئایا کاتێکی وەهای بۆ دەمێنێتەوە تا لە جێیەکی ئەوتۆدا بەند بکرێ؟!

جگە لەمە، لێرەدا زۆر شت لە بەرانبەر پرسیاردا بێوەڵامە! ئایا حکوومەتی کوردستان شەهرەبانی یا جێیەکی تر نەبوو، تا ناچار بێ کەسایەتێکی وەك عەبدوڕەحمان زەبیحیی تێدا بەند بکا؟ یا دەبێ ئەوکاتە هاوڕێ دڵسۆزەکانی لە (ژ. ك)دا لەکوێ بووبن؟! یا بلیمەتێکی وەك زەبیحی دەبێ لە کاتێکی وەهادا (مەڕمەشاو دەرزیو دەزووی ڕەش)ی بۆچی بن؟! بۆ نەیدەتوانی داوای کاغەزو قەڵەم بکاو هەرچی دەیەوێ تێیدا بینووسێ، بەهۆی ئەوانەی کە سەریان لێ دەدا، بینێرێ؟! بێگومان دەبێ ئەو ڕووداوە لە کتێبەکەشدا هەر لە زمانی (نەنکم)ـەوە گێڕدرابێتەوە!

بەداخەوە دوای پەنجا ساڵ لە دووەم شەڕی جیهانیو ماوەیەکی دوورودرێژ لە هەرەسهێنانی سۆڤیەت، ئێستاش کاك عەلی کەریمی نایەوێ باوەڕ بکا کە کاتی خۆی هەڵپەساردنی مامۆستا لەلایەن کاربەدەستانی شوڕەوییەوە جێبەجێ کراوە، بەڵکە

دەیداتە پاڵ نارێکیی بەینی پێشەوا قازی محەمەدو مامۆستا زەبیحی؛ بۆ ئەم مەبەستە سیناریۆیەکی بێداروباری دوور لە چێژی نەتەوایەتیو تەنانەت دوور لە گیانی کەسایەتیی مەندو پتەوی خودی مامۆستا زەبیحیی لە کتێبی (ژیانو بەسەرهاتی مامۆستا عولەما)دا بلاو کردۆتەوە، بەداخەوە زیاتر لە خزمەتی کۆنە کومۆنیستەکانی (ستالینگراد!)دایە کە مامۆستایان بە عونسوری خەتەرناکی سەر بە بەعس لەقەڵەم دەدا!!

## بازرگانیی تووتن!

ڕۆژێك زەبیحیو منو محەمەدی نازمی (ئەفسەری کۆمار) بەیەکەوە لە تەورێز لە ئوتێلی (خورشید) نزیك بازاڕ دانیشتبووین. باسی ئەوە کرا دوای بۆمباران دوخانیاتی سەقز تالان کراوەو تووتنی بێحیساب لە کوردستان بلاو بۆتەوە. نازانم کامەیان بوو کوتی با ئێمەش هێندێك بکڕینو بیهێنین بۆ تەورێزو عەجەمستان، قازانجی باشی لێ دەکەین.

ئەوکاتە بەشی زۆری ئەم جۆرە کاسبیە بە قاچاغی بوو، خۆتو بەختی خۆت! کاتی وەها ئەگەر گیرای ماڵوێران دەبی، وە ئەگەر نەگیرای ئەوا بە کەیفی خۆت قازانج دەکەی. بڕیارمان دا نزیکەی (٢٠ بیست) فەردەیەك بکڕینو بە ماشێنێکی لەشکری سووری ڕووسی بیگوێزینەوە بۆ تەورێزو بیفرۆشین. قەرارمان دانا من بچم تووتنەکان بکڕمو ئامادەی بکەمو بیگوێزمەوە بۆ بازاڕی (قەباغکەندی) بە ئامانەت داینێم تا ماشێن دەبەین. بە دووسی ڕۆژ تووتنەکانم ئامادە کردو گواستمەوە بۆ قەباغکەندیو گەڕامەوە بۆ تەورێز. ڕۆژی دوایی ئەفسەرێکی ئازەریم دۆزییەوەو قەرارو مەدارمان دانا بە پارەیەکی باش ڕێك کەوتین کە ئێوارە لە تەورێز دەربچین. ئێوارە خۆمو زەبیحی لەگەڵ ئەفسەرەکە تەورێزمان بەجێهێشت، نزیك مەغریب بوو لە چواررێیانی مەراغە نزیك بووینەوە. ئەفسەرەکەم تێگەیاند کە ئەمە نوقتەی تەفتیشە، پێویستە ماشێنەکە ڕابگرێ. کابرای ئەفسەر گوتی من بێئیجازە هاتووم، ناتوانم ماشێن ڕابگرم. هەرچی ئێمە هەوڵمان لەگەڵ دا، قەبووڵی نەکردو نزیك چوارڕێیان پێی بەسەر بەنزین داناو لەوێ دوور کەوتەوە. نزیك میاندواو بووینەوە. بینیم لەنزیك کارخانەی قەندی میاندواو بۆمان دانیشتوون. لەوێ هەرچۆنێکی بێ ڕزگار بووینو گوتمان ئێمە لە چوارڕێیان ڕاوەستاوین؛ لەڕێگا ماشێنێك پەکی کەوتووە وێدەچێ هەو بێ، بڕوایان پێکردینو ئیزنیان داین بڕۆین.

هەر ئەو شەوە گەیشتینە بازاڕی قەباغکەندیو تووتنەکانمان بارکردو بەرەو تەوریز گەڕاینەوە. هەر ئەوەندەمان خۆش بوو تا لە چوارڕێیان نزیك بووینەوە، کە ئێمەیان چاو پێکەوت ماشێنەکەیان ناسییەوەو لوولەی تفەنگیان تێکردین، ئەگەر دەرچین تەقەمان لێ بکەن. ناچار ئەفسەرەکە وەستاو ئێمەیان هێنا خوارەوە. زانییان توتنی قاچاغیمان پێیە، هەوڵیان دا تەسلیمی حکوومەتی ئێرانمان بکەن. ناچار نزیکەی پێنجسەد تمەن پارەم پێ بوو لەگەڵ دەمانچەیەك، خستمە بەردەستیان بەو مەرجە چەند کیلۆمەترێك بمانگێڕنەوە بۆ دواوەو بارەکان بخەنو ئیتر کەیفی خۆیانە لەگەڵ ئەفسەرەکە. بەم جۆرە چەند کیلۆمەترێك گەڕاینەوە دواوەو لەسەر جۆگەئاوێك بارەکانیان هەڵڕشتو سەیارەکەمان گێڕایەوە. زەبیجی بە ناڕەحەتی گوتی خوا گەورەیە، خەمت نەبێ. بە پێیان دەچم بۆ مەراغە، مودیری دوخانیات برادەری خۆمانە، بەڵکی بتوانێ شتێکمان بۆ بکات؛ ئەویش ملی ڕێگای گرتو ڕۆیی.

من دوو شەو بوو نەخەوتبووم، پاڵم وە بارە تووتنێك داو چاوم لەسەریەك دانا، نازانم کەی خەوم لێ کەوتبوو. کە ڕاپەڕیم خۆم لەناو چوارسمی وەڵاغێکدا بینی، کە بە باشی چاوم کردەوە، چەند سوارێكو ماشێنێکم بینی. زەبیحی لەناو ماشێنەکەدا بوو، هاتە خوارو گوتی: بەڵێنی داوە شتێکمان بۆ بکات. با تووتنەکەمان بەرن، خەمت نەبێ. تووتنەکانیان خستە سەر ماشێنەکەو سوارەکانیش بەشوێنیەوە وەڕێ کەوتنو ئێمەیان بەجێهێشت. ناچار ئێمەش وەشوێنیان کەوتین بۆ مەراغە. زەبیحی تا سێ ڕۆژ پێش نوێژان دەچوو بۆ لای مودیر. دوایی بە زەبیحی‌یان گوتبوو: ئەگەر ئێوەش خۆتان گوم ناکەن، دەگیرێنو جەریمە دەکرێن. ناچار هەر ئەوە ڕۆژە گەڕاینەوە بۆ سابلاخ.

پاش ماوەیەك شکایەتم لە مودیری دوخانیات کردو داوای بەشە زیانی خۆم کرد. مەحکەمە حەواڵەی (ئیمامی مزگەوتی سوور)ی کردین. باوکم لە دانیشتنەکاندا لەگەڵم ئامادە دەبوو. شەرعەن بەشە زیانی خۆم بەسەردا سەپاند. بەڵام زەبیحیو محەمەد نازمی چاوەنواڕ بوون بزانن هینەکەی من چیی لێ دێتەوە. چەند ڕۆژێك مودیری دوخانیات تەفرەی دامو ئەوجار ئەو شکایەتی لێ کردمو گوتی هەڕەشەی کوشتنم لێ دەکات. ئەوجار منیان تەوقیف کرد. نامەیەکم بۆ حاجی بابەشێخ نووسی، گوتم قوربان لە زەمانی "عومەری کوری خەتاب"یشدا بێتاوان خەڵکیان دەگرتو زیندانی دەکرا. دوای دوو سەعات گوتیان حاجی بابەشێخ لەبەر دەرگای

شەهرەبانی بانگت دەکات. چووم، مەسەلەکەم تێگەیاند، بانگی سەیدە پیرەیان کردو گوتی ئەم کورە ئازاد بکە.

دوای ئەمە، باوکم وتی وازبێنە، تۆ دەرەقەتی ئەوانە نایەی. بەم جۆرە بازرگانیی تووتن، قازانج سەری مایەی خواردو زیانێکی زۆرمان لێ کەوت. زەبیحی و شەهید محەمەدی نازمی تەنیا بەشە پارەی کڕینی تووتنەکەیان زیان لێکەوت، بەڵام زیانی من کاتی گیرانی تووتنەکان مەبلەغی پێنجسەد تمەن پارەی نەغدو (دەمانچەیەك)یان لێ ئەستاندم، تەنیا بۆ ئەوەی تەسلیمی دایرەی (دوخانیات)ی ڕەژیم نەکرێن! ئەمە جگە لەوەی کە پارەیەکی زۆریشم دابوو بە ئەفسەری شۆفێری ماشێنەکە بۆ گواستنەوەی تووتنەکان بۆ تەورێز!

## باقرۆف کێیە؟

"کیانووری" ئاخرین ڕابەری گشتی حیزبی توودەی ئێران، سەبارەت بەم کابرایە دەڵێ: باقرۆف تاوانبارێك بوو، سەبارەت بە تاوانەکانی لە ڕاپۆرتەکان و بیرەوەریەکاندا زۆر باسی لێوە کراوە. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی درێژی خۆیدا، ژمارەیەکی زۆر خەڵکی بە کوشتن داوە، تەنانەت ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە بوڵشویکەکانی دۆستی ئازەربایجانی لەناو بردووە. لە ماوەی حوکمی باقرۆفدا فەسادو گەندەڵی زۆر ڕووی داوە کە لە هیچ یەك لە کۆمارەکانی تری شورەویدا هاوتای نەبوە[1]. باقرۆف پەروەردەی دەستی ستالین بوو، هەر ئەویش بوو کە "بێریا"ی تاوانکاری ژمارە یەکی سەردەمی ستالینی بە ستالین ناساند.

باقرۆف ئازەربایجانی ئێرانی بە ئازەربایجانی باشوور ناودەبرد، دەیویست داگیری بکا. بێریا، وەزیری ئاسایشی سۆڤیەت، هابیری بوو؛ بە تەمای ئەوە بوو ئەگەر ئازەربایجانی باشوور بە (٥) میلیۆن نفووسەوە بخرێتە سەر سێ میلیۆن نفووسی ئازەربایجانی باکوور، ئەوکاتە وەك وڵاتێکی هەشت میلیۆنی پلەوپایەی ئەو لە (پۆلیت بۆرۆ)دا بەرز کاتەوە. بێریاش ئەمەی پێ باش بوو. مسۆگەربوونی (پۆلیت بۆرۆ) بۆ باقرۆف بە قازانجی "بێریا" تەواو دەبوو[2].

---

[1] خاطرات کیانوری، ل١٢٢.

[2] کژراهە، ل٦٦-٦٧.

بەڵام کاتێك ڕوون بۆوە دەبێ شووڕەوی ئازەربایجان چۆڵ بکات، بڕیا هاتە سەر ئەم باوەڕە کە ئەگەر شووڕەوی لەجیاتی ئازەربایجان ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات، کە پاراستنی بۆ شووڕەوی گیروگرفتی زۆرە، چۆڵ بکاتو بەجێی بێڵێ باشترە. ستالینیش بەمە ڕازی بوو. بەڵام ئەوسا ئازەربایجان چۆڵ کرابوو، ئەم قسانە ئیتر سوودیان نەمابوو! باقرۆف سەبارەت بە پرۆسەی داگیرکردنی ئازەربایجانو ئامادەکاریی بێوێنە بۆ جێبەجێکردنی، ئەوەندە خاترجەمو سوور بوو کە لەو باوەڕەدا نەبوو هەرگیز جارێکی تر ئازەربایجان بەجێ بێڵێ!

ئەرتەشبود (حوسەینی فەردوست) سەبارەت بە ئامادەکاریەکانی شووڕەوی بۆ ئەم پرۆسەیە، لە بیرەوەریەکانیدا ئاماژەی پێدەکاو دەڵێ: ((ئەم عەمبارە چەکانەی کە شووڕەوی لە ئازەربایجان قایمی کردبوون، ئەم بۆچوونە دەسەلمێنن. ژمارەی چەکە عەمبارکراوەکان لە تەورێز کە دوای هاتنی لەشکری ئێران بۆ ئەوناوە دۆزرانەوە، لە سەدهەزار زیاتر بوو ... . ئەم جۆرە عەمبارانە لە شارەکانی تریشدا هەبوون، کۆمەڵێکی زۆر بەنرخو نایابیان پیشان دەداو دەیانسەلماند کە بەرنامەی ڕووسەکان بۆ کۆنترۆڵی ئازەربایجان بەرنامەیەکی درێژخایەن بووە، دەنا لەبەرچی ئەم هەموو سەروەتەیان بۆ ئەوێ گواستبۆوە ... . ژەنراڵ "ڕەزم ئارا" لە ڕاپۆرتی خۆیدا ژمارەی ئەم چەکانە بە دووسەد هەزار ناو دەبا، ئەمە جگە لەو چەکانەیە کە بەدەست خەڵکەوە مابوونەوە!))[٣].

باقرۆف، تەنانەت پاش ڕووخانی ئازەربایجان، لە سەفەرێکدا کە لە (باکۆ)وە بۆ مۆسکۆ لەگەڵ "کامبەخش" ئەنجامیان دەدا، جارێکی تر دووپاتی کردەوە کە بێگومان سوپای سوور دەگەڕێتەوە بۆ ئازەربایجانو داوای لێ کرد بەردەوام بە گیان ئامادە بێ بۆ ئەو گەڕانەوەیە[٤]. بەڵێ باقرۆف کە بەناوی: (ئیکی ئازەربایجانن واحد ئاغاسی) واتا (یەکە ڕابەری دوو ئازەربایجان) ناوبانگی دەرکردبوو، تەنانەت پاش تێکچوونی (فیرقەتی دیموکراتی ئازەربایجان)ش هەر بە هیوا بوو جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ ئێرانو ئاواتە دێرینەکەی خۆی جێبەجێ بکات.

---

[3] ظهور و سقوط سلطنت پهلوی، ل١٥٣.

[4] احسان طبری، ل١١٣.

## پێشەوا قازی محەمەد و
## سەرکردایەتیی کۆمەڵە

ئارشی ڕۆزڤێلت لە کتێبەکەیدا سەبارەت بەم مەبەستە، کە بە ڕاستی واقیعی حاڵی پێکاوە، نووسیویەتی‌و دەڵێ: ((کاتێك قازی محەمەد داوای کرد بچێتە ڕیزی ئەندامانی کۆمەڵە، هەووەڵ جار کۆمەڵە ئەم پێشنیارەی ڕەت کردەوە، ئەویش لەبەر ترسی پلەوپایەو ڕێزو ئیحترامو نفووزی بەربڵاوی کەسایەتیی خودی قازی‌و (بنەماڵەی قازیان) بوو. تەنانەت سەرکردایەتیی کۆمەڵە بە بنەماڵەی یەك یەکی ئەندامانی‌و بنەماڵەی زەبیحیشەوە، لەزوووە پێی ڕاهاتبوون، ترسیان لەوە بوو سیاسەتی کۆمەڵەش بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی. کاتێك ئەم داواکارییە جێبەجێ بوو، ئەوجا ئەوەی کە سەرکردایەتیی کۆمەڵە لێی دەترسا، هاتە دی: تاکە کەسێك حیزب بەڕێوە دەبا!))[5].

بەڵام وا نییە، ئەم تاکە کەسەی ئارشی ڕۆزڤێلت مەبەستیەتی، پێشەوا نەبوو. ئەم تاکە کەسە "جەعفەر باقرۆف"ی دیکتاتۆری ئازەربایجانی شووڕەوی بوو کە پێشەوای خستبوە ژێر گوشارەوە. شاردراوە نییە کە بنەماڵەی پێشەوا قازی محەمەد، جگە لەوەی ڕابەری ئاینی بوون، ڕابەری سیاسی‌و کۆمەڵایەتیش بوون. شەهید میرزا فەتاحی قازی (مامی شەهید پێشەوا) لەپێناوی پارێزگاری لە سابڵاخ‌و دانیشتوانی سابڵاخ لە یەکەم شەڕی جیهانیدا لەلایەن ڕووسەکانەوە شەهید کراوە.

پێشەوا قازی محەمەد، سەرەتای ڕووخانی ڕەژیمی ڕەزا شا، بە داهێنانی سیستمی پارێزگاری ئەمنی لە سابڵاخ‌و چەکدارکردنی دانیشتوان، شارەکەی لە مەترسیی کوشتارو تاڵانکردن لەلایەن شڕەخۆری دەوروبەری شارو قەرەپشی ناوخۆ پاراست. ئەگەر ئەم دەست پێشخەریەو پشتگیریی پێشەوا کەمێك وەدرەنگی کەوتبا، چارەنووسی شارەکەو دانیشتوانی بە جۆرێکی سامناك دەگۆڕدراو بە دەیان ساڵ نەدەگەڕایەوە سەر دۆخی جاران. جگە لەمە، پێشەوا بەدرێژاییی ئەو ساڵانەی کە کوردستان لەژێر دەسەڵاتی شوڕەویدا بوو، بەردەوام لەگەڵیان لە مشتومڕدا بووە بۆ سەپاندنی مافی گەلی کورد.

---

[5] ئارشی روزڤلت، ل٢٢.

## بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد و
## فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان

(هەرچی لەم لاپەڕەیەدا بەر چاو دەکەوێ بەشێکە لە ڕاستیەکانی مێژووی کۆن و نوێ لە وڵاتەکەمان کە تائێستا زۆر کەم باسی لێوە کراوە، دڵنیابن پارچەیەکە لە تراژیدیای مێژووی کوردو کودستان!)

لەبەر ئەوەی خاکی کوردستانی ئێران لە دابەشکردنی جوغرافی و ئیداریدا کەوتۆتە سەر ئوستانی ئازەربایجانی ئێران، بۆیە هەر لەزۆوە، تەنانەت پێش سەرهەڵدانی خانەدانی قاجاریەکان و خانەدانی پەهلەوی، لە ئازەربایجانەوەو بە دەستی ئازەربایجانیان حوکمڕانی کراوەو بەردەوام سیاسەتی چەوساندنەوەو داپڵۆسان و زوڵم وزۆر لە کوردستاندا زیاتر لە هەموو جێگەیەکی تری ئێران توندوتیژترو بێبەزەییانەو وەحیشگەرانەتر بووە، واتە دوو چەندانەی هەموولایەکی ئێران بووە.

لەبەر ئەوە لەکۆنەوە پەیوەندیی کوردو ئازەربایجانی ئەگەر دوژمنانە نەبووبێ، هیچ کاتێکیش دۆستانە نەبوە، هەر لەبەر ئەوەش بووە کە پەیوەندیەکانی کۆمەڵەی (ژ. ك)و دوایەش کۆماری کوردستان لەگەڵ فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان هیچ کاتێك هاوکارانەو دۆستانە نەبوە، بەڵکوو بریتی بووە لە پەیوەندیی دەسەڵاتدارو بێدەسەلات! هەر لەبەرئەوەش بوو کە شووڕەوی زۆر مەبەستی بوو پەیمانی هاوکاریی بەینی کوردستان و ئازەربایجان بەپەلە ئیمزا بکرێ! تەنانەت بەدرێژاییی کاتی کۆبوونەوەکانی دوو هەیئەتی کوردو ئازەری، گەورە لێپرسراوانی شووڕەوی لە هۆدەیەکی نزیك هۆڵی دانیشتنەکان چاوەدێرو چاوەڕوانی ئەم کۆبوونەوانەیان دەکرد. لەو دانیشتنانەدا، قسەکانی پێشەوا قازی محەمەد لە سەفەری ١٩٤٥دا بۆ باکۆ، زۆر جار دووبارە دەکرانەوە: ((ئەگەر هاوکاریی ئێمە، تەنیا بریتی بێ لە ژێردەستیی حکوومەتی ئازەربایجان، بەلای ئێمەوە ژێردەستی ڕەژیمی ئێران زۆر باشترە لەو هاوکاریەی کە لە بەرژەوەندی گەلەکەماندا نییە!)).

لەبەر ئەوە پەیمانی هاوکاریی کوردستان و ئازەربایجان، یا ئاشکراتر بڵێین، پەیمانی سەپاوی باقرۆف بەسەر حکوومەتی کوردستاندا کە لە ٢٣ی نیسانی ١٩٤٦دا ئیمزا کرا لەلایەن ڕابەرایەتیی کورد، لە واقیعدا، بە پەیمانێکی سەپێندراو لەقەڵەم درابوو؛ بە ئاشکرا دەوترا: پەیوەندیەکانی ساڵانی (١٩٤١-١٩٤٦)ی کوردستان و ئازەربایجان، هەر درێژەی پەیوەندیەکانی ڕەژیمە کۆنەکانی پێشووی

ئێرانە؛ بگرە ئێستاش، کوردستان لەژێر باری چەوساندنەوەی کاربەدەستانی ئازەربایجاندایە، یا باشتر بڵێین: ڕەژیمی ئێران بە دەستی کاربەدەستە ئازەربایجانیەکان گەلی کورد دەچەوسێنێتەوە!

## کوردو ڕووس

کوشتاری هەزاران کوردی بێگوناهی دانیشتوانی سابلاخ لە ساڵی ١٩١٥دا خاڵێکی ڕەش‌و خوێناوییە بە ناوچەوانی حکوومەتی ئیستیعماری تەزاری ڕووسیاوە. هەروەها کوشتارو قڕانتێخستنی گەلی کورد لە ساڵانی دوای شۆڕشی ئۆکتۆبردا لە قەفقاس، مستەوای پابەندبوونی حکوومەتی شووڕەوی بە شۆڕشی ئۆکتۆبرو بیروباوەڕی کۆمۆنیستی دەخاتە ژێر پرسیارەوە! ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە شووڕەوی هەرگیز سەبارەت بە گەلی کورد سیاسەت‌و بەرنامەیەکی ڕوون‌و ئاشکراو دۆستانەی نەبوە، تەنانەت لە ساڵانی ١٩٤١-١٩٤٦شدا تەنیا بەرژەوەندی تایبەتی خۆی لە بەرچاو بووەو هیچی تر!

شووڕەوی کە لە وڵاتی خۆیدا بەم جۆرە بێبەزییانە لەگەڵ گەلی کورد دەبزوێتەوە، دەبێ لە دەرەوەی وڵاتەکەیدا چ سوودێکی بۆ گەلەکەمان هەبێ؟ سەبارەت بەمە نموونە زۆرە، لێرەدا بەشێکیان دەخەینە بەر دیدی خوێنەری خۆشەویست:

١- ساڵی ١٩٤١، دوای جێگربوونی سوپای سوور لە کوردستان، لەشکری کورد نیازی وابوو هەرێمی ورمێ لە سوپای ئێران پاك بکاتەوەو هەرێمەکە بەتەواوی بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی. بەڵام ئەفسەرە کاربەدەستەکانی شووڕەوی لە ورمێ بەمە ڕازی نەبوون، ماوەیان بە لەشکری کوردی نەدا ئازادکردنی ورمێ یەکلایی بکەنەوە، بەڵام زۆر زوو ماوەیان دا بە حکوومەتی ئێران پادگانەکانی ئەو هەرێمە بەهێز بکات تا لەشکری کورد نەتوانێ ورمێ‌و دەوروبەری ئازاد بکات!

ئەم مەسەلەیە تەنانەت لە سەفەری ١٩٤١ی هەیئەتی کورددا بۆ باکۆ دەنگی دایەوە. باقرۆف سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی ئازەربایجان بەتوندی داوای کرد: ئەم چەکانە کە لەشکری کورد لە ئەرتەشی شا دەستیان کەوتووە، پێویستە بۆ حکوومەتی ئێران بگێڕدرێنەوە. باقرۆف تەئکیدی کرد پێویستە قانوونەکانی ئێران ڕێزیان لێ بگیرێ؟! سەبارەت بە کورد، بەم جۆرە، بەڵام لەلایەکی ترەوە لە ئازەربایجان

خۆیدا، لەوجێگایانەدا کە حکوومەتی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان دامەزرابوو، بارودۆخ بە پێچەوانەی ئەمە بوو. لە قەزوێن شووڕەوی ماوەی نەدا بە ئەرتەشی ئێران یادگانەکانی ئەوناوە بەهێز بکات، واتا بانێکەو دووهەوا!

٢- دوای شەڕی (مامەشە) لە بەرەی (سەقز)، هێزی کۆماری بەو نیازە بوو ناوچەکانی سەقزو سەردەشتو بانە پاکسازی بکات، تەنانەت شاری (سنە)ش ئازاد بکات. بەڵام کونسوڵی شووڕەوی لە ورمێ "هاشمۆف" بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە شارۆچکەی (سەرا)و ڕەسمەن ئۆلتیماتۆمی دا بە لەشکری کۆمارو ڕووبەڕوو پێشەوا قازی محەمەدو مەلا مستەفاو ئەفسەرە فەرماندەکانی کوردی هۆشیار کردەوەو گوتی: ((کوردەکان ناتوانن زۆر پشتئەستوور بن بە یارمەتیی لەشکری شووڕەوییەوە، چونکە شووڕەوی ناتوانێ پێش بە لەشکری ئێران بگرێ ئەگەر لە بەرەکانی تری شەڕدا هێرش بەرنە سەر کوردستان! ...))[6]. بەڵام ڕووسان خۆیان ئاگادار بوونو لایەنی کوردیش زۆر باش دەیزانی کە ڕاست ناکەن.

بەڵێ ئەوکاتە تەنیا ساڵداتێکی لەشکری سوور دەیتوانی پێش بە هەموو ئەرتەشی ئێران بگرێ! کەواتە مامۆستای بەڕێز، ئایا حکوومەتی کوردستان یا (حدکا) ڕووبەری کوردستانیان تەسکو بچووک کردبۆوە، یا ئەوانەی بەم بیانوانە دەیانویست کوردستانو ئازەربایجان قووت بدەن؟! باقرۆف بە تاوانی خەیانەت بە شووڕەوی بە مەرامی کۆمۆنیزم ئیعدام کرا. نازانم بۆ دەبێ پاش پەنجا ساڵ ئێمە نەوێرین یا نەمانەوێ پاش پەنجا ساڵیش ئاماژەیان پێ بکەین!؟ بۆ دەبێ خەیانەتەکانیانو هەڵەکانیان بخەینە ئەستۆی ڕابەرە بەشەرەفەکانی خۆمان؟! بێگومان ئەمە گێرەشێوێنیو چەواشەکردنی ڕاستیەکانە کە دەرخواردی خوێنەری ئاسایی دەدرێ.

٣- بەڵگەی سێهەم:

ڕێککەوتنەکەی پێشەوا قازی محەمەدو قەوامول سەڵتەنەی سەرەك وەزیرانی ئێران کە بە فیتی باقرۆف سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی ئازەربایجانو پێشەوەری هەڵوەشایەوە! ئەوانە گشتی ئەوە دەگەیێنێ کە باقرۆف نەیدەویست کوردستان لە خاکی ئازەربایجان دابڕێ؛ بۆیە ڕازی نەبوو تەنانەت کورد لەگەڵ ئێرانیش ڕێك

---

[6] ئیگلتن، ل١٧٨-١٧٩.

بکەوێ، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کوردستانیان بە بەشێك لە ئازەربایجان دانابوو، ئازەربایجانیش بە بەشێك لە ئازەربایجانی شوورەوی! ئەم پرۆسەیە پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەر ئامادەکرابوو، بەڵام پێ‌ڕانەگەیشتن جێبەجێی بکەن؛ لەکاتی دووەم شەڕی جیهانیدا، واتا زەمانی ستالین، جێبەجێکردنی بە باقرۆف سەرکۆماری ئازەربایجانی قەفقاس سپێردرابوو.

ئەمەو زۆر لە ناوەڕۆك‌و ئاکامی ڕووداوەکان لە سەردەمی دووەم شەڕی جیهانیدا، هەروەها یادداشت‌و بیرەوەریەکانی ژمارەیەك لە ڕێبەرایەتیی حیزبی توودەی ئێران، ئاماژە بەوە دەکەن کە هێندێك لە (هەست)ـەکانی ئادەمیزاد وەك هەستی نەتەوایەتی، هەستی ئاینی لە ئادەمیزاددا لەبیر ناچنەوە. مرووری زەمان ناتوانێ لەناویان بەرێ! ئەم دیاردەیە تەنانەت لەناو هێندێك لە یەکێتیەکانی جەماهیری شووڕەویدا بە باشی بەرچاو دەکەوێ، چونکە ئەگەر وانەبێ، حکوومەتێکی ناسیۆنالیستی توندڕەو لە قەفقاسداو لە باوەشی یەکێتیی جەماهیری شووڕەویدا چۆن پەیدا بووە[٧]؟!

ستالین، خۆی زۆر جار بیری لە مەترسیی تەقینەوەی میللیگەرایی لەناو سۆڤیەتدا دەکردەوە، لەو باوەڕەدابوو ئەم مەسەلەیە ڕۆژێك وەك بۆمب دەتەقێتەوە[٨]. لەسەر ئەوەشڕا، ناچار بوو لەکاتی دووەم شەڕی جیهانیدا, بۆ بەرزکردنەوەی ورەی گەلانی شووڕەوی دژی دوژمن, لە وتەکانی خۆیدا باسی پاڵەوانە نیشتیمانیەکانی سەدە کۆنەکانی ڕووسیا وەك: ئەلیکساندر نوسکی، ئیلیا مورقس، یەنین پاژارسکی بکات. هەڵدان‌و بەرزکردنەوەی (ڕووسی مەزن) لە وتەی ڕابەرایەتیی شووڕەویدا نیشانەو پیشاندەری ئاشکرای شۆڤێنیزمی مەزنخوازانەی ڕووسەکان بوو کە مۆلۆتۆف قسەکەری بوو!

جگە لەمە، کاریگەریی مۆلۆتۆف لەسەر ستالین بریتی بوو لە بەهێزکردنی هەستی ناسیۆنالیستی ڕووسی لەسەر ئەم ڕابەرە گورجییە، بەتایبەت لە سەرەتای دووەم جەنگی جیهانیدا کە مەیدانی بۆ چۆڵکرابوو. هەروەها مۆلۆتۆف سەبارەت بە کشتوکاڵ لە خاکی کازاخستاندا نارازی بوو، چونکە لەوباوەڕەدا بوو کە دەسمایەدانانی دەوڵەتی بۆ کشتوکاڵ، هاوڕێ لەگەڵ باشکردنی شێوەکانی ماشێنکردن‌و هەڵبژاردنی تۆوی باش لە خاکی ڕووسیادا، باشتر سوودی لێ وەردەگیرێ.

---

[7] مەبەست حکوومەتی ئازەربایجانی باقرۆفە.

[8] احسان طبری، کژراهە، ل١١٧.

مۆلۆتۆف لەو باوەڕدابوو کە جووتیارانی ڕووس لە ڕابردوودا نارەوایی‌یان لێ کراوە. ئەگەرچی ئەوکاتە گورجستان لە گەشانەوەدا بوو، بەڵام ڕووسیا هەمان دیمەنی دواکەوتووی ڕابردووی پێوە دیاربوو کە لەپێش شۆڕشی ئۆکتۆبەردا هەیبوو. مۆلۆتۆف وەك ڕووسییەك لەوە ناڕەحەت بوو کە ئەم ناسیونالیزمی ڕووسییە لە هەموو کارەکانی خۆیدا ئاشکراو بەدەرەوە بوو! هەروەها شووڕەوی بە هەموو هێزی خۆیەوە نەیتوانیبوو هەستی نیشتیمانی و میللیگەرایی لەناو گەلانی ئورووپای ڕۆژهەڵاتدا بخنکێنێ.

## حکومەتی شووڕەوی
## موهاجیرە ئێرانیەکان لە خاکی سۆڤیەت دەردەکات

ساڵی ١٩٣٧-١٣١٦، بۆ چارەسەرکردنی باداری (روماتیسم) لە ئەژنۆکانمدا، لە خەستەخانەی ئەمریکیەکان لە تەورێز کەوتبووم و نزیکەی مانگێك لەوێ مامەوە.

ئەوکاتە تەورێز شارێکی خاوەن داب و نەریتی ئاینی و پارێزگارانە بوو، بە دەگمەنیش ئافرەتێکت چاو پێ نەدەکەوت کە مامۆستا یا کارمەند یا کاسب و دووکاندار بێ. بەڵام کاتێك حکوومەتی شووڕەوی ساڵی ١٩٣٧-١٩٣٨ ئەو موهاجیرە ئێرانیانەی کە کاتی پەیدابوونی نەوت لە قەفقاس لە ساڵی ١٩٠٥دا[9] ڕوویان کردبوە ئەم وڵاتە، بەڵام ئامادە نەبوون واز لە شناسنامەی ئێرانیی خۆیان بێنن، لە وڵاتی سۆڤیەت وەدەرناو گێڕایاننەوە بۆ ئازەربایجانی ئێران، ئەم موهاجیرانە لە گەڕانەوەدا داب و نەریت و شێوە ژیانی ئەوسای قەفقاسیان لەگەڵ خۆیان گواستەوە بۆ ئازەربایجانی ئێران، بەتایبەت بۆ شاری (تەورێز) و ئازادییەکی بێ‌بەندوباری کۆمەڵایەتییان خستە ئەوناوە.

ئافرەتانی ئەم موهاجیرانە شان‌بەشانی پیاوەکانیان یا بە تەنیا خەریکی ئیش‌وکار بوون. هێزی کاری بەشی زۆری مسافرخانە، ڕێستۆران، گازینۆ، سینەما، مەیخانەو ...یان بۆ خۆیان قۆرخ کردبوو! بەشی زۆری ئەمانە، دوای دامەزرانی حیزبی توودەی ئێران، چوونە ناو حیزبی توودە. لەدواییدا کاتی دامەزرانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان (توودە)یان بەجێ‌هێشت و بناغەی پێکهێنانی (فیرقەی ئازەربایجان)یان دانا.

---

[9] خاطرات کیانووری، ل١٢٣.

ساڵی ١٩٤١ کە باکوورو باشووری ئێران لەلایەن هاوپەیمانانەوە داگیرکرابوو، گەلانی ئێران بۆ ماوەیەك لە ژێر نیری زوڵم‌وزۆری ڕەژیمی ڕەزا شا ڕزگاریان بوو. گەلەکەمان، بەتایبەت بەشی زۆری ڕووناکبیرانی کورد، بە جۆرێك کەوتبوونە ژێر کاریگەریی پڕوپاگەندەی داگیرکەرانەوە کە بە ڕزگارکەری گەلانی ژێردەستەو مافخوراو ناویان دەبردن. دەکرێ بڵێین پارچە شیعرەکەی عەبدوڕەحمان زەبیحی (شەڕابی سوور)و ناودێرکردنی (وەتاغی سوور)و ئەو جۆرە شتانە لە ماڵەکەیاندا، یادگاری ئەو سەردەمەن‌و ساکاریی‌و کەم‌ئەزموونیی ئەوکاتەی گەلەکەمان بۆ دەگێڕنەوە! هەر ئەو شەپۆلە گەشبینییە ناڕاستە بوو کە ڕابەڕایەتیی کۆمەڵەو بەتایبەت زەبیحیی هان دا تا زیاتر لێیان نزیك بێتەوە؛ تەنانەت بۆ دڵنیاکردنیان لیستی ئەندامانی کۆمەڵەیان بۆ کونسوڵگەریی تەورێز ئاشکرا کرد! بێ‌گومان لێرەدا ڕابەرایەتیی کۆمەڵە زۆر بەهەڵەدا چووبوو، چونکوو وەك لە دواڕۆژەکاندا دەرکەوت، ئەگەر کۆمەڵە وەك لە سەرەتای دامەزراندنیدا دوورەپەرێز بە نهێنی بمابایەوەو سەربەخۆیی خۆی بپارستباو تەسلیمی خواستەکانیان نەبایە، ئەوانیش نەیاندەتوانی ئەوەندە سوور بن تا چارەنووسی کوردستان بە فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانەوە گرێ بدەن!

لەپێشدا زەبیحی، وەك بەشی زۆری ڕۆشنبیرانی کوردی ئەوکاتەی لای خۆمان، ئاگادارییەکی باشی لە مەرامی کومۆنیزم نەبوو. پێم شك نایە لە ئێران هیچ کتێبێکی لەو بابەتەی خوێندبێتەوە. بەڵام لە کوردستانی عیراق، بەتایبەت ئەوکاتەی کە لە (سیتەك) بووین، گەلێك کتێبی لەو بابەتەو بڵاوکراوەکانی حیزبی شیوعیی لوبنان‌و حیزبی کومونیستی عیراق‌و هەروەها کتێبەکانی "جوبران خلیل جوبران"یان بۆ هێنا، عەرەبییەکەی تا ڕادەیەك باش ببوو. شەوو ڕۆژ خەریکی خوێندنەوە بوو. بەشی زۆری ئاگاداریەکانی لە کومۆنیزم، لێرەوە سەرچاوە وەردەگرێ. بەڵام قەت لە بیروباوەڕی کوردایەتی دوور نەکەوتۆتەوە.

شایانی ئاماژەپێکردنە، ئەو ماوەیەی کە لە تەورێز بووین، بەڕاستی بە لوتکەی چالاکیی سیاسیی زەبیحی دەژمێردرێ، هەروەها بە بەهەڵمەتترین ڕۆژانی خەباتی ڕۆژنامەگەریی لەقەڵەم دەدرێ، کە خۆشبەختانە بەگوێرەی توانا لە بەشی چاپ‌و چاپەمەنیدا هاوبەشیم تێدا کردووە. هەروەها ژیانی تایبەت‌و برادەریی سێ نەفەریمان پڕە لە کۆمەڵێك بیرەوەریی خۆش‌و شیرینی وەك شەکرو تفت‌وتاڵی

وەك كەكرە كە مرووری زەمان نەیتوانیوە پەردەی فەرامۆشییان بەسەر بكێشیٚ و لەبیریانی بەرێتەوە.

## خوله پیزه

بەهاری ساڵی ١٩٤٨ لەگەڵ مامۆستا عەبدورەحمان زەبیحیو کاك غەنی بلووریان لە شاربازێڕی کوردستانی عیراق لە دێی (سیتەك) میوانی خوالێخۆشبوو شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی نەمر بووین. بەم بۆنەوە بەشێکی زۆر لە پۆلیسی سوارەی عیراق لە شاربازێڕ کۆببۆوە. قاو بوو گوایە یەکێك لە ئەهلی ناوچەکە بەناوی "خوله پیزه" لە حکوومەت یاخی بووەو بەتایبەت بە دوژمنی سەرسەختی پۆلیس دەژمێردریٚ! بیٚگومان لەوە دەچوو ئەگەر ئەم مەسەلەیە درێژە بکێشیٚ، کاریگەری بکاتە سەر ئیشەکەی ئێمەش.

دوای ماوەیەکی یەکدوو هەفتەیی، دوای نیوەشەوێك لە دەرگایان دا. زۆری نەخایاند گەنجێکی ڕانکوچۆغە لەبەری ڕووخۆش خۆی کرد بە دیوەخانداو یەکسەر خۆی کرد بەناو ئەو جێگایەی کە بۆی ئامادە کرابوو، خۆی داپۆشی. بە ئیشارەت لە شێخ غەفووری بەرپرسی دیوەخانمان پرسیار کرد: دەبیٚ ئەم میوانە ناوەختە کیٚ بیٚ؟!

بۆ شەوی دواییش درەنگانێك وەژوور کەوت، دیار بوو شەکەتە. یەکسەر چووە ناو جێگاکەیو لێی درێژ بوو. بەیانی کاتێك هەڵساین نەمابوو. بەم جۆرە لە سیتەك دوو شەو خوله پیزه میوانمان بوو، بیٚئەوەی تەنیا یەك وشە قسەی لەگەڵمان کردبیٚ، یا ئێمە قسەیەکمان لەگەڵ کردبیٚ! چونکە بارودۆخەکە ئەوەی هەڵنەدەگرت.

## نهێنیەکانی
## چاپی ژمارە (١٠)ی "نیشتمان"

ساڵێك پاش تێکچوونی کۆماری کوردستان، واتا لە ڕەشەمەی ١٣٢٦-١٩٤٨دا، منو کاك غەنی بلووریان بە نیازی بووژاندنەوەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەرەو کوردستانی عیراق وەڕیٚکەوتین. ڕۆژی نەورۆزی ١٣٢٧ (١٩٤٨/٣/٢١) لە شارۆچکەی (خەلان)ی کوردستانی عیراق بووین. پاش هەفتەیەك تەنیا خۆم بۆ دۆزینەوەی عەبدورەحمانی زەبیحی کە لە شاری (ناسریە)وە ڕایکردبوو، گەیشتمە (سیتەك). لەویٚ جارێکی تر لەگەڵ زەبیحی بەیەك گەیشتینەوە. پاش ئەحواڵپرسی، هەواڵی ئەو کوردە مەهابادیانەم لیٚ پرسی کە لە سیتەك یا لە سلێمانین؟ گوتی:

سەدیقی حەیدەری لێرە بوو، گەڕاوە مەهاباد؛ کاک حەسەنی قزڵجی لێرە بوو، ڕۆیشت بۆ بەغدا؛ سەیدە گوڵە لە سلێمانییەو ژنی هێناوە؛ تەنیا من "زەبیحی" لێرە ماومەوە. دوایی منیش پێم ڕاگەیاند کە لەگەڵ کاک غەنی بەو نیازە هاتووین هەوڵ بدەین بۆ بووژاندنەوەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران.

بەڵام زەبیحی لەو باوەڕەدابوو کە حزبی توودە ماوە نادا (حدکا) بە سەربەخۆیی درێژە بە خەبات بدا، بێگومان بە سەدان فرتوفێڵ هەوڵ دەدا خۆی تێبخزێنێ، لە ڕابردوو و کاتی کۆماردا زۆر هەوڵی وەهای داوە! گوتم کەواتە لە بەرامبەر ئەوەدا پێویستە چی بکەین؟ گوتی من لەو باوەڕەدام باشتر وایە لە گۆڤاری "نیشتمان"ـەوە دەست پێ بکەینەوە، بەڵام پێش هەمووشتێك پێویستیمان بە ئامادەکردنی بنکەیەکی (چاپ)و بڵاوکردنەوە هەیە، تا بتوانین بە ئەرکەکانی خۆمان هەڵستین. گوتم: با جارێ واز لەو باسانە بێنین تا کاك غەنی بلووریان دەگاتە ئێرە، ئەوسا بە ڕای هەرسێکمان بەرنامەیەك دادەنێین.

من بەهۆی شارەزایی لە ئەحواڵی زەبیحی، دەمزانی پێشنیارەکەی سەبارەت: (با لە "نیشتمان"ـەوە دەست پێ بکەینەوە) "هەمووی" مەسەلەکە نییە، زەبیحی لەو پێشنیارەدا مەبەستێکی شاردراوەی تریشی هەیە! بەڵام مەبەستی سەرەکیی من ئەوەبوو بە هەر بارێکدا بێ چالاکی دەست پێبکرێتەوە. لەهەمان کاتیشدا پێم وابوو ئێمە قۆناغی (ژ. ك)و "نیشتمان"مان وەك بەشێك لە خەباتی گەلەکەمان بەجێهێشتووەو ئەمڕۆ پێویستیمان بەوەیە بە هەموو هێزمانەوە هەوڵ بدەین بۆ پاراستنو بەهێزکردنی حیزبی دیموکراتی کوردستان- ئێران، حیزبی پێشەوا قازی محەمەد، حیزبی کۆماری کوردستان کە خۆی گەورەترین شانازییە بۆ ئەم حیزبەو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان. بۆ ڕۆژی دوایی کاك غەنی لە سیتەك لامان بوو، خۆشبەختانە ئەویش سەبارەت بە بەرنامەکەی زەبیحی ڕەخنەیەکی نەبوو، پاش یەکدوو ڕۆژ کە شێخ لەتیف گەڕایەوە بۆ سیتەك، زەبیحی بەرنامەکەی ئێمەی بۆ ڕوون کردەوە، بەم جۆرە ڕەزامەندیی ئەوی وەرگرت و شێخ بەڵێنیشی دا بە هەموو جۆرێك یارمەتیمان بدا.

هەر ئەو شەوە، پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆرو وتووێژێکی پاراو، من ئەرکی دروستکردنی مەکینەیەکی چاپم قبووڵ کرد، بڕیار درا لەبەیانییەوە دەستبەکار بم. شێخ لەتیف سەرکارێکی خۆی بەناوی "مەلا عەلی محەمەد" دیاری کرد لە هاتوچۆدا لەگەڵم بێ، هەروەها پیشەسازێکی ئاسنگەری ئاشنای بەناوی "شێخ حسێن" دیاری

کرد هاوکاریم بکا. مانگێکی ڕەبەق لە دووکانی شێخ حسێن خەریک بووین، تا توانیم چاپخانەکە تەواو بکەم. دوایی پێویستیمان بە حرووف و هێندێک کەرەستەی تر هەبوو، ئەویش بەهۆی زەبیحی و شێخ لەتیف ئامادەکرا. لەو ماوەیەدا کە من خەریکی دروستکردنی مەکینە بووم، زەبیحیش خەریکی ئامادەکردن و نووسینی ناوەڕۆکی گۆڤارەکە بوو. من خۆم بابەتێکم بە ئیمزای "ئازاد" ئامادە کردبوو، ئەگەرچی لەکاتی پێشوودا بەناوی "ئازەر" یان "م. ش. ئازەر" نووسینەکانی خۆم ئیمزا دەکرد، هەروەها کاک غەنی وتارێکی ئامادەکردبوو، بەم جۆرە ناوەڕۆکی ژمارە (١٠)ی "نیشتمان" ئامادە کرابوو.

لەپێشدا بۆ تاقیکردنەوەی مەکینەکە یەکدوو بەیاننامەمان پێ چاپ کرد، تا دوایی لەگەڵ گۆڤارەکەدا بڵاو بکرێتەوە. وەك لەبیرم مابێ نزیکەی پێنجسەد نوسخەمان چاپ کرد. بەشێکی کەم لە سلێمانی و بەغدا بڵاو کرایەوە، بە دووجار سێسەد ژمارەمان بۆ مەهاباد ناردەوە.

ئێمە وەك لایەنێك تەنیا زەبیحی نوێنەرمان بوو بۆ پەیوەندیگرتن لەگەڵ برا کوردەکان و لایەنە سیاسیەکانی کوردستانی عیراق. بۆ بەدبەختی ئەوکاتە زەبیحی نێوانی لەگەڵ یەکدوو لایەن باش نەبوو، بەلای منەوە ئەمە یەکێك بوو لە هەووەڵ ئیشتباهە گەورەکانی زەبیحی لە عیراق، کە بوو بەهۆی بڵاوەپێکردنمان و لەدەستدانی ئەم بنکە چاپەمەنیەی کە بێگومان لە دواڕۆژدا سوودێکی زۆری دەبوو بۆ گەلەکەمان. لەوە دەچوو زەبیحی لایەنگریی لە شێخ لەتیف کردبێ. بە ئاشکرا لێیان دەخوێندین، ئەم مەسەلەیە بە بڵابوونەوەی ژمارە (١٠)ی "نیشتمان" بە یەکجاری تەقییەوە! پارتی زۆر بە تووڕەییەوە گلەیییان لە هەژار کردبوو کە شیعری خۆی لەناو "نیشتمان"دا بڵاو کردۆتەوە! ئێمەیان لە چاپەمەنیەکانی ناوخۆی پارتیدا بە ئاژاوەچی ناوبردبوو!

لەلایەکی ترەوە، وادیار بوو کاك غەنی کە فێری ئەم جۆرە ژینەی خەباتی لادێ نەبوو و کاتی سازمانی جەوانانی (ژ. ك) بە هاوڕێسالارییەوە ڕاهاتووە، ڕایگەیاند دەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ مەهاباد. شێخ لەتیف و خۆشمان زۆر لەگەڵی خەریك بووین واز لە خەیاڵاتی گەڕانەوە بێنێ، چونکە زیندان یا دەستی کەم عەسکەریی لەپێشە، بەڵام سوودی نەبوو. لە ئەنجامدا سەرەتای مانگی خەزەڵوەر (ئابانی ١٣٢٧=٢١ی ئۆکتۆبەری ١٩٤٨) گەڕایەوە بۆ مەهاباد، تەنانەت سەد نوسخەی "نیشتمان" کە لامان مابۆوە، لەگەڵ خۆی بردیەوە بۆ مەهاباد.

پاش ڕۆیشتنەوەی کاك غەنی، زەبیحی و من تەنیا کوردێکی ئەودیو بووین لە سیتەك مابووینەوە، لە (سلێمانی)ش تەنیا "سەیدە گوڵە" مابۆوە، بێئەوەی چالاکیی سیاسیی هەبێ. شێخ لەتیف و زەبیحی بەهۆی چەند برادەرەوە هەوڵی باشیان دا کێشەکە چارەسەر بکەن، بەڵام سوودی نەبوو. (ئەوبەری کێشەکە) کە خۆیان بە خانەخوێ و خاوەنماڵ دەزانی، چاوەڕوان بوون زەبیحی وەك (میوانێك) هەڵسوکەوتی هەبێ، بەڵام زەبیحی کێشەکەی بە کێشەی ناوخۆو سلێمانیشی وەك مەهاباد بە کوردستان حیساب کردبوو، بۆیە چاوەڕوان نەبوو وەك میوان حیسابی بۆ بکرێ. بەڵام وادیار بوو برادەرانی سلێمانی بەوە ڕانەهاتبووون! ناچار ماوەیەك چالاکیی خۆمان ڕاگرت، مەکینەی چاپمان ڕاگوێست و هاتوچۆمان بۆ سلێمانی کەم کردەوە.

ئێستا دوو مانگ لە گەڕانەوەی کاك غەنی تێنەپەڕیبوو، ڕۆژێك مەلا عەلی، شێخ لەتیفی ئاگادار کرد گوایە حکوومەت ئاگادارە کە شێخ لەتیف جەماعەتێکی ئێرانیی لە سیتەك داناوەو خەریکی چالاکیی سیاسین.

ئەوکاتە ئێمە نزیکەی (٨-٩) مانگ دەبوو لە سیتەك بووین، چالاکیمان هەبوو، خەڵکێکی زۆریش دەیزانی ئێمە خەریکی چین؟ نازانم بۆ لەوماوەیەدا کەس بە حکوومەتی ڕانەگەیاند، تازە پاش بڵاوبوونەوەی "نیشتمان"، حکوومەت پێدەزانێ!

شێخ لەوە دەترسا لە دەرفەتێکدا حکوومەت بمانگرێ، بۆیە بە باشمان زانی ماوەیەك لە سلێمانی دوور بکەوینەوە، بۆ ڕۆژی دوایی من بە تەنیا خۆم بۆ نیوەڕۆ لە کەرکوك بووم لە ماڵی سەید ئەحمەدی سەید تەهای شەمزینی، کە لە مەهابادەوە دەمناسی، ئەفسەری کۆمار بوو، داوای پێناسێکم لێ کرد، بۆ ئەوەی بتوانم بچم بۆ بەغدا؛ پێناسێکی دامێ بەناوی "عەدۆ سمۆ"وە، واتا "عەبدوڵڵا ئیسماعیل". دوو ڕۆژ دوای ئەمە لە بەغدا بەهۆی برادەرێکی کۆنە سابڵاغی بە نانەسکی لە چاپخانەی (ئەلشەعب) لە بابولاغا (باب الآغا) دامەزرام، دوای چەند ڕۆژ زەبیحیش گەیشت و لەگەڵ حەسەنی قزڵجی لە ڕێستوران (باڕ)ی "عەبدوڵڵا شەریف" وەك وەکیل و موحاسیب گیرسانەوە.

گەڕانەوەی کاك غەنی بۆ مەهاباد لە بارودۆخێکدا ڕوو دەدا کە نەسڵی تازە پێگەیشتووی نەوجەوانانی ئەو سەردەمە، دەرەتانی خەبات و تێکۆشانیان نامێنێ و لە هەموو ئەزموونێکی تێکۆشان بێبەش دەمێننەوە؛ تا وای لێ دێ ناچار دەبن بەهۆی دوو تێکۆشەری کوردی خاوەن ڕابردوو لە حزبی توودەدا، تێکۆشانیان لەگەڵ

خەبات‌و تێکۆشانی حیزبی توودە کە ئەوسا بە ئازادی خەباتیان دەکرد، گرێ بدەن. ئەم هاوکارییە لەساڵی ١٣٢٧دا لەسەر ئەو ئەساسە دەستی پێکرد کە حیزبی دیموکرات پەیڕەوی لە حیزبی توودە بکا، بەڵام بە ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستانەوە بە تێکۆشانیان درێژە بدەن[10].

کاک غەنی لەم بارودۆخە نوێیەدا کە مەیدانێکی فرەوان بۆ بەرزفڕینەکانی خۆی بەدی دەکا، بە یەکجار لە بیرو بۆچوونەکانی ڕابردووی خۆی پاشگەز دەبێتەوە. لە بیرەوەریەکانیدا کە لە ساڵی ١٩٩٧ لە ستۆکهۆڵم- سوید چاپ‌و بڵاوی کردۆتەوە، هەوڵی داوە سەرۆکی کۆمەڵە بە مرۆڤێکی تیرۆریست‌و کۆمەڵە بە حیزبێکی تیرۆریستپەروەر لە قەڵەم بدا، لەکاتێکدا کە سەرۆك یەکێك بوو لە ئەفرادە هەرە باش‌و دڵسۆزەکانی کۆمەڵەو تا دوا هەناسەی سەبارەت بە کوردو کوردستان وەفادار ماوەتەوە.

کاک غەنی لە (ئاڵەکۆك)دا هەوڵێکی زۆری داوە بۆ شاردنەوەدو هەڵگێڕانەوەی زۆر لە ڕووداوەکان‌و باری ڕاست‌و دروستییان، بەتایبەتی بۆ سەپاندنی ئەوە کە ژمارە (١٠)ی "نیشتمان" لە (سیتەك) چاپ نەکراوەو بەڵکە گۆڤاری "ڕێگا" چاپ کراوە. نموونەیەکی لە گۆڤاری "ڕێگا" ژمارە (١) لە (ئاڵەکۆك)دا هێناوەتەوە، کە لەژێر کلێشەی ناوەکەیدا (ئۆرگانی کۆمەڵەی ژیانەوی کورد) نووسراوە.

سەیر لێرەدایە کە ئۆرگانی کۆمیتەی کومۆنیستی کوردستان ببێ بە ئۆرگانی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد! کەچی کەم کەس هەیە ئاگاداری ئەوە نەبێ کە ئۆرگانی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد هەمان گۆڤاری "نیشتمان"ـە. ئەوەی ڕاستە گۆڤاری "ڕێگا" ئۆرگانی (ك. ك. ك)ـە، واتە کۆمیتەی کومۆنیستی کوردستان‌و خاوەن ئیمتیازەکەشی کاك "ڕەحیمی سوڵتانیان"ـە، کاك غەنی بە جەعلی ژمارەیەك دەیەوێ بیکا بە ئۆرگانی کۆمەڵە. کریس کۆچێرا بە ئاشکرا ئاماژەی پێ دەکا، هەروەها دوکتۆر قاسملوو لە (چل ساڵ خەبات)داو چەند کەسی تر باسیان لێوە کردووە. کاك کەریمی حیسامی لە ژمارە (١)ی یادداشتەکانیدا باسی دەکاو دەڵێ ((شەش لاپەڕە بووەو بە ڕۆنیۆ چاپ کراوەو مۆری سووری لەسەر بووە)). تەنیا ئەوەی کە کاك کەریمی حیسامی دەیڵێ کە بە ڕۆنیۆ چاپ کراوە، ئەوە دەسەلمێنێ کە "ڕێگا" لە جێگەیەکی تر چاپ کراوەو کاك غەنی زۆر باش دەزانێ کە ئێمە "نیشتمان"مان بە حرووف چاپ کردووە نەك ڕۆنیۆ.

---

[10] جەلیل گادانی، ٥٠ ساڵ خەبات، ل٦٨.

جگه لەمە، لە بارودۆخی ساڵی ١٣٢٧ کەسایەتێکی وەك حەسەنی قزڵجی هەرگیز نەیدەتوانی لە شارێکی وەك مەهاباد دانیشێ و لە گۆڤارێکی وەك "ڕێگا"دا هاوبەشی بکات. بەپێچەوانەوە ئێمە هەمووومان دەمانتوانی تەنانەت جێگای دانیشتنی لە بەغدا بەباشی ئاگادار بین، کە لای عەبدوڵڵا شەریف کار دەکات. لەمەش زیاتر، شێوە نووسینی بابەتەکانی "ڕێگا"و دارشتنی جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ شێوەی نووسینی قزڵجی و "ڕێگا" تەنانەت هەڵەی ئیملایی گەورەی تێدا بەرچاو دەکەوێ، کەچی قزڵجی لە ١٩٥٨دا وتاری عەرەبیی بۆ ئیزاعەی بەغدا دەنووسی و کەس نەیدەتوانی هەڵەی لێ بگرێ.

کاك غەنی لە (ئاڵەکۆك)دا، پاش ماندووبوونێکی زۆریش نەیتوانیوە بیسەپێنێ کە "ڕێگا" لە سیتەك چاپ کراوە، بەڵکە دان بەوەدا دەنێ کە لەبەر ئەوەی زەبیحی بەهۆی نامیلکەکەی شێخ لەتیف توورە بوو، هەروەها شاپەسەندی چوو لە بەغدا نیشتەجێ بوو! سەمەدی و قزڵجی ئەگەرچی لە سەرەتادا قەولیان دابوو هاوکاریی بکەن، بەڵام نەیانکرد، بەهۆی ئەم پاساوانەوە لە چاپکردنی "ڕێگا"دا سەرکەوتوو نەبوە! لە وەڵامی ئەو پاساوانەدا پێویستە بوترێ کە: وتووێژی "ڕێگا" لەئارادا نەبوە، زەبیحیش بێگومان توورە نەبوە، شاپەسەندی چەند مانگ دوای ئەمەش هەر لە سیتەك بوو، قزڵجی لە بەغدا بوو و سەیدە گوڵە لە سلێمانی کاری بەم ئیشانەوە نەبوو.

هەروەها پێویستە بوترێ بە پێچەوانەی قسەکانی کاك غەنی، من پاش حەوت ساڵ لە قسەکەی کاك غەنی لە شاری (دیوانیە) کچە کوردێکم مارە کردووەو ئەو ٤٧ ساڵە هاوسەرو هاوبەشی تاڵی و تفتیی ژیانمە، چوار کوڕو پێنج کچمان هەیە، لە ماوەی ئەم نیو سەدەیەدا تەنیا ٩–١٠ ساڵ کە خەریکی کاسبیی ئازاد بووم، بە تێروتەسەلی ژیاوم، ٤٠ ساڵەکەی تری گشتی لەژێر پلەی نزمی هەژاری، بەڵام بە سەربەرزی ژیاوین، لە ڕابردووی خۆم پەشیمان نیم، بەڵکوو بە مایەی سەربەرزیی خۆمی دەزانم.

سەیر ئەوەیە کاك عەلی کەریمی لە کتێبەکەیدا: (ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی، ل١٢١) سەبارەت بەم مەسەلەیە دەڵێ: گەیشتوومەتە ئەو قەناعەتە، لەپێشدا "ڕێگا" چاپ کراوەو دوای گەڕانەوەی کاك غەنی بۆ مەهاباد، ئینجا زەبیحی و شاپەسندی "نیشتمان"یان چاپ کردووە! بەڵام بەلای منەوە کە کاتی خۆی لەناو کێشەکەداو بەڵکە لایەنێکی کێشەکە بووم و هەروەها شاهیدێکی زیندووی ئەم مەسەلەیەم، بۆچوونەکەی کاك عەلی کەریمی شکاندنەوەیە بەلای چەواشەکەرو شێواندنی مێژوودا، بەپێچەوانەی مەبەستی ئێمە کە

ساغکردنەوەی ڕاستیەکان‌و خزمەتی مێژووی گەلەکەمانە. گۆڤاری "ڕێگا" کە کاک غەنی وەك سیناریۆ لە (ئاڵەکۆك)دا باسی دەکا، ئەگەر لە عالەمی ڕاستەقینەشدا بێ، ئەوە نییە کە دوکتۆر قاسملوو باسی کردووە.

کەواتە ئێمە چ هاندەرێك پاڵمان پێوە دەنێ وەپێش بەرهەمی خۆمانی بخەین؟ هەر لەبەر ئەو ناکامییەش بوو کە کاک غەنی لە وەڵامی نامەکەی "کاک عەلی کەریمی"دا (ژیان‌و بەسەرهاتی زەبیحی، ل١٢٠)، بۆ سەپاندن یا یەکلاییکردنەوەی کێشەکە، تووشی هەڵەیەکی گەورەتر دەبێ‌و پەنا بۆ چەواشەکردن‌و گێرەشێوێنی دەبا. بەڵێ کاک غەنی لە (ئاڵەکۆك، ل٨٢)دا دەڵێ: ((بەر لە چاپی یەکەم ژمارەی ڕێگا، شێخ لەتیف پەرتووکێکی ... هتد)). بەڵام لە وەڵامی نامەکەی کاک عەلی کەریمیدا کە دەیەوێ ئەم ڕستەیە بگوێزێتەوە بۆ (ژیان‌وبەسەرهاتی زەبیحی، ل١٢٠، دێڕی ١١) بە گۆڕینی (وشەیەك) خۆی بەدرۆ دەخاتەوەو دەڵێ: ((پاش چاپی یەکەم ژمارەی ڕێگا، شێخ لەتیف پەرتوکێکی ... هتد)). بەڵێ بە گۆڕینی ئەم وشەیە (بەر– پاش) بۆمان دەردەکەوێ ئەوەی کە کاک عەلی نەیتوانیبوو لە (ئاڵەکۆك)دا بیسەپێنێ، ئەوا لە (ژیان‌و بەسەرهاتی زەبیحی، ل١٢٠، دێڕی ١١) هانا بۆ جەعل‌و تەزویر دەبا، بەڵام ئەمجار پەتی فرت‌وفێڵ لەوە کورتتر بوو کە مامە غەنی دەیویست!

جێی خۆیەتی پرسیار بکرێ، چاپی گۆڤارێك لە سیتەك یا جێگەیەکی تر چی گرنگییەکی هەیە، چی لە نرخی گۆڤارەکە زیاد یا کەم دەکاتەوە؟! لێرەدا جیاوازی لەوەدایە کە کاک غەنی لە سیتەك لە چاپکردنی ژمارە (١٠)ی "نیشتمان"دا، هاوڕێ‌و هاوکارمان بوو؛ بەڵام کاتی گەڕانەوەی بۆ مەهاباد بەسەر بارودۆخێکی نوێدا دەکەوێ‌و ئەم بارودۆخە نوێیە لەگەڵ سروشتی ڕێبەرمەئابی کاک غەنی‌دا سازکار دەبێ‌و وای لێ دەکا پەردەیەکی فەرامۆشی بەسەر چالاکیەکانی پێشووی خۆیدا بکێشێ. بۆیە لەپێشدا دەیەوێ هاوکاری خۆی لەگەڵ گۆڤاری "نیشتمان" کە گۆڤارێکی ناسیۆنالیستییە! بشارێتەوە، ئەمەش نە تەنیا سەبارەت بە "نیشتمان"ی ژمارە ١٠، بگرە لە گشت چالاکیەکانی سیاسیی خۆی لە ڕابردوودا پاشگەز دەبێتەوە، بە تەوجیهی ئەم پەشیمانییەش مۆرکی پێشکەوتنخوازی دەخاتە سەر هەموو هەڵسوکەوتەکانی خۆی.

## فەرماندەی جووڵانەوەی مووسڵ
## لێپرسینەوەم لەگەڵ ئەنجام دەدا

سالأنی پێش شۆڕشی تەمووزی مەزن لە شاری (دیوانییە) بووم، لە بارەگای فیرقەی (الاولی) بەرپرسی کانتینی ئەهلی بووم. خۆم لە (تەحافی) دەبووم، چایخانەو بەقاڵی بە ئیجار درابوو. ئەوکاتە یەك چا لە حانووتی ئەهلی بە ٤ فلس (یەك عانە)، لە کانتینی عەسکەری بە سێ فلس بوو.

گرانفرۆشیی زیاتر لە نرخی بازاڕ قەدەغە بوو. بەڵام لەبەر ئەوەی زۆربەی سەربازەکان خێزاندار بوون، مووچەکەیان بەشی نەدەکردن و ناچار بوون لەملاو ئەولا قەرز بکەن؛ بەردەوام بەقەدەر مووچەکەیان لە کانتین قەرزار بوون، هەمیشە ناچار بوون ملکەچی خاوەنقەرز بن، لەسەر حیسابی مانگی نوێ خۆیان قەرزدار بکەن. بەشی زۆری ئەوانە بە (نرخی تاك) جگەرەیان لە کانتینچی وەردەگرت، بە نرخی (کۆ) واتا بە زیان لە بازاڕ یا بە خودی کانتیچییەکەیان دەفرۆشتەوە. هەر پارچەیەك جگەرەی ٢٤ پاکەتی (١٢٠) فلس زیانیان تێدا دەکرد. بەم جۆرە هەر لە ئەووەڵی مانگەوە بەشێك لە مووچەکانیان وەك فایز (سوود) تێدا دەچوو!

ڕۆژێك سەربازی (بەردەست- مراسل)ی عەقید عەبدولوەهاب شەواف، دواتر فەرماندەی جووڵانەوەی مووسڵ، داوای پاکەتێك جگەرەی (گۆڵدفلاك)ی کرد، دوای ئەوەی (٥٥) فلسم لێ وەرگرت پاکەتێکی (١٠) جگەرەییم دایە. پاش چارەگە سەعاتێك گەڕایەوە، گوتی ئامیر بانگت دەکات. زوو زانیم چ باسە، تەنیا (٥) فلس زیادم لە نرخی خۆی لێ وەرگرتبوو. ئەگەرچی ئەفسەرێکی زۆر تووڕەو جوێنفرۆش بوو، لەبەر ئەوەی دەیزانی ئەفسەرە کوردەکان گشتیان خۆشیان دەوێم، جوێنی پێ نەدام، بەڵام پاکەتەکەی بە سینگمدا داو گوتی: تۆ چۆن زات دەکەی (٥) فلس لە من زیاد بستێنی؟ ئەوە نییە لە (کانتینی ئینزبات) بە پەنجا فلس دەفرۆشرێ؟! دوای ئەوەی دڵنیا بووم پاکەتەکە گەڕاوەتەوە ناو گیرفانی خۆم، گوتم قوربان ئەگەر ئیجازەمان بدەن ئێمەش دەتوانین بە پەنجا فلس بیفرۆشین. گوتی چۆن؟! گوتم قوربان کانتینی ئینزبات جگەرەی قاچاغ دەکڕن و دەتوانن بە کەمتر بیفرۆشن. بەڵام ئێمە ناوێرین شتی وەها بکەین. زیندانی دەکرێین و جەریمەشمان لێ دەستێنن! کە وام پێگوت هێندێك سارد بۆوە، گوتی ئاخر نابێ زیاد لە من بستێنی، گوتم ئەمر دەکەی قوربان!!

لێرەدا مەترسی لەوە دابوو ئەو پاکەتەی وا بۆم ناردبوو گومرگ نەکراو بوو، باندرۆلی پێوە نەبوو. ئەگەر چاوی پێ بکەوتبا، بەیەکجاری بەسەر مندا دەتلایەوە. من کاتێك بیرم لەوە کردەوە ئەو درۆیەی لەگەڵ بکەم، پاکەتەکە گەڕابۆوە بۆ لای خۆم‌و بەدەست ئەوەوە نەمابوو، نەشدەکرا جارێکی تر لێم وەرگرێتەوەو بزانێ قاچاغە یا نا؟!

ئەوکاتە جگەرەی باوی ئەفرەنجی لە بازاڕەکانی عیراق بریتی بوو لە: ابوالجمل، ڕەش‌و سپی: بلاك وایت ٥٠ جگەرە لەناو قوتوولەیەکدا بوو، ئەبو بەزوون، گۆڵد فلاك، دیمۆری‌و ... جگەرەی بەرهەمی عیراق: پاکەتی لۆکس، پاکەتی تورکی، پاکەتی موختار، پاکەتی جەمهووری، غازی ...، بەشی زۆری ئافرەتی عەرەب پاکەتی (لۆکس)یان بەکاردێنا. بەڵام کاتی کڕین، لەجیاتی وشەی (لۆکس) (وشەی "لۆك"یان پێ باشتر بوو!). ئەمە جگە لە جگەرەی (بەرماغ)، تووتن‌و پەڕ، تووتنی بۆندار، سەبیلەی کوردی‌و ....

## ڕۆڵی ڕۆژنامەی "خەبات"ی نهێنی لە شۆڕشی ئەیلوولدا

لە وتووێژێکی تەلەفیزۆنیدا دکتۆر کەمال فوئاد دەڵێ: ((خەبات لە مارتی ١٩٦١دا داخراوە))، بەڵام لە (کاکەمەم بۆتانی، کاکی کاکان، ل٣٤١)دا نووسراوە: (چاپخانەی "خەبات" سەلاحەدین) لە نیهایەتی ١٩٦٠دا گوێزراوەتەوە بۆ (ساحة النهضة). بەم پێیە بێ‌گومان داخرانی خەبات ماوەیەکیش پێش گواستنەوەی چاپخانەکە ڕووی داوە، کە ئەوە دەگەیەنێ چەند مانگێك جیاوازی لە تەئریخی ڕاستەقینەی داخرانی "خەبات"دا هەیە.

بێ‌دەنگ مانەوەی خەبات لە هەلومەرجی ئاڵۆزی ئەوسادا، بیری ئەو دڵسۆزانەی کە پەیوەندییان هەیە بە مەسەلەکەوە، بەخۆیەوە خەریك کردبوو، بەتایبەت زەبیحی‌و من، کە تا ڕادەیەك لەو مەسەلانەدا خاوەن ئەزموون بووین! من لە دەروونی خۆمدا لۆمەی خۆمم دەکرد بۆچی ئەوکاتەی "خەبات" ئازاد بوو لە بیری ئەوڕۆدا نەبووم؟ کە دەستی کەم شتێکی نهێنی بۆ ئەم ڕۆژانە دابین بکەم تا ئەمڕۆ پەکمان نەکەوێ؟ خۆ ناکرێ حکوومەت تاسەر دەست بە دەمی "خەبات"دا بگرێ‌و نەیەڵێ نووزەی بێ!

بۆیە پێویست بوو چارەسەرێك بدۆزینەوە، پێویستمان بە ( بەدیل)ێکی سادەو ساکار هەبوو کە یەك یا دوو نەفەر بتوانێ بەڕێوەی بەرێ. بۆ ئەم مەبەستە من لە زەینی خۆمدا شتێکی ئەوتۆم گەڵاڵە کردبوو، ئەگەرچی لەچاو "خەبات"ی ئاشکرای

جاران جیاوازیی ئەوەندە زۆر بوو، عومری نووحو سەبری ئەییووبی دەویست؛ بەڵام هەرچۆنێکی بێ ناچاری سەپاندبووی بەسەرماندا. ئەمەم بۆ زەبیحی بە باشی شی کردەوەو پێم گوت: ئەگەر لەم ناچاریەدا بتوانین چەند ژمارەیەك لە مانگدا دەربکەین، لەوە باشترە کە بێ "خەبات" بمێنینەوە. ئەویش زۆری پێ باش بوو، دوایی داوام لێ کرد ئەمە وەك پێشنیارێك پێشکەشی (م. س) بکات، ئەگەر پێیان باش بوو دەستی پێ بکەین. وادیار بوو ئەوانیش هەر زۆر زوو پەسندیان کردبوو.

ئەوکاتە خوالێخۆشبوو نووری ئەحمەد تەها بە نهێنی لە بەغدا بوو، پێی گوتم: ئێمە ئەو مەکینەیەمان بۆ سلێمانی دەوێ، بەو مەرجە خۆشت بەڕێوەی بەری، هەروەها ناوێکی نهێنی "هەوراز"ی بۆ دیاری کردم کە لە داهاتوودا پەیوەندیەکانم بەو ناوە دەبێو داوای لێ کردم لە حیزبایەتیو کۆبوونەوەو ئەفرادی حیزبی دوور بکەومەوە، بۆ ئەوەی بتوانم خۆم بپارێزم.

ئەوکاتە، لە عیراقو بەتایبەت بەغدا، کڕینی کەرەسەی چاپ بێئیجازەی ڕەسمی کاری هەمووکەسێك نەبوو، بەڵام سەبارەت بە من کە زۆر لە چاپخانەکانو تاجیرە عومدەفرۆشەکان دەیانناسیم، جارجارەش بەناوی چاپخانەکانی کەرکووكو سلێمانی حرووفو ئەو جۆرە کەرەسانەم لێ دەکڕین، گومانیان لێ نەکردم. وابوو هەر ئەم ڕۆژە دەست بەکار بوومو لە ماوەیەکی دە ڕۆژیدا هەرچی بۆ چاپخانەیەکی نهێنی پێویست بوو ئامادەم کردو بەهۆی برادەرانی خۆمانەوە نێردرایەوە بۆ سلێمانی. دوای دووسێ ڕۆژ خۆشم گەیشتمە سلێمانی، یەکسەر بردیانم بۆ ماڵی "ئەحە بچکۆلی خەیات". ئەو ماڵە برێتی بوو لە کاك ئەحمەد، کە یەکێك بوو لە خەیاتە باشەکانی سلێمانیو دایە خورشید دایکی کاك ئەحمەدو خێزانیو نەبەزی کوڕیو دوو کیژی منداڵ؛ ماڵێکی باشو کوردپەروەر، بە وردو درشتیانەوە لە خزمەتی کوردایەتیدا بوون. ئەو ماڵە پێش ئەمەش هەر مەخفیگای پارتی بووەو لەکاتی پێویستدا زۆر لە ڕابەران لەو ماڵەدا خۆیان شاردۆتەوە. کاك ئەحمەد پیاوێکی دڵتەڕو ئەهلی زەوق بوو. دڵی بەوە خۆش بوو کە لە خزمەتی کوردایەتیدایە!

ئەو هۆدەیەی بۆ چاپخانە دیاری کرابوو، کەوتبوە ناو حەوشی خانووێکی تر، دەرگای نەبوو، لەناو تاقەیەکدا دەرگایەکی بچووکی هاتوچۆکەریان بۆ دروست کردبوو، کە دەچوویتە ژوورەوە پەیوەندیت لەگەڵ عالەمی دەرەوە دەپچڕا.

چاپخانەکەم لەوێدا دامەزراند. کاتێ غەریبەیەك یا میوانێك دەهات، گڵۆپێکی سوور ئاگاداری دەکردمەوە کە تەقەوڕەقە کەم بکەمەوە!

چەند ڕۆژێك خەریکی تایمکردنی ئامێرەکە بووم. بۆ بەدبەختی کاك نووری لەو باوەڕەدا نەبوو کە من بەو ئاسنە شکاوانە "خەبات" چاپ بکەم، بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی نموونەی دوو لاپەڕەم بۆ ئامادە کردبوو بۆ هەڵەبڕی. جارجارە خوشکە شەمسەی برازای کاك حەمەی ئەوڕەحمان، لە ژوورەوە یا بۆ هێنان و ڕاگواستنی کاغەزو ڕۆژنامە یارمەتیی دەدام. بەم جۆرە ئەووەڵ ژمارەی "خەبات"ی نهێنی لە سلێمانی تەواو بوو و بڵاو کرایەوە، ئەمیش لەخۆیدا سەرکەوتنێکی گەورە بوو بەسەر گیروگرفتی چاپدا[11].

دوای بڵاوبوونەوەی ئەم ژمارەیە، خەریك بووم خۆم ئامادە دەکرد بۆ دەسپێکردنی ژمارەیەکی تر. مێزێ کە مەکینەکەم لەسەر دامەزراندبوو، هێندێك دەجووڵا، ئەگەرچی پارچە کۆنکریتێکی گەورەمان پێوە هەڵپەساردبوو، دەمەویست ئەم کۆنکرێتە هێندێك بجووڵێنم تا باشتر پاڵی وێبدا، بەڵام پارچەکە بەلای خۆمدا هات. ئیتر لەتوانامدا نەبوو بیگێڕمەوە، ئەگەر بەسەرمدا کەوتبایە پانی دەکردمەوە، ناچار لاقم لە دیوار گیر کردو هەرچی هێزم تێدا بوو پاڵم پێوەناو گێڕامەوە دواوە. پاش دووسێ ڕۆژ بۆم دەرکەوت کە لەژێر ناوکمەوە تووشی فتق بووم‌و کەم کەم

---

[11] تا دوای نووسینی ئەم بابەتەی سەبارەت بە ڕۆژنامەی "خەبات"، من لە باوەڕەدابووم کە دەبێ ئەووەڵ ژمارەی "خەبات"ی نهێنی ئەوەبێ وا هاوینی ١٩٦٢ لە سلێمانی چاپو بڵاومان کردۆتەوە. بەڵام خۆشبەختانە مامۆستا سدیق ساڵح ئاگاداری کردمەوە کە پێش ئەم تەئریخەش ژمارەیەکی تر هەر لە بەغدا بە نهێنی بڵاوکراوەتەوە کە بە ئەووەڵ ژمارەی نهێنیی "خەبات" دەژمێردرێ. ئەم ژمارەیە کە ڕەقەمی (٤٦٥)ی لەسەر نووسراوەو (١٢) لاپەڕەیە، سەرەتای نیسانی ١٩٦٢ لە یەکێك لە چاپخانەکانی بەغدا بە نهێنی چاپ کراوە، وا پێدەچێ یەکدوو مانگ پێش دامەزراندنی (چاپخانەی خەبات) لە سلێمانی بڵاوکرابێتەوە.

ناوەڕۆکی ئەم ژمارەیە گرینگ‌و بەڕاستی هەڵوێستی سیاسیی ئەوسای حکوومەتی عیراق سەبارەت بە گەلەکەمان پێشان دەدا، بەڵام بە داخەوە مرووری زەمان‌و کاریگەریی کەش‌وهەواو شێ لەو ماوە دوورودرێژەدا کاری کردۆتە سەر هێندێك لە لاپەڕەکانی‌و شایانی ئەوەیە جارێکی تر چاپ بکرێتەوە.

[مەبەست لێرەدا ژمارە(٤٧٤)ی شوباتی ١٩٦٦ی ڕۆژنامەی"خەبات"ی باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستانە. ئەوەی ئاشکرایە ژمارە ٤٧٤ی "خەبات"ی سەر بە خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا بارزانی تشرینی دووەمی ١٩٦٤ بە هەشت لاپەڕە بڵاو کراوەتەوە. خەبات- النضال، ڕۆژنامەیەکی سیاسیی ڕۆژانەی ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان‌و خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەری مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بوو، ژمارە ١ی ٤ی نیسانی ١٩٥٩ لە شاری بەغداد دەرچووە. تا داخستنی (٢٨ی مارتی ١٩٦١) ٤٦٢ ژمارەی لێ دەرچووە.- سدیق]

گەورە دەبوو تا نەشتەرگەریم کرد. ڕاستی ئەوەیە لەبیرم نەماوە لە سلێمانی چەند ژمارەم دەرکردووە، بەڵام زۆری نەخایاند هەواڵیان بۆ هێنام کە پێویستە چاپخانەکە بگوێزرێتەوە بۆ ناو شۆڕش بۆ دەرەوە. ئەوسا ماڵەکەشم هێنابوە سلێمانی و لەنزیک ماڵی کاک ئەحمەد خانووێکم بەکرێ گرتبوو.

چاپخانەکەم پێچایەوەو تەسلیمی "کاک نووری"م کرد کە بەڕێگەی تایبەتدا بینێرێ بۆ دەرەوەی شار. ئەمە کاتێك بوو کە حاجی گەڕابوونەوە، بە باشم زانی خۆم بکەم بە حاجی و لەگەڵیان بکەوم. کاکەحەمەی حاجی مەلا عیززەت کەشیدەیەکی نوێی بۆ هێنام. ئێوارەیەك لەگەڵیان کەوتم، لە ڕەبیەیەکی کەنار شار سەری خۆمان چاك کردەوەو بە (گۆیژە)دا هەڵگەڕاین. ئەو شەوە لە چایخانەکەی (بناویلە)و بۆ بەیانی وەڕێ کەوتم بۆ (سیتەك). لەگەڵ سیتەك بیرەوەریم زۆر بوو، پیاوەتی و جوامێریی شێخ لەتیف و "تەلاخان"ی خێزانی و "شاناز خان"ی دایکی تەلاخان هەرگیز لەبیر ناچنەوە. ئەهلی سیتەك بەگشتی چاکەیان زۆرە بەسەرمانەوە. هەر لێرە بوو کە لە بەهاری ١٩٤٨دا چاپخانەی "نیشتمان" دامەزراو ژمارە (١٠)ی ئەم گۆڤارەمان بەچاپ گەیاند.

لە سیتەك چاوم بە شێخ باباتاهیر کەوت، لەپێشەوە ناسیاویمان هەبوو، پاش نوێکردنەوەی ڕێزو ئیحتیرام سەبارەت بە جەنابی و هەموو ئەهلی سیتەك، ئەوێم بەجێهێشت و ڕێگەی (مالوومە)م گرتە بەر. ئێوارە لەوێ چاوم بە مامۆستا برایم کەوت و سەبارەت بە دامەزراندنی چاپخانە لە ئەشکەوتی (گردە ڕەش) تەوجیهاتی پێویستم لێ وەرگرت. بۆ بەیانی لەسەر ئاوەکەی مالوومە چاوم بە کۆمەڵێك پێشمەرگەی لای خۆمان کەوت، کە لای مەکتەبی سیاسی گیرسابوونەوە. پاش دوو ڕۆژ مالوومەم بەجێهێشت، بۆ لای ماوەت و عیساوێ و گردە ڕەش وەڕێکەوتم. کاك حیلمی لە دێی (خەزێنە) بوو، لەسەر ئاوەکە چاوەدێریی ئامادەکردنی (کەڵەك)و سیمڕاکێشان بوو بۆ ئەمبەرو ئەوبەری ئاوەکە، تا پێشمەرگەو خەڵکی ناوچەکە بەئاسانی بتوانن بپەڕنەوە. باسی ئەشکەوتەکەی (گردە ڕەش)ی کرد کە خەریکی خاوێنکردنەوەو جێ وڕێ سازکردن و دروستکردنی چەند هۆدەیەکن بۆ ئێستگەی ڕادیۆو چاپخانەو بێسیم و ئەو جۆرە شتانە. ئەم ئەشکەوتە لە ناوقەدی شاخی گردە ڕەش هەڵکەوتووە. پاش دروستکردنی ئەم چەند هۆدەیەش، دیسان نزیکەی ١٨٠ مەترێك ماوە مابۆوە.

سەیر ئەوەیە ئەم ئەشکەوتە ئەوەندە مشکی زۆرە کە شەرم لە ئینسان ناکەن و لە پشیلەش ناترسن. بۆ ئەووەڵ جار کە سەرکەوتم زۆر شەکەت و هیلاك بووم، دوایی کەم کەم بە سەرکەوتن و داکەوتن ڕاهاتم و بەلامەوە شتێکی ئاسایی بوو. لەوێ دوو ئەندزیاری بیانی خەریکی دامەزراندنی ئیستگەی گەلی کوردستان بوون، منیش لە هۆدەیەك چاپخانەکەم دامەزراند. لەلایەکی ترەوە (م. س) مەکینەیەکی کاغەزبڕین و هەروەها مەکینەیەکی بچووکی ئامادە کردبوو. لەو ئەشکەوتەدا برادەرێکی فەیلی بەناوی "مەهدی جەمشید" کە لە بەغداوە لەگەڵ خۆم هاتبوو، هاوکاریی دەکردم[12]. ئیستگە وەکار کەوت، بەڵام بەداخەوە دەنگی باش نەدەڕۆیشت، حەبیب محەمەد کەریم سەرپەرشتیی دەکرد. کاك "عەبدولخالق مەعرووف" ئەندازیار و"عوسمان عوزێری "و "جەلال ئەترووشی" بێژەری ئیستگە بوون.

---

[12] لە دیدارێکی دۆستانەدا لەگەڵ مامۆستا عەبدوڵڵا زەنگەنە سەرنووسەری گۆڤاری "ڕۆژنامەنووس" کە مامۆستا سدیق سالح تێدا بەشدار بوو، مامۆستا زەنگەنە سەبارەت بە ڕۆژنامەی "خەبات" پرسیاری لێ کردم:((دوای ئەوەی چاپخانەی سەلاحەدین لەلایەن حکوومەتی ئەوکاتەی عیراق دەستی بەسەردا گیرا، چاپ و بڵاوکردنەوەی "خەبات" گوێزرایەوە بۆ شاری سلێمانی و لەوێشەوە بۆ ناو شۆڕشی ئەیلوول، ئیستا پرسیار ئەوەیە ئایا ئێوە لەوکاتەدا سوودتان لەو ئامێرە چاپییە وەرگرت کە کاك مستەفا ڕابەرو کاك ئەحمەد دەشتی لە هەولێر دەستیان کەوتبوو؟ چونکە وێدەچێ ئەو ئامێرە بۆ لای ئێوە گوێزرابێتەوە! بەڵێ، ئەم مەسەلەیە بەدرێژی لە کتێبەکەی بەڕێز "مەسعوود بارزانی"دا ڕوون کراوەتەوەو باسی دەکا لەکوێ و لە چ جێگەیەك دەستیان کەوتووەو لەپێشدا ویستوویانە بیفرۆشن، بەڵام نەفرۆشراوەو وا دیارە دوایی بە باری ئێستر بردوویانە بۆ شاخ)).

کاتێ ئەوەم گوێ لێ بوو، وتەکەی مامۆستا "عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ"م بیر کەوتەوە کە کاتی خۆی بەهاری ١٩٤٨ لە دێی (سیتەك)ی شاربازێڕی کوردستان لەگەڵ مامۆستا زەبیحی خەریکی (چاپی ژمارە ١٠)ی "نیشتمان" بووین و بۆ ئەووەڵ جار لە تەئریخی ڕۆژنامەگەریی کوردستاندا ئامێرێکی چاپ لەلایەن محەمەدی شاپەسندییەوە لە شاری سلێمانی و لە کارگەی شێخ حسێنی ئاسنگەر دروست کراوەو زۆر کەسیش ئاگادارە، د. عیزەدین نەبێ کە فەرموویەتی (ژمارە ١٠)ی نیشتمان بە ئامێرێکی کۆنی پارتی! کە لای شێخ لەتیفی حەفید بووە چاپ کراوە!! ئیتر ئاگای لەوە نییە کە ئەم ئامێرەی لای شێخ لەتیف بووە ئامێری چاپ نەبوە، بەڵکە ئالەتێکی (تابیعە) بووەو تابیعەش بۆ (چاپی کتێب!) دەس نادا.

ئەوکاتەی دوکتۆر باسی دەکا، پارتی تەنیا دوو ئامێری تابیعەیان هەبوە، یەکێ ئەوەیە کە لای شێخ لەتیفەو بۆ ئەم ئیشانە نابێ، ئەوی تریان لە بەغدا بووەو ماوەیەك پێش "کاکی کاکان" بۆ جێگەیەکی تری گواستۆتەوە کە پێویست بووە. جگە لەمە، کاك مستەفا ڕابەرو کاك ئەحمەد دەشتی کاتێ گەیشتنە لای ئێمە سەڵت بوون و ئامێری چاپ و ئەو جۆرە شتانەیان لەگەڵ خۆیان نەهێنابوو. لای ئێمە کەس ئاگاداری ئەوە نەبوە کە ئەم برادەرانە ئامێری ئەوتۆیان دەس کەوتبێ! لەبەر ئەوە پێمان خۆشە مامۆستا عەبدوڵڵا ئەم مەسەلەمان بۆ ڕوون بکاتەوە. کاتێ ئەم برادەرانە هاتن بۆ ئەوناوە بارودۆخی سیاسی باش نەبوو. چاپخانەی خەبات کارێکی ئەوتۆی نەبوو، یا لە (گردە ڕەش) بە بێکاری ڕاماندەبوارد، یا لە مەکتەبی سیاسی لە (گولان- پشت ماوەت) چاوەڕوانی (تەوجیە) دەبووین.

نوخشەی کاری چاپخانەکەم پسوولەی یارمەتی بوو. حدکا، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، سێ برادەری ناردبوو بۆ لای (م. س) داوایان کردبوو، ئەوانیش ناردبوویانن بۆ لای من بۆیان چاپ بکەم. منیش بایی سەد هەزار تمەن بە ڕەنگی (ئەسکناسی)م بۆ چاپ کردن. دوای ئەمە (م. س) لە مالوومە گوێزرایەوە بۆ (گردە ڕەش)، ئەوجار چاپخانەکە ڕاستەوخۆ لەژێر چاوەدێری مامۆستا "برایم"دا بوو. دەستم کرد بە حرووفچینیی "خەبات"، لە ماوەیەکی چەند ڕۆژیدا کۆتایی هاتو ئامادەی بڵاوکردنەوە بوو. لەم ژمارەیەو ژمارەکانی دواییشدا هەر جارەی سی‌چل ژمارە عینوانی بابەتەکان‌و مانشێتەکانم بە ڕەنگی سوور چاپ دەکرد، بۆ ئەوەی توانای دەزگای چاپەمەنیمان لای حکوومەت دەنگ بداتەوە. لە گردە ڕەش، وەك لەبیرم مابێ ساڵی ١٩٦٣ یەك یا دوو جار مامۆستا کەمال فوئاد بۆ عەکس‌بەرداری لە ئیستگەی دەنگی گەلی کوردستان‌و چاپخانەی "خەبات"، سەری لەم ئەشکەوتەو تەشکیلاتی ناوەوە داوە. ئەگەرچی وێدەچێ ئەم فلیمانە لە دەرەوەی وڵات بڵاو کرابنەوە، بەداخەوە لە کوردستان، تەنانەت ئەگەر بۆ پیشاندانی نموونەی چالاکیەکانی ڕاگەیاندن لە شۆڕشی ئەوکاتی گەلەکەمانداو دەوری "خەبات" لەم چالاکیانەشدا بێ، ئەوا بۆ چل ساڵ دەچێ ماوە بەو فلیمە یا ڕەسمە بەستەزمانانە نەدراوە چاویان بە ڕووناکی بکەوێ، ئێستاش لە قووڵایی ئارشیڤەوە هەر چاوەڕوانی لوتفی دکتۆر کەمال فوئادن[١٣].

مەکتەبی سیاسی پێش زستانە سەختەکەی ١٩٦٣، داگەڕا بۆ (عیساوێ)و ماوەیەك لەوێ مایەوە. دوایی هەڵگەڕا بۆ (گوڵان)ی پشت ماوەت، تا دوای کۆنفراسی ماوەت‌و هەروەها تا تەمووزی ١٩٦٤ هەر لەوێ بوو. باردۆخێکی ئاڵۆز بوو، چاپخانە

[13] لە ژمارە ٢١ی١٠/٢/١٩٩٩ی گۆڤاری "خاك"دا، هونەرمەند "هۆمەر دزەیی" باسی ئیستگەی دەنگی گەلی کوردستان دەکاو دەڵێ: ((ئەم ئیستگەیە ئەووەڵی لە سەرووی شاخەکە بوو، بەڵام لە ترسی بۆمبارانی فڕۆکەکانی عیراق‌و ڕەوە بەرازەکانی گردە ڕەش گواستیانەوە ناو ئەشکەوتەکە)). بەڵام ڕاستیەکەی بە پێچەوانەوەی ئەمە بوو؛ لەپێشدا لەناو ئەشکەوتەکە دامەزرابوو، بەڵام دەنگی باش نەبوو، دوایی بڕیار درا بگوێزرێتەوە بۆ لوتکەی شاخەکە، بێ ئەوەی گوێ بدرێتە بۆمباران‌و ڕەوە بەرازەکان! کاك هۆمەر تا لەوێ بوو، شەوانە دەهاتە هۆدەی چاپخانە، تا درەنگەوەخت دەماینەوە. بەشی زۆی شەوەکەمان بە خواردنەوەی قاوەو زەمزەمەی تەڕانەی فارسی دەبردە سەر.

[جێی وتنە، بەڕێز دکتۆر کەمال فوئاد دوای بڵاوبوونەوەی وتاری (ڕۆڵی ڕۆژنامەی "خەبات"ی نهێنی لە شۆڕشی ئەیلوولدا)ی مامۆستا شاپەسندی لە ژمارە ٢ی هاوینی ٢٠٠٢ی گۆڤاری "ڕۆژنامەنووسان"دا، وێنەیەکی ئەو ڕۆژگارەی بۆ شاپەسندی ناردو هەمان وێنەی بە نامەیەکەوە لە ژمارە ٣ی زستانی ٢٠٠٢ی ئەو گۆڤارەدا بڵاو کرایەوە- سدیق ]

وەستابوو، (م. س) زۆریان لەوێ نەمابوون. خۆشم لە (گولان) چاوەڕێی تەوجیهات بووم، تا شەوێکیان لە نیوەشەودا "جەبار حوسێن" پێی ڕاگەیاندم کە پێویستە بگەڕێمەوە بۆ گردە ڕەش‌و چاپخانەکەم بار بکەم. بەو نیوە شەوە هەرچۆنێك بوو چەند ولاخێکم پەیدا کردو گەڕامەوە بۆ بارکردنی چاپخانەو خەریکی کۆکردنەوە بووم. بۆ بەرەبەیانی چاپخانەکەم تەسلیمی مامۆستا جەبار کرد. دوای ئەمە پێیان ڕاگەیاندین گولان بەجێدێڵین‌و دەپەڕینەوە ئەوبەری ئاوەکە. چێشتەنگاو بوو گەیشتمە سەر ئاوەکەی دەشتی خانێ، مام جەلال لەوێ بوو، چاوەدێریی پەڕینەوەی پێشمەرگەی دەکرد. من لەگەڵ خوالێخۆشبوو ڕەئیس حەمەدەمین بە بەلەمێکی پلاستیك پەڕینەوە، لەوبەر لە دێیەکی چەند ماڵیی (بەردان) ناو کۆبووینەوە. پێشنیوەڕۆ هێندێك تەق‌وتۆق پەیدا بوو، بەڵام ماوەی کەم بوو و زیانی نەبوو. هەر لەو دێیە تووشی "مەلا ئەبووبەکری فەلسەفی" بووم، گوتی بە ئەمری مام جەلال چاپخانەکە لای منە، تا بزانین بارودۆخ چیی لێ دێ؟

هەر ئەوشەوە بە (گەناوێ)دا ڕۆیشتین بۆ (بێتووش). لەوێ جارجار کاك حیلمی عەلی شەریف لەگەڵ خۆی دەیبردم بۆ تەرجومە بۆ لای ئەفسەرەکان، بەڵام ئەوانیش باوەڕیان پێنەدەکردم کە عیراقیم! لە بێتووش‌و لەناو باخەکانی لەگەڵ چەند برادەرێکی (بەرخانەقایی): عوسە ڕەشی خەیات، حەمەی فەقێ سەعیدو حەمەی مام ڕەحمان بیرەوەریی سەیرو خۆشمان هەبوو. بێکار بووین، زۆربەی کاتمان بە خواردنی فەریکەگوێزو وردە بابەتی تر ڕادەبوراد. بیست ڕۆژێك دەبوو لەوێ بووین. ڕۆژێك مام جەلال بە شوێنیدا ناردم، گوتی پێویستە بگەڕێیتەوە بۆ بەغدا، مامۆستا عولەما تەنیایە، پێویستە چالاکیەکان دەست پێبکەینەوە. بە ڕێکەوت برادەرەکانیشم دەبوو بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی. ئێوارە بوو وەڕێ کەوتین. شەو لە (بوارێ) بووین، بۆ بەیانی بەرەو چوارتاو سیتەك‌و هەڕووتە وەڕێکەوتین. نزیك چوارتا چەند سەعاتێك حەساینەوە، تا شەو لە سیتەك‌و هەڕووتە نزیك بینەوە. بۆ بەرەبەیانی لە سلێمانی بووین. بە گەیشتنی ماڵەوە، بە پەرێشانییەوە خەبەریان دامێ کە "یەدوڵڵای فەیلی" بە هەڕەشەوە داوام دەکات، زانیم مەسەلە چییە. تەنیا شەوێك لە سلێمانی مامەوە، ڕۆژی دوایی بۆ ئێوارە لای زەبیحی بووم.

لە بەغدا زەبیحی لەگەڵ مامۆستایان "عەلی عەبدوڵڵا"و "نووری شاوەیس" ڕابەرایەتێکی نوێیان دامەزراندبوو، نەیانهێشتبوو بۆشاییێکی زۆر بکەوێتە ڕێکخستنەوە. پاش چەند ڕۆژێك جارێکی تر ماڵ‌و منداڵم گەڕانەوە بۆ بەغداو لە (زەعفەرانییە) نیشتەجێ بووین. کەم کەم زۆربەی نهێنیەکانی حیزب لە ئەوراق‌و

ئەرشیڤ و بەڵگەنامەکان، تەنانەت شفرەی حیزب، لە ماڵی ئێمە کۆبۆوە. بڕیاریش وابوو گۆڤارێکی دەوری بەناوی "باهۆز" بە ڕۆنیۆ چاپ و بڵاو بکرێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە ئالەتێکی ڕۆنیۆمان گواستەوە بۆ ماڵی خۆمان، بەڵام تابیعەمان نەبوو، عوسمان عوزەیری ستێنسڵەکانی ئامادە کرد. ئەوسا ئەو لە ئیدارەی کەمالییە لای"عەلی کەمال" کارمەند بوو. پاش نوێژان بە نهێنی بابەتەکانی دەخستە سەر ستێنسڵ و دوایی خۆم دەمبردەوەو دەمخستە سەر ڕۆنیۆو چاپم دەکرد. بەمجۆرە ژمارەیەك "باهۆز" چاپ کراو بڵاو کرایەوە.

ڕۆژانە بەیانیان دەبوو لە ماڵی زەبیحی بم، تا بەرنامەی ڕۆژم پێ بڵێ. پاش نوێژان ئیش وکاری نووسین و شتی تر زۆرترین کاتی لێ دەگرتم. سەرباری ئەوە، زەبیحی داوای لێ کردم نموونەی مەکینەیەکی چاپی ڕۆژنامەی بۆ دروست بکەم، دووسێ ڕۆژ خەریك بووم تا توانیم لە تەختەو قوتوولەو ئەسبابی یاریێ منداڵان نموونەیەکی ٤٠ × ٩٠ سانتیمی دروست بکەم. دەکرا هەم بە دەست ئیشی پێ بکرێ، هەم بە کارەبا. بەڵام من خۆم دڵنیا بووم کە ئەمە زۆر گەورەو قەبەیەو ژوورێکی دوازدە میتریی دەوێ و بێگومان تەقەوڕەقەشی زۆر دەبێ و بۆ کاری نهێنی نابێ.

زەبیحی ئەگەرچی زۆری پێ باش بوو، بەڵام دوایی باوەڕی کرد بۆ ئیشەکەی ئێمە دەست نادات. پێم وت کەواتە با شتێکی وەك مەکینەکەی کە بۆ سلێمانی و گردە ڕەش دروستمان کرد، ساز بکەین. ئیتر لەو ڕۆژەوە وەخۆ کەوتم و مەکینەیەکی باش و حرووف و گشت کەرەسەی کە بۆ چاپخانەیەك پێویستە، ئامادەم کردو گواستمەوە بۆ ماڵی خۆمان.

دوای ئەمە مامۆستا برایم ئەحمەدیش گەڕایەوە بۆ بەغدا، هەر بە گەڕانەوەی، پێی ڕاگەیاندین کە نیازی وایە دەست بە چاپی "خەبات" بکاتەوەو پێویستە چاپخانەکەش لەپەنا دەستی خۆی بێ. بۆیە ناچار بووم مەکینەکەی ماڵی خۆمان گواستەوە بۆ ماڵی "سەلمەخان" لەپەنا ماڵی مامۆستا. ئەوکاتە بەعس لەسەر کار بوو، هەووەڵ ژمارەی "خەبات" کە لەو ماڵەدا چاپ کرا سەردێڕی سەروتارەکە، وەك پاش سی و چەند ساڵ لەبیرم مابێ، ئاوابوو: ((ئەی میللەتانی عیراق! یەکگرن بەر لەوەی بەعسیەکان کۆمەڵ کۆمەڵ ڕەوانەی زیندانەکانمان بکەن؟!))

لام وایە جگە لەم ژمارەیە، ژمارەیەکی تریشمان چاپ کرد. پاش ئەمە بە ئەمری حیزب جارێکی تر چاپخانەکەم گێڕایەوە بۆ ماڵی خۆمان، بەم جۆرە دوای

بڵاوەپێکردنی تەشکیلاتی (م. س)، لەگەڵ زەبیحی کاری ترمان بەدەستەوە بوو و چالاکیی چاپخانە کۆتایی هات، بەڵام چاپخانەکە لە ماڵی ئێمە مایەوە. ساڵی ١٩٨٠ کە گیروگرفتی جنسیەم هەبوو، ناچار بووم بەغدا بەجێبێڵم و بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی. بەم جۆرە (١٧) ساڵ لێپرسراوی چاپخانەکانی خەبات بوومو ئەم چاپخانەیە (١٥) پازدە ساڵ لە ماڵی ئێمەدا بوو. لە کۆتاییدا بەناچاری وەك یەکێك عەزیزێکی خۆی تەسلیم بە خاك بکات، چاپخانەکەم خستە ژێر گڵەوەو گەڕاینەوە بۆ سلێمانی.

## هەڵەبڕێکی ڕۆژنامەی "خەبات"
## لە بەغدا کچە جوولەکەیەك هەڵدەگرێ

لە کۆتاییەکانی ١٩٦٠دا زۆر نەبوو لە چاپخانەی سەلاحەدین، لە بارەگای لقی (٥)ی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ڕۆژنامەی ڕۆژانەی "خەبات" دەستم بە ئیش کردبوو. بەڕێوەبەرانی چاپخانەکە بریتی بوون لە کاك حیلمی عەلی شەریف (ڕەحمەتی)ی بەڕێوەبەری چاپخانە، برادەرێکی عەرەب بەرپرسی ئامێری ئەنتەر تایپ، کاك "سەفەر"ی فەیلی بەرپرسی مەکینەی چاپ، یاریدەدەرەکەی "مەهدی جەمشید"، کاکەحەمەی حەمەسەعیدی قەساب هەڵەبڕی بابەتەکانو خۆم وەك جێبەجێکەرو دەرهێنەری ڕۆژنامەکە، کە لە ئێوارە تا بەیانی ڕۆژی دوایی چاپخانەکەم بەجێنەدەهێشت.

کاکەحەمەی هەڵەبڕ کە ئێواران کاری نەدەما، لە بەردەرگای چاپخانەکە کە دەکەوتە سەر کۆڵانێکی تر دەوێستاو سەیری هاتوچۆکەرانی دەکرد. بەرانبەری چاپخانەکەمان خانوویەکی دوو نهووم هەبوو، قاتی سەرەوە ماڵە جوولەکەیەکی تێدا بوو. کیژێکی عازەبیان هەبوو، تەمەنی لە دەوری ١٨-١٩ ساڵیدا بوو. ئەو بەستەزمانە ئێواران تا دەرەنگێك لەبەر پەنجەری ماڵەکەیان ڕادەوەستاو سەیری خوارەوەی دەکرد. پاش ماوەیەك بۆم دەرکەوت کاکە حەمەی هەڵەبڕو کیژەکە لەسەرەوە بە زمانێك خەریکی ڕازو نیازن کە نە زمانی جوولەکانو نە زمانی کوردییە، بەڵکە بە زمانی ئیشارە، وەك دە ساڵە هاوڕازی یەکتر بن!

چەند ڕۆژێك هەموو ئێواران ئەو بەزمە نوێ دەکرایەوەو ڕۆژانە کاکەحەمە لە خۆشی و شادیدا بوو، تەنانەت کاتێك سەرقاڵی کاریش دەبوو، بزە لەسەر لێوی دوور نەدەکەوتەوە. دوای ئەمە ئێستا هەفتەیەك تێوەرسوڕابۆوە، بەیانێك کە گەیشتمە

چاپخانەکە، سەیر دەکەم لە هەموولایەك هەر سرتەسرتو ورتەورتە. لە دووکاندارێکی ئەوناوەم پرسی: ئەرێ چی باسە، چی ڕووی داوە؟! گوتی نازانی کیژی ئەو ماڵە جوولەکەیە دیار نییە. کەسوکاری وەشوێنی کەوتوون، تا بزانن چیی بەسەر هاتووە. نزیك نیوەڕۆ کاك حیلمی پەیدا بۆوە. وامانزانی ئاگای لە هیچ نییە. گوتی: هیچم بۆ مەگێڕنەوە، من خۆم لەبەیانییەوە بەشوێن ئەو مەسەلەیەوەم، جێبەجێ بوو. دوای ئەوەی کیژەکە لەسەر دەستی قازی شادیمانی هێناو موسڵمان بوو، بە ئاسانی لە کاکەحەمە مارە کراو کێشەکە بڕایەوە. هەر ئەو ڕۆژە کاکەحەمە گواستیەوە بۆ سلێمانی!

پاش ماوەیەك بۆ سەردان لە سلێمانی بووم، بە ڕێکەوت دەبینم کاکەحەمە لەبەر خانەقای مەولانا، نزیك ماڵی ئێمە، خانووی گرتووەو خێزانەکەشی ناوێکی کوردیی لە خۆی ناوەو بە ڕێکوپێکی لە باوەشی بەختیاریدا ژیان ڕادەبوێرنو هەمووکاتیان فەسڵی هەنگوینە!

## هاوبەشی لە سەرەخۆشیی هاوسێیەکدا
## بە دوو هەزار دینار لەسەر مامۆستا زەبیحی تەواو دەبێ

ساڵی (١٩٦٤) کە لە (بێتووش) گەڕامەوە بۆ بەغدا بۆ لای مامۆستا عولەما، ئەوسا ماڵەکەی لە جادەی ئەووەڵی (مەشتەل) لە عیمارەتێکدا بوو، بریتی بوو لە دوو شەقە: یەکیان مامۆستا، ئەوی تریان هاوولاتێکی خەڵکی (ناصریە)ی تێدا بوو، کە لەژێر شەقەکەی خۆی ئارایشتگای ژنانەی هەبوو. ماڵەکەیان بریتی بوو لە کابرای عەرەبو خێزانی. ماڵێکی باشو بێدەنگ بوون. پاش ماوەیەك کابرای عەرەب بە دەردێکی کتوپڕ ئەمری خوای بەجێهێنا، خێزانەکەی هەر ئەو ڕۆژە داوای لێ کردم با مامۆستای بۆ ڕازی بکەم ئەو چەند ڕۆژی تەعزیەیە شەقەکەی خۆی بەجێبێڵێ، تەعزیەی تێدا دابنێن، چونکە هینەکەی خۆیان بەتەنیا بەش ناکات.

شایانی ئاماژەپێکردنە ئەم جۆرە شتانە لە هاوسێیەتیدا لە عەرەبستانو بگرە لەناو کوردەواریش لە شارەکاندا باوەو ماڵ بەجێهێشتن بۆ هاوسێ لەکاتی وەهادا شتێکی ئاسایییە. بۆیە بەڵێنم بە ئافرەتەکە دا کە مامۆستا هاتەوە مەسەلەکەی بۆ جێبەجێ بکەم، چونکە دەمزانی مامۆستا گیروگرفت ناخاتە بەر کاری باشو پیاوەتی.

هەر ئەو ڕۆژە شەقەی مامۆستا خرایە ژێر ئیختیاری خاوەن تەعزیە. ڕۆژانە ماوەیەکی کورت هاوبەشیمان دەکرد لە تەعزەیەکەدا. بەڵام ئیتر چەند ڕۆژێك ماڵەکە

لەبەر دەستی ئەوانەدا مایەوە تا تەعزیە تەواو بوو. پاش تەواوبوونی تەعزیەو گەڕانەوەی ماموستا زەبیحی بۆ ماڵەکەی خۆی، ڕۆژی دوایی بەیانی لەوێ بووم. دیتم ماموستا هێندێك گرژەو ناوچاوانی تێك ناوە! گوتم دیسان چیتە؟ چی قەوماوە؟!

سەید عەزیز شەمزینی پێش ئەوەی بەغدا بەجێبێڵێو بگەڕێتەوە ناو کەسوکاری خۆی (بۆفیەکی تەختە)ی باشی بۆ ماموستا ناردبوو. بەقسەی ماموستا گوایە دووهەزار دیناری دەبێو دەیخاتە ناو ئەم بۆفیەوەو دایدەخا. ڕۆژێ کە شەقەکە بەجێدێڵێ، لەبیری نابێ یا جێگای پارەکە بە باش دەزانێو نایەوێ بیگوێزێتەوە. دوایە گوتی: تۆ نەدەبوو قەولی پێ بدەی! پێم گوت کاکە من شتێکی خراپم بە تۆ نیشان نەداوە. ئەمە لە هەموو عیراقدا بە کوردستانیشەوە باوە. کاتی وەها مرۆڤ چۆن دەتوانێ خۆی بگرێو هاوبەشی نەکات؟ گوتم بۆ شتێك قەوماوە؟ گوتی دووهەزار دینار پارەم لە بۆفیەکەدا شاردبۆوە، نەماوە. وا دیارە قفڵەکەیان کردۆتەوەو بردوویانە. کاتێ کەوتمە پرسیارو لێکۆڵینەوە، بۆم دەرکەوت ئەم چەند شەوە (٥-٦) کەس لە گەنجانی گەڕەگ لەوێ خەوتوونو ئەمە بێگومان کاری ئەوانەیە. سێ کەسیان سەر بە ئەمنی گەڕەك بوون، ئەوانی تریش بێسێودوو لە ئەمنەکان باشتر نین. ئێستاش لە بەرژەوەندی ماموستادا نابینم مەسەلەکە گەورە بکەین. ناچار بێدەنگەمان لێ کرد! ئەگەرچی زۆر بە گران لەسەرمان تەواو بوو.

## گۆڤاری "باهۆز"

زۆر نەبوو لە (بێتووش) گەڕابوومەوە بۆ ئەوەی لە بەغدا هاوکاریی ماموستا عولەما بکەم. ئێستا فریای ئەوە نەکەوتبووم ئامێری چاپ سازبکەم، تەنیا ئامێرێکی (ڕۆنیۆ)م دەس کەوتبوو، دەبوو گۆڤاری "باهۆز"ی پێ چاپ بکەم. لە بەغدا ماڵەکەمان لە (زەعفەرانییە) بوو، هاتوچۆمان بەسەر (معەسکەر ڕەشید)دا بوو، زۆر کات مەترسیی تەفتیشو ئەو جۆرە شتانە لەئارادا بوون.

ئامێری (تابیعە)شم نەبوو، تا بتوانم بابەتەکان تایپ بکەمو بیخەمە سەر (ستێنسڵ)، دوایی بە (ڕۆنیۆ) چاپی بکەم. باش بوو بۆ تایپکردنی بابەتەکان شەهید "عوسمان عوزەیری" فریام کەوت، ئەوکاتە لای کاك "عەلی کەمال بەگ"ی خاوەنی زەویەکانی (کەمالییە)ی بەغدا ئیشی دەکرد، بەڵێنی دامێ لەکاتی چۆڵیو دەرفەتدا بابەتەکانم بۆ بخاتە سەر (ستێنسڵ)و دەستی کەم ڕۆژانە یەکدوو بابەت تایپ بکات.

بەم جۆرە بە چەند ڕۆژێك گشت بابەتەكانی تایپ كردو توانیمان گۆڤاری "باهۆز" چاپ بكەین‌و بینێرین بۆ بڵاوكردنەوە. هێندێك لەو چاپكراوانە دەبوو بیگەیەنین بە ماڵی كاك "عەلیی مام ڕەزا" لە مەشتەل، یا خوالێخۆشبوو مامۆستا عومەر مستەفا بە ماشێنەكەی خۆی دەیگواستەوە.

كاك عوسمان عوزەیری نموونەی گەنجێكی شۆڕشگێڕی كورد بوو، ماندووبوونی نەدەزانی، شاعیرێكی قسەخۆش‌و ڕووخۆش‌و بەتوانا بوو، كاتێ ڕادیۆی (دەنگی شۆڕشی ئەیلوول) لە (گردە ڕەش) ڕووبەڕووی (عیساوێ) دامەزرا، كاك عوسمان یەكێك بوو لە بێژەرەكانی دەنگی شۆڕش‌و ماڵەكەشی هەر لەو نزیكانە لە دێی (هەڵگورد) بوو.

### قادر شەریف "هاشم أقل الطلاب"

ناوی ئەسڵی "هاشم أقل الطلاب" بوو، كاتی كۆمار (١٩٤٦) لە مەهاباد دووربەدوور دەمناسی. لە كوردستانی عیراق، بۆ ئەووەڵ جار لەسەر ئاوەكەی (مالوومە)، لەگەڵ كۆمەڵێكی گەورەی كوردی كوردستانی ئێران میوانی مەكتەبی سیاسیی پارتی بوون. پیاوێكی چاوكزو دەم‌وچاو ئاوڵاوی، بەڵام قسەخۆش بوو، لە نووسیندا زۆر چالاك نەبوو.

ساڵی (١٩٦٢)ی زاینی بوو، من تازە بۆ دامەزراندنی چاپخانەیەك بۆ ڕۆژنامەی "خەبات" هاتبووم بۆ ناو (شۆڕش). پاش یەكدوو ڕۆژ بەجێم هێشتن، چووم بۆ (عیساوێ)و (خەزێنە) لەو لای (ژاژڵە). پاش ماوەیەك جارێكی تر بینیمەوە. گوتی لەگەڵ جەماعەتەكەی ڕۆیشتووە بۆ دێی (شەشان) چەند كیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی (ئاوكورتێ)، بەڵێنم پێ دا ڕۆژێك سەریان لێ بدەم. ئەوكاتە من لەگەڵ خوالێخۆشبوو كاك حیلمی عەلی شەریف چاوەڕێی ئەوە بووین كاری ناو (ئەشكەوتی گردە ڕەش) تەواوبێ، تا بتوانم (چاپخانەی خەبات) كە خۆم سازم كردبوو، وەگەڕ بخەم. هاوكات مەكتەبی سیاسی نزیك دێی (عیساوێ) بوو. كاك حیلمی‌و من‌و چەند پێشمەرگەیەك شەوانە لە دێی (خەزێنە) لەسەر ئاوەكە دەخەوتین. ڕۆژێكی هەینی تاك‌و تەنیا ملی ڕێگای (شەشان)م گرت‌و ڕۆیشتم بۆ لای كاك قادرو جەماعەتەكەی، كە نزیك بیست تا بیست‌وپێنج كەس دەبوون. یەكدوو ڕۆژ لەناویاندا مامەوە، سەبارەت بە جەماعەتەكانی تر، ئەوانە ڕێكوپێكتر بوون.

دوای گەڕانەوەم، تا ساڵی ١٩٦٨-١٩٦٩ کاك هاشمم نەدیتەوە. ساڵی ١٩٦٩ لە (بەکرەجۆ) خەریکی جێبەجێ‌و دابینکردنی جێ‌وڕێ بۆ عەلی ئاغای گەڵباغی‌و جەماعەتەکەیان بووم، بە ڕێکەوت زانیم لە بەکرەجۆ لەگەڵ جەماعەتەکەی "کاوە مارەغەنی"و ئەوانی تر جێگەیان بۆ کاك هاشم "قادر شەریف"یش دەستەبەر کردووە. ئەوشەوە لای کاك قادرو جەماعەتەکەی مامەوە، بۆ بەیانی سەفەرێکی بەغدام لەبەر بوو، ڕۆیشتم‌و هاتمەوە. بیستم کاك قادرو برادەرەکانی لە بەکرەجۆ نەماون، گوایە لەگەڵ کاوە مارەغەنی تێك دەگیرێن‌و مام جەلال لایەنی کاوەی پێ ڕاستتر دەبێ‌و لە کاك قادر شەریف تووڕە دەبێ‌و دەریدەکات. هەر لە بەکرەجۆ مەسەلەکەم بە جیهاز بۆ زەبیحی ڕوون کردەوە. زەبیحی گوتی بزانە کەموکوڕیی چییان هەیە؟ وەرە قسەی لێ دەکەین. من هەوڵی ئەوەم بوو با مامۆستا عولەما باسی یارمەتیدانی بکاتەوە، بەڵام با حیسابی لایەنێکی سەربەخۆی ئۆپۆزسیونی ئێرانی بۆ بکرێ.

کاتی گەڕانەوەم بۆ سلێمانی، لەگەڵ خۆم نزیکەی (٢٠) بیست تفەنگی سەلیبی‌و فیشەك‌و ڕومانەو پێداویستی تر، لەگەڵ پارەی یارمەتی بۆ پێشمەرگەکانی بۆم هێنا. برادەرەکانی، بە خۆیەوە دەوری (٢٠-٢٤) کەس بوون، لەوانە هێندێك ناوم لەبیر ماوە: مام ئەحمەد، مەلا عەبدولخالق، عەبدوڵلا لاوە، میرزا سەرخانی، دوکتۆر کەریم، کاك ساڵەح بلەسەنی، مەلا قادر وردی بانەیی، بەداخەوە لەو ٣٥ ساڵەی ڕابردوودا ناوی ئەوانی ترم لەبیر چۆتەوە! هەموو مانگێ هەرچی لازم بایە بۆم دەبرد. جارێك داوای چواردەخۆرێکی لێ کردم بۆ یەکێك لە برادەرەکان لە سەردەشت. ئەگەرچی دەمانچە کەم بوو، بە هەموو کەس نەدەدرا، بەڵام بۆ ئەوەی پێویستی بە جێگای تر نەبێ بۆم پەیداکرد.

کاك قادر لە کۆڵانەکانی ڕووبەڕووی خانەقای مەولانا ئافرەتێکی مارە کردبوو، چەند (حازر ئوغلانی وردو درشتی) هەبوو، لەوانە کوڕێکیان بەناوی "ساڵەح" لای خۆی پێشمەرگە بوو. دوای شەهید بوونی، قادر خۆیشی لەو بێوەژنە منداڵی وردی هەیە! خێزانەکەی لە کارگەی جگەرە کاری دەکرد.

ژانراڵ بەختیار کۆمەڵێك نامەی ئامادە کردبوو کە لە کوردستانی ئێران بۆ سەرەك عەشیرەتەکان‌و کەسایەتیە دەسەڵاتدارەکانی سەر بە ڕەژیم بنێردرێ. لەو نامانەدا بەرنامەی کاری خۆی ڕوون کردبۆوەو داوای لێ کردبوون خۆیان ئامادە

بکەن بۆ هاوکاری! باش بوو بە یارمەتیی کاك قادرو دووسێ ئافرەتی خۆمانەو دڵسۆز نامەکان گشتیان بەڕێ کران‌و "میرزا برایمی سەرخانی"یش بۆ گەیاندنیان دەوری باشی گێڕا. ئەو نامانە زۆریان وەڵامیان دەهاتەوە، بەڵام ناوەڕۆکی وەڵامەکان وەك یەك وابوو. دیار بوو ڕەژیم ئاگاداری مەسەلەکەیە!

قالە تەگەرانی‌و قادر شەریف بە ڕواڵەت دۆست‌و ناسیاوی یەکتر بوون، بەڵام یەکتریان خۆش نەدەویست. قادر شەریف‌و ساڵەح بڵەسەنی‌و ئەوانەی ئاگاداری مەسەلەکە بوون، گرتن‌و تووشبوونی فایەق، سلێمانی موعینی، لە "قالە تەگەرانی"یەوە دەزانن. قاوە، دەڵێن "فایەق" شەو لە ماڵی قالە تەگەرانی میوان بووەو بۆ بەیانی بە ساکێکەوە لەوێ دەرکەوتووەو لەودیوی ئەزمڕ لەلایەن "سدیق ئەفەندی"یەوە گیراوەو بەڕێ کراوە بۆ لای مەلا مستەفا بارزانی. من کاتی خۆی مەسەلەی تووشبوونی فایەق، لەوکاتەوە کە چۆتە ماڵی قالە تەگەرانی‌و بۆ بەیانی کە بە ساکێکەوە دەردەکەوێ‌و لەودیوی ئەزمڕ "سدیق ئەفەندی" دەیگرێ‌و بەڕێی دەکا بۆ مەلا مستەفا، دوورودرێژی لە زمانی "ساڵەح بڵەسەنی"وە نووسیبوومەوە.

شەهید قادر شەریف، پێش شەهیدبوونی، لە زۆر کەس بەگومان بوو، تەنانەت هێندێکیان حیزبی‌و قەڵادزەیی‌و هێندێکیان شیوعی بوون‌و لیستی ناوەکانی لای من دانابوو. بە ڕێکەوت ڕۆژی (٥/١١/١٩٦٩) پێش سەعات ١٢ی نیوەڕۆ بەیەکەوە بووین، بەرەو ماڵ دەڕۆیشتینەوە. بەقسە تا (مزگەوتی دوودەرگا)ی هەلاجەکان ڕۆیشتین، لەبەر دەرگاکەی ناو حەوشی مزگەوتەکە نزیکەی (١٥-٢٠) دەقیقە وێستابووین قسەمان دەکرد، دوایی بەجێـمهێشت. دیار بوو دەیویست دەست بە ئاو بگەیەنێ، چوو بۆ ناو ئاودەستەکان، منیش بەرەو ماڵ بوومەوە. بەڵام نەگەیشتبوومە بەر خانەقا، گوێم لە گرمەیەك بوو، پاش چەند دەقیقەیەك خەبەریان هێنا کە قونبولەیان لەناو ئاودەستی مزگەوتدا فڕێداوە بۆ قادر شەریف! کە گەیشتمە نەخۆشخانە، برینەکانیان دەپێچایەوە، دەرکەوت برینەکانی سارد نەبوونەوە، لێم پرسی: دەبێ کێ بێ؟ وەڵامی دامەوە: ((ئەوانە کە لیستی ناوەکانیان لای تۆیە!)). بە جووڵانەوەو قسەکردنیدا وا وێنەدەچوو برینەکانی زۆر کاریگەر بن. بەو هیوایە بەجێـمهێشت‌و خواحافیزیم لێ کرد. بەداخەوە بۆ شەو، ٥-٦/١١/١٩٦٩، ماڵ ئاوایی لە برادەرانی دەکات‌و دەگاتە کاروانی شەهیدانی کوردستان. بەیانی بە ڕێزو حورمەتێکی زۆرەوە لە گردی سەیوان تەسلیم بە خاك کرا. مام جەلال‌و کاك حەمەی حاجی تایەر لە

پرسەکەیدا ئامادە بوونو لە سەرقەبران کاکەحەمە وتارێکی بەتینی دژی بکوژانی ئەم شەهیدە نەبەزە خوێندەوە. دوو ڕۆژ لە (مزگەوتی قامیشان) پرسەکەی بەردەوام بوو. دوای ماوەیەك ئاشکرا بوو کە بکوژی قادر شەریف یەکێکی "یووسف لیچە" ناوە، بە ئەمری کەسایەتێکی تر بەم ئیشە هەڵستاوە. پێنج هەزار تمەن (حەقدەستی) ئەو خۆفرۆشییەی خۆی لەودیوی سنوور پێگەیشتووە!

مامۆستا جەلیل گادانی لە کتێبی (با نەبێتە درۆی مردوو، ل١٢٦)دا، سەبارەت بە کۆمیتەی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستان، بەم جۆرە باسی شەهید قادر شەریف دەکات: ((قادر شەریف بەکردەوە پیاوانە دەگەڵیان بووە. ئاخرین بەرپرس بووە کە دوای شەهید سلێمانو شەهید سمایل زەبرێکی کاریگەری لە ڕەژیم داوە، هەر بۆیەش تیرۆر کرا)). ئەگەرچی کاك قادر شەریف کادرێکی ئازاو شۆڕشگێڕو نەبەزی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوو، بەڵام بەداخەوە بکوژەکەی هەر لەسەرەتاوە ناسراوو بەدەرەوە بوو، تەنبێ نەکرا تا ببێتە دەرسێکی عیبرەت بۆ دوژمنانی کوردو کوردایەتی. لەم دواییەدا بۆم دەرکەوت کە شەهید لە خێزانەکەی (سلێمانی)ش منداڵی وردی هەیە.

## دکتۆر موراد ڕەزم ئاوەر
## وە ژانڕال مەحموودی پەناهیان

لە ساڵانی شەستی سەدەی ڕابردوودا کۆمەڵێك لە ئەفسەرەکانی توودەیی لە عیراق بوونو لەگەڵ ڕەژیمی بەعسی عیراق هاوکارییان دەکرد؛ لەناو ئەوانەدا ئەفسەری باش زۆر بوونو هەر بەم جۆرەش مانەوە؛ هەروەها ئەفسەری وەهاشیان لەناودا بوو کە لەپشت حیزبەوە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی تایبەتیان بۆ خۆیان ساز کردبوو. سەروان "مورادی ڕەزماوەر" لەو ئەفسەرە توودەییانە بوو کە دوای شکستی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانو گەڕانەوەی ئەرتەشی ئێران بۆ ئازەربایجان، ڕووی کردە ئازەربایجانی شووڕەوی، لەکاتی پەڕینەوەی مەلا مستەفاو بارزانیەکاندا لە ئاوی (ئاراس)، موراد عەزیز لە باکۆ بوو. دوایی لەکاتی شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨دا لە تشرینی ئەووەڵی ١٩٥٩دا لەلایەن سەرکردایەتیی پارتی‌یەوە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی هەڵبژێردرا[١٤].

---

[14] خاطرات نورالدین کیانوری، ل٤٤٦.

دوای ئەمە کە ژانراڵ "تەیمووری بەختیار" لە بانەمەڕی ١٣٤٨ (١٩٦٩)دا گەیشتە بەغدادو لە کۆشکی نووری سەعید جێگیر بوو، موراد عەزیز لە ناساندنی دوکتۆر ڕادمەنیش سکرتێری حیزبی توودەی ئێران و گەورە پیاوانی عیراق بە ژانراڵ تەیمووری بەختیار، دەوری گرینگی گێڕاوە، چونکە ئامانجی ئەوکاتەی حیزبی توودەو ژانراڵ بەختیار تەنیا هاوکاری بۆ لەناوبردنی شا بوو.

ڕۆژی ٨ی ئابی ١٩٧٠، لام وایە ڕۆژی هەینی بوو، لە بەغدا لە (باب الشرقي) بە ڕێکەوت تووشی کاک خالید دلێر بووم، دوای ئەحواڵپرسی، هەواڵی برینداربوونی ژانراڵ تەیمووری بەختیاری پێ ڕاگەیاندم، وتی: ئاگاداریت هەیە کە ژانراڵ بەختیار لە ڕاو لە دەوروبەری بەغدا بریندار کراوە؟! کە هەواڵەکەم بیست بە پەلە ڕۆیشتم بۆماڵی زەبیحی، هەواڵەکەم پێ ڕاگەیاند. دیار بوو ئەو پێش من ئاگاداری هەواڵەکە بوو. بۆ ئێوارەی هەمان ڕۆژ لەگەڵ خوالێخۆشبوو عومەر مستەفاو زەبیحی ڕۆیشتین بۆ (نەخۆشخانەی ڕەشید)، بەڵکە چاومان پێ بکەوێ؛ بەڵام ڕێگەیان نەداین، وتیان لە قاوشەکەی خۆی نەماوەو گوێزراوەتەوە بۆ قاوشێکی تر، دەتوانن بەیانی بێن و چاوتان پێ بکەوێ، گەڕاینەوە. بۆ شەو ئاشکرا بوو کە وەفاتی کردووەو ماوە نادەن بۆ بەشداری لە ناشتن و سەرەخۆشیدا. بۆ بەیانی ڕۆیشتین بۆ لای خێزانی، بەڵام وا دیاربوو خێزانیشی لە برینداربوون بەولاوە ئاگاداری زۆر شت نەبێ، یا وێدەچی وای پێگوترابێ لەوە زیاتر هیچ نەڵێ؟ بەڵام لە هەڵسوکەوتی دوای ڕووداوەکە وا تێگەیشتم کە خێزانی دوای برینداربوون چاوی پێنەکەوتووە. هەر ئەو ڕۆژە دەوروبەری ژانراڵ، ئەوانی لە ڕووداوەکەدا بەشدار بوون و هەروەها ئەوانەی کە لە ماڵەوە ئاگاداری مەسەلەکە هەن، گشتیان تەوقیف کران؛ تەنیا کەسێکی لە دەست و پەیوەندی مابێ نەگیرابێ، کوڕێکی ٢٥-٣٠ ساڵەی "ئەمیر" ناو لە خێڵی بەختیاری بوو، گوایە کاتی ڕووداوەکە لە ماڵێ بووە، بەشداریی تێدا نەکردووە.

ئەم ڕووداوە لە دەوروبەری شاری بەغدا، لەکاتێکدا بەختیار خەریکی ڕاو دەبێ، ڕوودەدات. لەپێشدا "ئەحمەد" ناوێکی سەر بە ئەمن، خەڵکی(سەعدییە)، تەقەی لێدەکات. دوای ئەمە، یەکی تر لەدواوە تەقە لە ئەحمەد دەکات و دەیکوژێ. پاشان یەکێك لە هاوڕێیان بە هاوکاریی ئەوانی تر ژانراڵ دەخەنە ناو سەیارەوەو بەرەو شار وەڕێ دەکەون. ئەگەرچی ئەم کابرایە لە هەمان ئێڵی ژانراڵ، واتا(بەختیاری) دەبێ، هەر لە ئەووەڵەوە بە جڵفی و بێبەندوباوی مەشهوور دەبێ، ڕێگای خەستەخانە

ئەوەندە دووورودرێژ دەکاتەوە تا برینداره‌کە خوێنی زۆری لەبەر بڕوا، کاتێك دەگاتە خەستەخانە، ئاهی تێدا نەمابێ و گیانی لەدەس دابێ.

سەیر ئەوەیە من یەکدوو ڕۆژ پێش لە هەڵەبجە بووم، لەوێ ئاگاداریان کردم کە (ساواك) لەو سنوورانە بڵاوی کردۆتەوە کە ئەم ڕۆژانە ژانراڵ بەختیار تیرۆر دەکرێ! کاتێ گەڕانەوەم بۆ بەغدا هەواڵەکەم بۆ گێڕایەوە. ئەویش بێ‌ئەوەی ئەم قسەیە کاری تێبکات، وتی: ((ئەگەر خوا نەمکوژێ، کەس ناتوانێ گیانم لێ بستێنێ))! بەم جۆرە دوای چەند ڕۆژ، ژیانی ژانراڵ تەیمووری بەختیار بە پیلانی چەند لایەنێك کە تا دوێنێ (بەقسە) لایەنگرییان لێ دەکرد، کۆتایی هات!

## ژانراڵ مەحموود پەناهیان

پەناهیان، لە سەرەتادا سەر بە سازمانی ئەفسەرانی حیزبی توودەی ئێران بووە. دوای دامەزرانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان، لەگەڵ کۆمەڵێك ئەفسەری تر بە نیازی بەهێزکردنی ئەم ڕێکخراوە نوێیە گوێزرایەوە بۆ فیرقەی دیموکرات و پلەیەکی لەشکریی زیاتر، واتا (ژانراڵ)ی پێ‌بەخشراوە. دوای تێکچوونی فیرقە، ڕووی کردە ئازەربایجانی شووڕەوی؛ لەوێوەش پاش تیرۆری ژانراڵ بەختیار، وەك موراد ڕەزم ئاوەر لەڕێگەی پەیوەندیە تایبەتەکانیەوە گوێزرایەوە بۆ عیراق. پەناهیان، بەپێچەوانەی سیاسەتی ڕابردووی توودە سەبارەت بە مەسەلەی بەختیار، دەورێکی تێکدەرانەی بۆ هەڵوەشاندنەوەی تەشکیلاتی بەختیار لە باکوورو ناوەندو باشووری عیراق پێ ئەسپێردرابوو.

ئەم کابرایە کە ئازەرییەکی دەمارگرژو دیکتاتۆرو هەمیشە تووڕە بوو، تەنانەت لەناو سۆڤیەت و حیزبی توودەشدا بەدناو بوو. لەناو ڕێبەرایەتیی حیزبی توودەدا بە باشی ناویان نەدەبرد، بە ئاشکرا باسی دەکرا، گوایە سەری بە جێگەیەکەوە بەندە! تەنانەت ئەوکاتە کە "دانیشیان" ڕابەری فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بوو، تاقمێکی گەورەی پێنجسەد کەسیی لە موهاجیرە ئازەربایجانیە ئێرانیەکانی سەر بە "پەناهیان" بە تۆمەتی ئەوە کە گوایە داوایان کردووە بیانگێڕنەوە بۆ ئێران، دوور خراونەتەوە بۆ (سیبریا)، بەڵام دوای مەرگی ستالین جارێکی تر دەیانگێڕنەوە بۆ (کازاخستان)، بەتایبەت بۆ (ئالماتا)ی پایتەختی کازاخستان[15].

---

[15] احسان طبری، کژراهه.

پەناهیان، دوای جێگیربوونی لە بەغدا، بە هاوکاریی دکتۆر مراد عەزیزو شێخ جەبار دەستی کرد بە گرتن‌و تێکدان‌و بڵاوەپێکردنی هەرچی کە بۆ بەختیار ئامادەکرابوو. تەنیا لە باکووری عیراق (هەڵەبجەو سەیدسادق‌و خانەقین) نزیکەی هەزارو دووسەد چەکداری ئامادەی هەبوو، ڕۆژانە دەستە دەستە بە بیانووی دەستوەشاندن لە ڕەژیمی شا ڕەوانەی باشووری عیراق دەکران، لەوێشەوە دەنێردران بۆ ناو ئێران. ئەوجارە لەبەر ئەوەی تەشکیلاتی ئەم چەکدارانە دوای تیرۆری بەختیار ساواکی زۆری تێ‌خزابوو، هەر بە گەیشتنیان بۆ سنووری ئێران، یا لەناکاو تووشی شەڕ دەبوون‌و دەکوژران، یان دەگیران‌و ڕەوانەی زیندانەکانی شارەکانی ئێران دەکران! ئێمە (خۆمان) کە دووسێ ساڵ بوو، بە کۆکردنەوەی ئەو خەڵکەوە ماندوو ببووین‌و بەشی زۆریان ناسیاو و برادەری کۆن بوون، بە تێداچوونیان نارەحەت دەبووین. ڕۆژێك بە ناچاری پێم وت: ((جەنابی ژانراڵ وێ‌دەچێ دوای تیرۆری بەختیار تەشکیلاتی چەکدارەکان، ئەوانەی لەم دواییانەدا دەنێردرێن، ساواکی تێ‌کەوتبێ. کەواتە بۆ دەیاننێرن؟)). وا دیاربوو لە پرسیارەکەم تووڕەیە، ڕووی تێ‌کردم‌و گوتی:((ئاخر حاجی تۆ نازانی من بۆیە ئەوانە دەنێرم تا بگیرێن‌و زیندانەکانی ڕەژیم پڕ ببن‌و کۆمەلانی خەڵك شۆڕش بکەن؟!)).

پەناهیان‌و دوکتۆر موراد ڕەزم ئاوەر هەوڵیان دا بەرەیەك لە هێزی چەپ بە هەموولایەنەکان پێك بێنن. لە سەرەتادا خەڵکێکی زۆر لە ئۆپۆزۆسیۆنی ئێران لە دەوریان کۆبوونەوە. بەڵام زۆر زوو دەرکەوت ئەمانە نیازیان وایە کۆنترۆڵی ئەم بەرەیە بگرنە دەست‌و لە چوارچێوەی بەرنامە تایبەتیەکانی خۆیاندا بەڕێوەی بەرن. لەبەر ئەوە چەند لایەنێك هەر زۆر زوو بەغدایان بەجێ‌هێشت، دوایی تەنیا جگە لە خۆیان (وەك حیزبی توودە)و (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)و (فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان)و ئێمە، وەك سەربەخۆ، مابووینەوە. مەرجی حیزبی دیموکراتی کوردستان بۆ بەشداربوون لەم بەرەیەدا، ئەوەبوو بتوانێ سیاسەتی حیزب لە (ڕادیۆی شۆڕشگێڕانی ئێران)و ڕاگەیاندنەکانی تردا بڵاو بکاتەوە. پاش ماوەیەك پەناهیان داوا دەکات بەیاننامەیەك دژی مەلا مستەفا بە فارسی‌و کوردی‌و ئازەری لە ڕادیۆی شۆڕشگێڕانی ئێران بڵاو بکرێتەوە. بەڵام (حدکا) ڕازی نابێ‌و هاوکاریی حیزب‌و پەناهیان بەم جۆرە دوایی دێت. جگە لە (ڕادیۆی شۆڕشگێڕانی ئێران)، (بەرە) ڕۆژنامەیەکی بە زمانی فارسی‌و ئازەری‌و کوردی بڵاودەکردەوە، بەشی کوردی

لەلایەن زەبیحی و سیراجی و بەشی ئازەری لەلایەن برادەرێك بەناوی دکتۆرو بەشی فارسی لە لایەن "پەناهیان"و مەحموودی نەوایی کە بە ناوی "دوکتۆر صدیق نەوایی" ناوبانگی بلاو ببوەوە، بلاو دەکرایەوە. یەکەم ژمارەی "راه اتحاد"، کە کوردیەکەی "ڕێگای یەکێتی" بوو، لە نیسانی ١٩٧١ و ژمارە (٣١)ی سالی سێیەم کە لە مانگی ئابانی ١٩٧٣ بلاو کراوەتەوە، دوا ژمارەی بووە.

دوکتۆر مەحموودی نەوایی کە تووڕەیی و ئینسانێکی باش و حیسابی بوو، لەسەر ئەوەشڕا بەردەوام لەگەل دوکتۆر موراد مشتومڕیان بوو، لەگەل یەك نەدەگونجان. خێزانی نەوایی لە بەغدا وەفاتی کردووە، لەسەر سپاردەی خۆی لە نەجەف بەخاك سپێردرا. لەکاتی ژیانیشیدا جارجارە هاتوچۆی نەجەفی دەکرد، هەروەها لەگەل خانمی بەختیاریش زۆر ڕێك بوون؛ خانمی بەختیار ڕێزی زۆری لەو ژن و مێردە دەگرت.

ئەرکی سەر شانی من لە بەرەی پەناهیان و دوکتۆر مورادا بریتی بوو لە گوێگرتن و نووسینەوەی قسەکان و وتووێژەکانی شاو سەرەك وەزیرانی کابینەی ئێران کە کاتێکی زۆری لێدەگرتم، بەرپرسیی مالی و چاوەدێریی چاپی ڕۆژنامەی "راه اتحاد"و دابەشکردن و پۆستەکردنی بۆ گشت ولاتانی دەرەوە. ئەمە جگە لە وەرگێڕانی نامەو ڕاپۆرتەکانی دوکتۆر موراد عەزیز بۆ بەرپرسە بالاکانی عیراق. ئەوکاتە پەناهیان، بە هاوکاریی شێخ جەبار، کاروباری بلاوەپێکردن و تێکدان و دوورخستنەوەی چەکدارەکانی ژانرال بەختیاری گرتبوە ژێر دەستی خۆی.

### حەمدوون عەرەب
### ئەفسەری پەیوەندیەکان

سالی ١٩٧٠ حکوومەت دوو ئەفسەری بۆ دیاری کردبووین بۆ پەیوەندیەکان و جێبەجێکردنی کاروباری پێشمەرگە: یەکێ لەم ئەفسەرانە بەناوی مولازم سەعدی، برای مودەعی عامی ئەوکاتەی بەغداو مالیان نزیك خەستەخانەی یەرمووکی بەغدا بوو، ئەمەیان زیاتر خوازیاری ئیجازەو پشوودان بوو؛ بەلام ئەوی تریان ناوی حەمدوون عەرەب و خەلکی لای مووسل بوو، (نایب زابت تەختە)و بە هیوای تەرفیع بوو، جوێنفرۆشێکی سەیر بوو، جوێنی بە گەورەو بچووکی حکوومەت دەدا، لەسەر کۆمارەوە تا ئەفسەر گەورەکان و وەزیرەکان کەسی نەدەپاراست. لەسەرەتادا وامدەزانی سیخوڕەو دەیەوێ زمانی ئێمە بدزێ! بەلام وردە وردە بۆم ڕوون بۆوە کە

مولازم حەمدوونیش وەك ئێمەی کورد بەدەس ئەم ڕەژیمەوە گرفتارو بێزارە! ئینجا کەم کەم بەدەم واجبات و ئیش و کارەوە هێمن بۆوە، باسی بەسەرهاتی خۆیانی بۆ دەکردین کە لە عەشیرەتی (شەبەك)ن و حکوومەت ناچاری کردوون خۆیان بە عەرەب لەقەڵەم بدەن. هەروەها بنەماڵەیان خزمی "فارس باوە"ی کەسایەتێکی ناسراوی ناو لەشکری پارتی یە. ملازم حەمدوون، ئەفسەرە گەورەکان بەهۆی تووڕەیی و جوێنفرۆشییەوە، لێی ڕازی نەبوون، ئێمەش ناچار بووین هەوڵ بدەین بۆ پاراستنی. ڕۆژێك لە سەید سادق لە ماڵێك بۆ نیوەڕۆ دەعوەت کرابووین. پێشنیوەڕۆ خەبەریان هێنا کە چواردەورمان گیراوە، چەند پێشمەرگەیەك لەجێ خۆیان دامەزراند، ملازم حەمدوون بۆیان دەرچوو و پێی گوتن واباشە خۆتان بە کوشت نەدەن.

لەپاڵ ئەم هەڕەشەیەدا، ماشێنێکی نارد بۆ (لیوای ١٩)و بەپەلە داوای کۆمەگی کرد، زۆری پێ نەچوو سێ ماشێن سەرباز بەچەکەوە گەیشتن و دابەزین، دەوری (٣٠) سی پێشمەرگەش نزیك سەربازەکان دامەزران. ئا بەم جۆرە ملازم حەمدوون لە مەترسیی کارەساتێك ڕزگاری کردین. دوای ئەمە پاش یەکدوو مانگ ماوەیەك مولازم حەمدوون دیار نەبوو، پێیان نەدەگوتین لەکوێیە؟! تا خۆی بەهۆی سەربازێکەوە خەبەری بۆ ناردین کە لە زیندانی ڕەقەم یەك لە سەربازخانەی ڕەشید زیندانییە. ئەم زیندانە تەنیا بۆ ئەوانە بوو کە مەترسیدارن. لەگەڵ حامید بەگ و یەکدوو کەسی تر لە ئاشناکانی چووین بۆ لای، مەترسیی ئەوەی لێ نیشتبوو حوکمێکی زۆری بەسەردا بسەپێنن. ئێستاش پێی نەگوتم لەسەر چی گیراوە؟ بیرم لێ کردەوە واسیتەیەکی زۆر گرینگ نەبێ ڕزگاری نابێ. لەگەڵ مامۆستا عولەما وازمان لە دوکتۆر موراد نەهێنا تا بەڵێنی تەواومان لێ وەرنەگرت بۆ ڕزگارکردنی. زۆری پێ‌نەچوو دوکتۆر توانیی ڕزگاری بکاو بیگێڕێتەوە سەر ئیشەکەی خۆی. دوای ئەمە، ئەم کابرایە تا دوایی لەگەڵ ئێمەو سەبارەت بە بەرژەوەندی پێشمەرگە وەفادار مایەوە. بەداخەوە، ئەم ئەفسەرە نەبەزە لە مووسڵ بە کارەساتی سەیارە گیانی لەدەس دا.

## ژیان و بەسەرهاتی عەبدوڕەحمانی زەبیحی

بێگومان هەوڵدان و قۆڵ لێهەڵمانین بۆ کۆکردنەوەی بەرهەمەکان و ئاسەوارەکانی زەبیحی خۆی‌لەخۆیدا ئەرکێکی گرینگ و خزمەتێکی گەورەیە بە ئەدەب و مێژووی گەلەکەمان. هەروەها وتووێژو نامەگۆڕینەوە لەگەڵ هاوبیران و هاوکارانی یا لەگەڵ ئەوانەی کە زەبیحی هاوکارو هاوبیریان بووە، زیاتر بەرهەمەکانی دەوڵەمەندو بەسوود

دەکات. بەلام شایانی وەبیرهێنانەوەیە کە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەو ڕوونکردنەوەی هەواڵو ڕووداوەکانی سەرەتای چالاکیە سیاسیو نەتەوایەتیەکانی عەبدوڕەحمان زەبیحی لە سەرەتای کۆمەڵەی (ژ. ك)و کۆماری کوردستاندا، ئەرکێکی سووكو ئاسان نییە، بەڵکوو پێویست بوو ئەمە لە کەژوهەوایەکی بێلایانانەو بەتایبەتی (زەبیحیانە)دا ئەنجام بدرایە. ئەوکاتە باشترو نزیکتر لە ڕاستیەکان، جێی خۆی لە کتێبەکەدا دەکردەوە. لەم بارەوە مامۆستا شێخ عیزەدینی حوسەینی چەند ئامۆژگارییەکی بەنرخی کاك عەلی کەریمی دەکات کە بەڕاستی قەبرغەی ئەو مەترسیانەی پێکاوە کە ژیانو بەسەرهاتی زەبیحی دەشێوێنن. ئەم ئەرکە گرانە، هەروەك مامۆستاش ئاماژی پێکردووە، کاری تەنیا یەك نەفەر نەبوو، بەڵکوو کاری چەند کەسی باسەوادی ئاشنا بە گیانی سیاسیو کۆمەڵایەتیو کەسایەتیی زەبیحیو سەردەمی چالاکیەکانی، هەروەها دوور لە هەڵسەنگاندن بە پێوانەی ئایدۆلۆژیانە بوو. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە تەنیا یەك نەفەر ناتوانێ لە هەڵبژاردنی ئەو کەسانەی کە دەتوانن لە کارەکانی "زەبیحی"دا داوەری بکەن، سەرکەوتوو بێ. نازانم زەبیحی چ پێویستی بەوە بوو بە (مەسیح) تەشبیە بکرێ، ئەو خۆی ڕقی لە ماستاو و ماستاوکەر بوو، هەروەها چ جێی ئەوە بوو بڕێك لە کارەکانی بە (تەڕەسوباتی کۆن!) دابنرێ، لەکاتێکدا خاوەنی ئەم فەرمایشە خۆی، بگرە لەویش گەورەتر، لەم (تەڕەسوباتە)دا هاوبەش بوون. بەلام ئەمەی کە بۆ زەبیحی بە (تەڕەسوبات) دادەنرێ، یارییەکی سیاسیی گەورەو گرینگ بوو کە بە ئاسانی لە مێشکی هەموو کەسدا جێی نابێتەوە!

١- "نورەدین کەیانووری" پێش دووەم شەڕی جیهانی لە (ئەڵمانیا)ی نازی دەیخوێند، تێزی کۆتایی خوێندنی لەوێ نووسیوەتەوە. کەیانووری لە تێزەکەیدا وا پیشان دەدا کە مێژووی ئێران لە (ڕەزاشا)وە دەست پێدەکاو هەر بەویش دەبڕێتەوە. ئەوکاتە "ڕەزا شا" هاوپەیمانی هیتلەر، بەرژەوەندی "کەیانووری"ش هەر لەوەدا بوو! بەلام کاتێك ئەڵمانیای هیتلەری لەناو چوو، (بینش)ی کەیانووری (٤٨) پلە گۆڕانکاریی بەسەردا هاتو بەلای کۆمۆنیزمدا شکایەوە. ئەگەرچی تا ماوەیەك هەروەك (نازی) گومانی لێ دەکرا[١٦].

بەلام (بینش) لای "ئیرەج ئەسکەندەری"ی یەکێك لە گەورە ڕابەرانی کۆنی حیزبی (توودە)ی ئێران، (ماکیاولیسمانە)یەو خۆی بە سنوورێکی ئەخلاقی

---

[16] ویراستار، خاطرات کیانوری، ل٧٢.

نابەستێتەوە. ئەو دەڵێ ئەگەر (شومر، شوبر)، ئەو تاوانبارەی کە حەزرەتی حوسەینی شەهید کرد، ڕۆژێك ببێ بە سەرەك وەزیرانی ئێران، بەو مەرجە حیزبی ئێمە بە ڕەسمییەت بناسێ، ئێمە ئەو کارەی ئەو بە شتێکی باشی دەزانین و تاریفی لێ دەکەین[17].

٢- نموونەیەکی تری چاوەڕواننەکراوی (بینش بەپێی بەرژەوەندی) کە وێدەچێ (وەك سەرچاوە) پەیوەندیی بەم کتێبەوە هەبێ، ئەوەیە: ((ڕۆژی دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد، وتەکانی بەڕێز سەید عەزیز شەمزینی، بەم بۆنەوە، نموونەیەکی باڵای پەیوەندیی بنەماڵەی بەڕێزی شەمزینان سەبارەت بە چارەنووسی کوردو کوردستان، بەتایبەت سەبارەت بە پێشەوا قازی محەمەد پیشان دەدا))[18]. کەچی هەر ئەم زاتە بەڕێزە کاتێك چووە بۆ شووڕەوی و گۆڕانکاری لە بیرو بۆچوونەکانیدا پەیدا بووەو پایاننامەی خوێندنی بەناوی (جووڵانەوەی ڕزگاریی نیشتمانیی کوردستان)ـەوە بە زمانی ڕووسی لە مۆسکۆ نووسیوەتەوە، بە جۆرێك ڕێکی خستووە کە عەرزو ئاسمان لەگەڵ باری ڕاستەقینەی ڕووداوەکانی کاتی کۆماری کوردستاندا جیاوازیی هەیە. دکتۆر عەزیز لەم کتێبەدا گشت کەموکوڕیەکانی ئەوکاتە کە لە ئاکامی سیاسەتی چەوت و یەکلایەنانەی شووڕەویدا پەیدا ببوون، دەخاتە ئەستۆی شەخسی قازی محەمەدو حکوومەتی کوردستان! وەك ئەوەی کوردستان و ئازەربایجان هەرگیز لەژێر دەسەڵاتی شووڕەوی و ئەفسەرە سیاسیەکانی سوپای سووری وەك سەمەدئوف، ئاتاکشێوف، حەسەنئوف و کاربەدەستانی کونسوڵگەریی تەورێزو ورمێ: نماز عەلیئوف حاکمی میاندواودا نەبووبن! هەروەك کوردستانیش وەك ئازەربایجان هەرگیز لەژێر چاوەدێریی ڕاستەوخۆی سەرکۆماری ئازەربایجان "باقرۆف"دا نەبووبێ! هەروەك وتەکانی "باقرۆف" لەبەرانبەر هەیئەتی کورددا لە باکۆ ساڵی ١٩٤٥ وەبەر گوێی کەس نەکەوتبن!! یا وەك دەڵێن بێدەنگی کرابێ. باقرۆف لە سەفەری دووهەمی هەیئەتی کورددا بۆ باکۆ ساڵی ١٩٤٥ دەڵێ: ((... ڕۆژێك دێ کە کوردەکان و گشت گەلانی ئێران بە هەموو مافەکانی خۆیان دەگەن، بەڵام لەم بوارەدا ئاڵاهەڵگر تورکەکانی ئازەربایجانن. لەبەر ئەمە پێویست ناکات کوردەکان زۆر پەلە بکەن. ئەوکاتە سەرکەوتنی کۆمەڵانی گەلی کورد پەیوەندیی ڕاستەوخۆی هەیە لەگەڵ سەرکەوتنی خەباتی کوردەکانی عیراق و تورکیا، وڵاتێکی سەربەخۆ کە کوردی هەموولایەکی تێدا بێ. ئێستا کە من

---

[17] خاطرات اسکندری، ل٥٤٣.

[18] جلیل گادانی، پەنجا ساڵ خەبات، ل٣٩.

قسەتان لەگەڵ دەکەم، بەڵێنتان دەدەمێ کە هەر کاتێکی خودموختاری ئازەربایجان جێبەجێ بوو، ئازادی‌و ڕزگاریی ئێوەش لەوێدا دەبێ)).

ئینجا سەبارەت بە کۆمەڵەی (ژ. ک) دەڵێ: ((کۆمەڵە لە بنەڕەتدا لە عیراق لەژێر چاوەدێریی موخابەراتی بریتانیا دامەزراوە، ئەم حیزبە جگە لە ئامرازێك بە دەست ئیستیعماری بریتانیا شتێکی تر نییە))[19]. ئاشکرا نییە کاك عەلی کەریمی ئەم داخوازییەی سەرەوە یا ئەو قسانەی باقرۆفی چۆن لێك داوەتەوە؟ پێویست بوو بزانێ باقرۆف ئەم قسانە جێ خاڵی ناڵێ، ئەمە بەرنامەیەك بوو لەلایەن شەخسی ستالین پەسەند کرابوو، سەپاندنی بە باقرۆف سپێردرابوو، جێبەجێکردنەکەشی بێگومان بۆ کوردان (واجب الإجرا) بوو؛ کەچی بەداخەوە کاك عەلی وا تێگەیشتووە کە شووڕەوی پێش گیرانی زەبیحی‌و هاوڕێیانی زاتی نەکردبێ ئەم داواکارییە بکات! بەڵێ وێدەچێ وابزانێ زەبیحی‌و برادەرانی بۆیە گیراون تا شووڕەوی بتوانێ کۆمەڵەی (ژ. ك) تێك بداو (حدکا) دابمەزرێنێ. من لەوە زیاتر تەفسیرێك بۆ ئەم بۆچوونە نابینم! هەروەها مەبەستی ئەوەیە کە بڵێ ئەمانە بە پیلان گیراون، ڕووی قسەش لە شەخسی ئەووەڵی وڵاتە کە وێدەچێ ئەم کارە بە ئەمری ئەو ئەنجام درابێ! هەروەها لە (قڕەی قەل)دا مەبەستەکە ئاشکراتر ڕوون کراوەتەوە. هەژار ئەم بۆچوونە ناڕەوایە ئیهمال دەکاو دوای وشەی (قڕەی قەل) ڕاستەوخۆ دەڵێ:

((یا خوا هەر بژی پێشەوای بەڕێز — سەرۆکی گەورە، سەربەرز و بەڕێز
شادە کورد هەتا پێشـــەوا هەیە — خودا شـــادمان کەی تا دنیا هەیە))

هەژاری شاعیر کە خۆی لە ناوەڕاستی ڕووداوەکانی ئەوکاتەدا بووە، زۆر بە ئاشکرا ئەم جۆرە بۆچوونانە ڕەت دەکاتەوە. کەواتە بۆ دەبێ ئێمە گرتنی زەبیحی‌و هاوڕێکانی بە باری ڕاستی خۆیدا کە لەگەڵ سیاسەتی ئەوسای شووڕەویدا بگونجێ، لێك نەدەینەوە؟!

ئاشکرایە پەیمانی سێ سنوور خۆی لە چوارچێوەی کوردستانی گەورەدا بەستراوە، ئەمەش دژی سیاسەت‌و بەرنامەی شووڕەوی بووە کە ئەوان لە باکۆ ساڵی ١٩٤١ ڕەتیان کردبۆوە. بۆیە وێدەچێ ڕووسان ئەم سەفەرەیان دژی سیاسەتی

---

[19] ئیگلتن، جمهوری مهاباد، ل٨٦-٨٧ (فارسی).

خۆیان زانیبێ. کەواتە دوور نییە گرتنی مامۆستا زەبیحی و برادەرەکانی هەر لەلایەن خۆیانەوە جێبەجێ کرابێ!

### لە پەراوێزی
### ژیان و بەسەرهاتی مامۆستا عەبدوڕەحمان زەبیحی

عەبدوڕەحمان زەبیحی لە هیچ جێگەیەک، لەو وڵاتانەی کە تێیدا ناسرابوو بە بنەماڵە یان دایک و باوکیەوە نەناسراو بوو، بەڵکوو بە کەسایەتیی سەربەخۆی خۆیەوە ناوبانگی دەرکردبوو. نازانم چی لە کەسایەتی زەبیحی کەم دەکاتەوە ئەگەر خەڵک بە ڕاشکاوی بزانن خوالێخۆشبوو سۆفی حەمەدەمین دوو ژنی هێناوەو دایکی عەبدوڕەحمان و خوالێخۆشبوو عەبدوڵڵای برای لە گەڵ هی ئەوانی تر جیایە؟ بەڵێ دایکی زەبیحی لە بنەماڵەیەکی ناسراوی سابلاغەو بێگومان خۆبواردن لە ئاماژەپێکردنی دەستدرێژییە بۆ سەر مافی دایکێک و بنەماڵەی ئەو دایکە؟! من پێم وانییە ئەمە ڕێزی خۆشەویستیی ئەم دوو خوشکەو دایکیان سەبارەت بە کاکیان (زەبیحی) کەم بکاتەوە. بێگومان باشتر دەبوو، ئەگەر ڕاستیەکان هەرچی هەن، لەسەر دەقی خۆیان، بێئەوەی بە بیرو بۆچوونی ئەمڕۆی نووسەرو ئەم و ئەو موتوربە بکرێ، بنووسرێتەوە، چونکە مێژوو ئەگەر درۆو تەزویری تێکەوت ئیتر تایبەتمەندیی و چێژی مێژووییی خۆی لەدەست دەدات و کاریگەریی خراپ دەکاتە سەر نرخی مەعنەویی ڕووداوەکان. زەبیحی لای ئەو کەسانەی کە دەبوو بیناسن یان ئەوانەی کاریان لەگەڵ کردووە یان کاری لەگەڵ کردوون، بەباشی ناسرابوو، ئیتر پێویستی بە مینبەری ئازاد نەبوو کە خودی زەبیحیی تێدا ببێتە ئامانجی پلار و ڕەخنەی بێجێی ئەوانەی ئێستاش پێیان وایە زەبیحی لایەنەکانی نەناسیوەو بیرو بۆچوونەکانی ڕاست نەبوون!!

### ڕوونکردنەوە سەبارەت بە لاپەڕە تاریکەکەی زەبیحی!!

ئەوەی کە مامۆستا حەسەنپوور ئاماژەی پێدەکات، لە لاپەڕە (٢٠٦)ی (ژیان و بەسەرهاتی عەبدولرەحمان زەبیحی "عولەما")یشدا دیسان باس کراوەتەوە، ڕەنگە بەو جۆرەش نەبێ کە دەیانەوێ پیشانی بدەن. مەسەلەی ژانراڵ تەیمووری بەختیارو مەحموودی پەناهیان، دوو بابەتی زۆر جیاوازو لە هەمان کاتیشدا سەرو ژێری پیلانێکی تایبەتین! تەیمووری بەختیار هەروا سەرزەدە نەهاتبوو بۆ عیراق.

پێش ئەوەی لە مێژووی ١٣٤٨/٢/٢٧دا بگاتە بەغداد، کۆشکی نووری سەعیدی بۆ ئامادە کرابوو. کاتێك گەیشت، پێش ئەوەی ماندوویی بحەسێتەوە، نوێنەری (توودە) بە ئەدەبێکی دیپلۆماسیانەوە لەپەنایدا ڕاوەستابوو، وتووێژی سەرەتایی زۆری نەخایاند. بۆ شەو جەنابی دوکتۆر ڕادمەنیش سکرتێری یەکەم‌و ڕابەری حیزبی توودەی ئێران‌و هەروەها دوکتۆر موڕادی ڕەزم ئاوەر نوێنەری تایبەتی توودەو ژانراڵ تەیمووری بەختیار، تا درەنگانێکی شەو خەریکی وتووێژ بوون!! جا ئەگەر لە پەراوێز یان سووچێکی ئەم وتووێژانەدا، عەبدوڕەحمان زەبیحی وەك ڕاوێژکەرو شاپەسندی وەك جێبەجێکەری ئەو بڕیارانەی کە دەبێ لە کوردستاندا جێبەجێ بکرێن، چالاکیەکانمان نواندبێ، ئەوە دەبێتە لاپەڕەیەکی تاریك‌و ڕەش لە ژیانی زەبیحیدا! بۆچی؟!

لێرەدا وێدەچێ کاك حەسەنپوور ئاگای لە لایەنەکانی مەسەلەکە نەبێ، بەڵام ئیتر ئەوە ئەوپەڕی بێ‌بەندوبارییە بۆ ئەوانەی کە خۆیان لە ناوەڕاستی مەسەلەکەدان، ئینجا بە باری مەنفیدا هەڵی‌دەگێڕینەوەو دەیانەوێ یەکێکی وەك زەبیحیی پێ بەدناو بکەن. ئەو لایەنانەی کە منیان بە بەختیار ناساند، بەزەبیحیشەوە، هەر لە (بێرووت)ـەوە تەئکیداتی پێویستیان بۆ بووژاندنەوەی قانوونی ئەساسیی ئێران‌و خودگەردانیی کوردستانی ئێران، لە بەختیار وەرگرتبوو. جگە لەمە، بەرنامەکانی شاراوە نەبوون، هەر بە گەیشتنی بۆ بەغداد ڕەسمەن ڕایگەیاندبوو. بەڵام مەسەلەی چەکدارەکانی کوردستان کە کاك حەمەدەمینی سیڕاجی زۆر پێیەوە ماندووەو بۆیان دەتلێتەوە، وا باشە دڵنیا بێ کە تا بەختیار مابوو ئەم چەکدارانە بەوپەڕی ئاسوودەیی‌یەوە دەژیان‌و کەموکوڕییەکی ئەوتۆیان نەبوو.

سێ ڕۆژ پێش تیرۆری بەختیار، ساواك لە کوردستان بڵاوی کردبۆوە ئەمڕۆژانە بەختیار دەکوژرێ! کە گەڕامەوە بەغدا ئەو خەبەرەم بۆ گێڕاوە، سەری هەڵبڕی‌و کوتی: دڵنیا بە ئەگەر خوا نەمکوژێ، کەس ناتوانێ لەناوم بەرێ. کەچی زۆری پێ‌نەچوو لە ٨ی ئابی١٩٧٠دا تەیمووری بەختیار کاتی ڕاوکردن لەنزیك بەغدا تیرۆر کراو بۆ شەو وەفاتی کرد. تیرۆری بەختیار ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەرو نادیار بوو. پیلانێکی چەندلایەنەو جێ‌پەنجەی گەورە سیخوڕانی ناوچەیی‌و دەرەوەی پێوە دیار بوو! زۆر لایەن لە جێبەجێکردنیدا هاوبەش بوون، بەتایبەتی حیزبی توودە،

بەشداریی خودی ڕادمەنیش‌و ساواك بە نوێنەرایەتیی عەباس عەلی شەهریاری نموونەی ناوەڕۆکی ئەم پیلانە بوون!

وا دەردەکەوێ مەرگی بەختیارو هەروەها ئاشکرابوونی عەباس عەلی شەهریاری، وەك کەڵەمۆرەیەکی ساواك‌و لە هەمان کاتیشدا بڕواپێکراوی دوکتۆر ڕەزا ڕادمەنیش! نیهایەتی کاری خودی دوکتۆر ڕادمەنیشی بەشوێنەوە بوو. شەهریاری هەروەها نیازی وابوو شەوی کودەتا دژی (حشع) لە سنووری عیراق‌و ئێران، ڕادمەنیش بێهۆش بکات‌و وەك دسکەگوڵ پێشکەشی ساواکی بکات. ئەم پیلانە بەهۆی کودیتاوە دواکەوت، بەڵام توانیی "عامر عەبدوڵڵا"ی ئەندامی ڕابەرایەتیی (حشع) تەسلیمی ساواك‌و بە پێنج شەش ساڵان گرفتاری زیندان بکات. بەختیار، جگە لەوەی لە کوردستانی عیراق هەزارو دووسەد چەکداری پۆشتەو پڕچەکی هەبوو، لە باشوورو ناوەندی عیراقیشدا چەکداری زۆری هەبوو، ئەگەرچی لە زۆر لاوە تاڕادەیەك ساواك کلۆری کردبوو.

لە بارودۆخێکی ئاوا ئاڵۆزو شێواودا، ژانراڵ مەحموودی پەناهیان، ژانراڵی فیرقەی دیموکرات‌و بڕواپێکراوی کامبەخش‌و باقرۆف هاتە بەغدا. پەناهیان بە ڕەگەز ئازەری بوو، بەڵام ڕەگەزپەرستێکی کۆنەکار بوو؛ بەو مەبەستە بۆ بەغدایان ناردبوو بۆ ئەوەی تەشکیلاتی چەکدارەکانی بەختیار لە ڕەگ‌و ڕیشەوە هەڵوەشێتەوە، تا بەمجۆرە ڕێگەی نزیکبوونەوە لە حەمە ڕەزا شا هەموارو ئامادە بێ. پەناهیان بۆ جێبەجێکردنی ئەم مەئموورییەتە، دەستە دەستە چەکدارەکانی بە ناوی مەفرەزەو دەست‌وەشاندن لە ڕەژێم، دەناردەوە ناو ئێران؛ بەڵام لە سنوور یا دەگیران‌و یانیش دەکوژران. ئێمە لەو سیاسەتە نوێیەی پەناهیان دڕدۆنگ بووین. ڕۆژێك لە بەینی قساندا پێم‌وت: جەنابی ژانراڵ، ئێوە باش ئاگادارن کە ئەو چەکدارانەی وا بۆ ناو ئێرانیان دەنێرن، چییان بەسەر دێ؟ کەواتە بۆچی دەیاننرێن؟! وتی: حاجی، ئەوانە بۆیە دەنێرمەوە هەتا بگیرێن، زیندانەکانی ڕەژێم پڕبن، هەتا خەڵکی شۆڕش بکەن!! بەڵێ ئەمە بوو سیاسەتی حیزبی توودەو بگرە باڵاتریش کە بە دەستی پەناهیان‌و دکتۆر موراد جێبەجێ دەکراو جەنابی کاك حەمەدەمین‌و زۆری وەك ئەویشی تێدا هاوبەش بوون. هەمان سیاسەتی بۆ لەناوبردنی کۆمیتەی شۆڕشگێڕی دیموکرات کە ئاغایانی دەوری شوومی پەناهیانیان پێ ئەسپێردرابوو، هەمان سیاسەتی تێکدەری ڕیزەکانی حدکا لە کۆنگرەی چواردا... کە خۆشبەختانە ئاکامی لە کەس شاراوە

نییە. بێگومان شانازیەکەی ئەویش هەر بۆ ئەوانەیە کە مانگی هەنگوینی سۆڤیەت-ئێرانیان ڕێك خستو هەوارگەکانی سۆڤیەتو کەنارەکانی (دەریای ڕەش)یان بۆ شاو شاژنو بنەماڵەی پەهلەویو حکوومەتی ئێران قۆرخ کرد.

من ساڵی ١٩٧٥و لە ماڵی زەبیحیدا بە سەختی بریندار کرام، پێشم وانەبوو کە دەگەمە نەخۆشخانە، بۆیە لە ماشێنی ئەمبولانسدا داوای دوکتۆر مورادم کرد تا کاتی نەشتەرگەری کە بەهۆی خوێنرێژیی داخیلی بۆم ئەنجام دەدرا، ئامادە بێ. جێگای سوپاسە کە خۆیو کچەکەی "دوکتۆر ڤیکتۆریا" ئامادە بوونو خوێنی پێویستیان بۆ ئامادە کردبووم.

لە حاڵێکی ئاوادا کە خۆم برینداروماڵو منداڵم لە دەرگای نەخۆشخانە قەتیسو ماڵەکەمان چۆڵە، (برادەرێك) خۆ بە ماڵێدا دەکاتو هێندێك پارەی زەبیحی کە لەزووەوە لای منی دانابوو، دەدۆزێتەوەو دەیبا. ئەم برادەرە ناسیاوی خۆمو زەبیحی بوو. خودی زەبیحی لە بێرووت باسی ئەم پارەیەی بۆ کردبوو کە لای منی داناوە. لەسەر ئەوەشڕا کە دزینی ئەم پارەیە، لێپرسراویی ئەخلاقیی منی تێدا نەبوە، بەڵکوو لە ئاکامی هەڵەی خودی زەبیحی ڕووی داوە، پێم خۆشنەبوو لە ماڵی ئێمە پارەی زەبیحی بدزرێ، بۆیە داوام لێ کرد کەموزۆریی پارەکە ئاشکرا بکات. زەبیحی لە پێشدا هێندێك بیری لە بەشە مەسئوولیەتی خۆی کردبۆوە، بۆیە پێی خۆش نەبوو مەسەلەکە ئاشکرا بکرێو ئەمو ئەو پێی بزانن. ئەمە جاری ئەووەڵیش نەبوو کە پارەی دەدزرێ، جارێکی دیش دیسان هەر لە ماڵەکەی خۆی، کە بۆ پرسەی هاوسێیەکی خۆی، چەند ڕۆژێك بەجێی هێشتبوو، پارەیەکی باشی لەناو بۆفیەدا دزراو دیسانیش دزەکە ناسراو بوو. بەڵام بێدەنگیی لێ کردو کەسیش نەیزانی. بە قسەی خودی زەبیحی، پارەکە بەینی ٢٣٠٠ تا ٢٧٠٠ دینار بووە. جا لەبەر ئەوەی کە خۆم پارەی نوستووم نەبوو، ناچار بووم خانوەکەم بخەمە ڕەهنەوەو ٢٥٠٠ دیناری بۆ بنێرمو (مەلا عەولا- مەلا ماتۆڕ)یش لە کتێبەکەیدا ئەوە دەسەلمێنێ. ئیتر ئەو خەڵکەی وەك مەلاو دوکتۆری (کاسە از آش گرمتر!) بە قەولی خۆیان مەبلەغەکە زیادوکەم دەکەنو بە ڕواڵەت بۆ زەبیحی دەکڕووزێنەوە، گرفتی سروشتی خۆیانە!

زەبیحی پیاوێکی ڕاستگۆ بوو. من کە نەمویستووە برادەرم تووشی زیان بێ، ئەگەر دوو بەرابەری ئەو ئەندازەیەشی داوا کردبایە، دەمتوانی بیدەم. ئیدی ئەو برادەرانە بە گرفتەکانی خۆیانەوە خەریك بن، لە هی ئەمو ئەو باشترە. ئەگەرچی وا

٢٤ ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوە شوومەدا تێدەپەڕێ، بەڵام بەدرێژایی ئەو ماوەیە هەرگیز نەمتوانیوە ئەوە لە بیری خۆم بەرمەوە کە تاوانی هەڵەیەکی گەورەی زەبیحی بە ڕەهن دانانی خانووی منداڵەکانی من چارەسەر کراوە! لە جێگەیەکی تردا دوکتۆر عیزەدین دەفەرموێ: ((پاش تێکچوونی کۆماریش ئەندامانی (ژ. ك) ملیان بۆ حدکا ڕانەکێشا!)) لاموایە ئەم مەسەلەیە (چەپەوانە) خوێندراوەتەوە.

حدکا هەمان (ژ. ك)ی دوێنێ بوو، بەڵام تۆزێك ڕێکوپێکتر. ئەوە توودە بوو داری دەخستە ناو چەرخی خەباتی (حدکا)وە، زەبیحی ئەمەی لە زووەوە پێشبینیی کردبوو کە توودە نایەڵێ حدکا سەربەخۆ بمێنێتەوە. هاوینی ١٩٤٨ تاڕادەیەك لەم ئاواتە دێرینەی خۆی نزیك ببۆوە. کاك حەمەدەمین و گەلاوێژ کە چاوەڕوان بوون ئیمام خومەینی بە شوێن "کیانووری"دا بنێرێ و پۆستی سەرەك وەزیریی پێ بسپێرێ، پاڵەوانی ئەو مەیدانە نەبوو. هەر لەبەر ئەوە بوو کە ساڵی ١٩٤٨ زەبیحی و غەنی و من لە ژمارە ١٠ی "نیشتمان"ەوە تێهەڵچووینەوە. هەر لەبەر چەند بابەتێکی هەمان ژمارە ١٠ی نیشتمان بوو، کە پارتی لە بڵاوکراوەی ناوخۆیی خۆیدا بە ئاژاوەچی ناویان بردبووین و ڕەخنەشیان لە هەژار گرتبوو کە بۆچی شیعری خۆی لەوێدا چاپ کردووە. دوکتۆر عیزەدین خۆشی نایشارێتەوە کە ژمارە ١٠ی "نیشتمان"ی دیوە.

## گیرانەوەی زەبیحی ساڵی ١٩٧٣

هەموو ئەو قسانەی کە سەبارەت بە گیرانی زەبیحی و ئەو کەسانەی کە (بەقسە) بۆی تێکەوتوون، بڕوا بکە بەشی زۆری هەر قسەیەو بەس، بەتایبەتی وەزیرە کوردەکان، یان یەکێکی وەك مەلا عەولا کە بە ئاشکرا هاواری دەکرد و دەیکوت: عەریفێکی عارەب زیاتر لە من دەستی دەڕوات، ئەو کەسە نەبوو بوێرێ لە بەرانبەر سەدام حوسێندا پارێزگاری لە زەبیحی بکات. لە وەزارەت چاوم بە خوالێخۆشبوو عوبەید بارزانی کەوت، سوێندی بۆ خواردم کە دەستی ناڕوات. شێخ سەتار کە دەڵێت کاری بۆ کردووە، کوا؟ ڕۆژێك لە بەندیەکەی کەم نەکرایەوە! مەلا عەولا کە دەڵێ دوو ساڵی ڕەبەق بۆ (ئەبوغرێب) هاتوچۆی کردووە. من هەموو (مواجەهەیەك) تا کۆتایی سەردانیش هەر لەلای بووم. نە مەلام دی و نە شێخ! تۆ بڵێی بە ڕەسمی و بەتایبەتی کاتی دەوامی ڕەسمی ماوەیان بەو ئاغایانە دابێ بۆ بینینی زەبیحی؟ جگە لەمە، هەرگیز نەمهێشتووە پێویستی بە هیچ خۆراکێکی تایبەتی هەبێ، تەنانەت نەمهێشتووە لەسەر نانی تیریش پەکی بکەوێ. بۆ

ئەوەی وەزیرو دوکتۆرەکانمان پێویستیان بە مەنجەڵ هەڵگرتن نەبێ! تەنیا وێدەچێ تەها موحیەدین مەعرووف بە سەدام حوسێنی گوتبێ، بەڵام ئەوەش کاتێك بووە کە کارەکەی بۆ سووك کرابوو و لە مردن ڕزگاری ببوو. بێگومان مێژوو لەبیری ناچێ کە تەنیا کەسێکی لەو کارەساتەدا فریای زەبیحی کەوت و لە مردن ڕزگاری کرد، خێزانی تەیمووری بەختیار بوو. من پێش گەڕانەوەی زەبیحی لە بێرووت بۆم ڕوون کربۆوە کە چ پیلانێك بۆ لەناوبردنی زەبیحی لەئارادایە. سەعاتێك پاش گیرانی من لە ماڵی بەختیار بووم. تێم گەیاند کە زەبیحی گیرا، ئەگەر زۆر زوو فریای نەکەوی دەکوژرێ! ئەو خانمە نەجیب و خانەدانە کاتژمێری دەی بەیانی بە تەلەفون لەگەڵ سەرکۆمار "ئەحمەد حەسەن بەکر"، لەسەر زەبیحی مشتومڕیان بوو، وازی نەهێنا تا سەرکۆمار بەڵێنی سووککردنی مەسەلەکەی نەسەلماند.

لەو گێرەو کێشەیەدا خۆم لە پەنایدا ڕاوەستابووم. بۆ دڵنیاییی خۆمان کاتژمێری دوازدە یەکێك لە کوڕەکانی بەختیار لە "ئەمن" لەگەڵ زەبیحی وتووێژی دەکرد. هەر ئەو ڕۆژەو بۆ ئێوارە زەبیحی نێردرا بۆ زیندانی (فزێلیە)، بەیانیی ڕۆژی دوایی بە کەلوپەل و پێخەف بۆ زیندان، لەلای ئامادەبووم. ئەمە باری ڕاستەقینەی مەسەلەی گیرانی زەبیحی‌یە، کە بەداخەوە زۆر کەس خۆی بە ڕزگارکەری زەبیحی لەقەڵەم داوەو کاك سیراجیش بە بارێکی دیدا هەڵـیگێڕاوەتەوە. لە (ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی، ل٢٩٠-٢٩١)دا، لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، لە دوو جێگادا ناوی منی تێدایە، بەڵام بڕگەکان ئاڵۆزن و واتای باش بەدەستەوە نادەن؛ لە جێگەیەکدا دەڵێ: گوایە زەبیحی ١٥-١٦ هەزار دینارێك لای کابرایەك دادەنێ، ئەویش داوێتی بە یەکێکی تر. دەڵێ تەنیا ٥-٦ هەزار دیناری دەست کەوتۆتەوە. ئینجا دەبێ ئەو مەسەلەیە کاتێك بێ کە برادەران ویستوویانە (پارتی)یەکی تر دروست بکەن. گوایە وا چاوەڕوان کراوە مامۆستا ببێتە نوێنەری ئەو پارتییەو لەبەر ئەوەیە کابرا دەیەوێ پارەکە بخوات. بەڵام زەبیحی بەوە ڕازی نابێ، باقی پارەکەش دەگێڕنەوە بۆ مامۆستا بۆ لەندەن. دیسان لە لاپەڕەی دواتردا، وەك مامۆستا بیەوێ بیباتە ناو کێشەی ئەو پارتی دروستکردنە. ئەگەرچی مامۆستا بە خراپ باسم ناکا، بەڵام وێدەچێ کاك عەلی ویستبێتی مامۆستاش وەك دوکتۆر عیزەدین بخاتە ناو پارەکەی زەبیحی‌یەوە. من لەو مەسەلەیەدا تەنیا بیرم بۆ یەك شت دەچێ. ئەوکاتە برادەرێك لەگەڵ زەبیحی چەند کلیۆ ئاڵتوون دەکڕن، یاخود هی کابرا

دەبێ، بەڵام نیوەی لە ماڵی زەبیحی دەشاردرێتەوە. دوایی ئاڵتوونی هەردوولا دەگیرێو حکوومەت دەیبا. ئەوەی من ئاگام لێ بێ کابرا ماڵوێران بوو. جگە لە ئاڵتوونەکە، زۆر شتی دیشی لەدەست دا. بەڵام بەڕاستی ئاگاردا نیم زەبیحی چ پەیوەندییەکی بەو مەسەلەیە هەبوو یا نا؟

## خاڵێکی تری تاریک

خاڵێکی ڕەش‌و تاریکی تر لە کتێبەکەی کاك عەلی‌دا، دەستدرێژییە بۆ سەر ناوو ناوبانگی ئەفراد، کە بەداخەوە کاك عەلی بەرپرسیاری هەموویەتی. بێئەوەی هەستی بە ڕێزی ئەو کەسایەتیە بەڕێزانەی وەك مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، مام جەلال، کاك سەلاح موهتەدی‌و کاك عەبدوڵلای موهتەدی ... کردبێ؛ لە مینبەرێکی ئازاددا ماوەی بۆ زۆر کەس تەرخان کردووە دەستدرێژی بکەنە سەر خەڵك وەیان ماستاو سارد بکەنەوە! بەلای منەوە دەبوو ئەم کتێبە زۆر لەوە سەنگینتر بێ کە جێگەی ئەم جۆرە کەسانەی تێدا بێتەوە. زۆر حەیفە مرۆڤ بگاتە ئەو ئاستەی لەگەڵ مەڕ شین بکات‌و لەگەڵ گورگیش مەڕ بخوات!

## مەنجەڵە یاپراخی مامۆستا

لە لاپەڕە ١٦٦ی کتێبەکەدا دەستدرێژی دەکرێتە سەر پیاوێکی ڕۆشنبیرو ڕێکوپێك‌و پیاو باش، بە ناوی کاك ئیبراهیم خۆشناو لەلایەن شێخ لەتیفی بەرزنجی‌یەوە. ئەو کاتەی کە بڕیار وابوو مەلا عەولا ببێ بە وەزیر، کاك ئیبراهیم چاوەڕوان بوو بکرێ بە سکرتێری وەزیر. ئەگەرچی کاك ئیبراهیم لە ڕۆشنبیری‌و کەسایەتیدا لە خودی وەزیر کەمتر نەبوو، بەڵام لەبەر چەند هۆیەك حکوومەت کاك ئیبراهیمی ڕەت کردەوەو شێخ لەتیف کرا بە سکرتێری وەزیر. پاش ئەو هەموو ساڵانە بەداخەوە کە شێخ ڕەقیبەکەی خۆی لەبیر نەچۆتەوەو بە وێنەیەکی زۆر نزم باسی دەکات‌و بە خراپ ناوی دەبات!

## سەبارەت بە شەهیدبوونی حامید بەگ

بەداخەوە کە شەهیدبوونی حامید بەگ زیانێکی گەورە بوو کە لە گەلەکەمان کەوت. حامید بەگ مرۆڤێکی دلێرو کۆڵنەدەرو نیشتمانپەروەر بوو، بۆیە لەناو پێشمەرگەی گەلی کوردستاندا لای مام جەلال گیرسابۆوە. لە ساڵانی ١٩٦٩-١٩٧٠دا

باش نەمدەناسی، بەڵام بەهۆی "قادر شەریف"ەوە لەگەڵ خێزانی ناسیاویمان هەبوو، دایکی پەخشان خان ئەو سەردەمە بۆ ناردن و ڕەوانەکردنی نامەو ئەو جۆرە شتانە بۆ پیاوە ماقووڵ و سەرەك عەشیرەتەکان لە کوردستانی ئێران، یارمەتیی دەدایین. دوای ئەمە لە (بەکرەجۆ) کاك حامیدم ناسی، دیار بوو زەبیحیش دەیناسی. ئەوکاتە پێویستمان بە فەرماندەیەکی لێهاتوو بوو، فەرماندەیی چەکدارەکانی ژانراڵ تەیمووری بەختیار وەئەستۆ بگرێ. بۆیە تکام لە مام جەلال کرد حامید بەگ بۆ فەرماندەییی چەکدارەکانی بەختیار دیاری بکات. ئەگەرچی مام جەلال خۆشی دەویست و پێی خۆش بوو هەر لای خۆی بمێنێتەوە، لەسەر ئەوەشڕا هەر پەسەندی کرد.

دوای تیرۆری بەختیار، کە ژانراڵ مەحموود پەناهیان و دکتۆر موورادی ڕەزم ئاوەر، چەکدارەکانی هەڵەبجەو سەیدسادق و خانەقین و زۆر جێگای تر لە باشووری عیراقیان هەڵوەشاندەوە، ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا، یان ڕەوانەی بەندیخانەکانی عیراق و ئێران کران. ژمارەیەکی زۆریشیان دوور خرانەوە بۆ (ڕومادی)و جێگای تر. حامید بەگ و خانەوادەکەیان دوور خستەوە بۆ سامەڕاو لەوێ نیشتەجێ کران. جار جارە لە بەغدا چاوم پێدەکەوت. ئەوکاتە شۆڕشی ئێران دەستی پێکردبوو و کوردستانی ئەوێکانە ئاڵۆز بوو. کە دەمدی دڵسۆزانە داوام لێ دەکرد، بگەڕێتەوە بۆ ناو کەسوکارو عەشیرەتەکەی خۆی (باوەجانی)، لەوە دەترسام جارێکی دی هەوای فەرماندەیی لەسەری بدات و تێدا بچێ. پاشانیش هەر خۆی ئاشکرای کرد کە مامۆستا زەبیحی لێ ناگەڕێ بگەڕێتەوە بۆ ناو کەسوکاری و ڕەنگە بینێرێ بۆ ناوچەی مەهاباد. من لەبەر چەند هۆ دەمزانی حامید بەگ بۆ ناوچەی مەهاباد نابێ، بەڵام لەبەر ئەوەی دەستی زەبیحیی تێدا بوو، بێدەنگەم لێ کرد. بەداخەوە پاش ماوەیەك، هەواڵی زیندانی بوونی و دواتریش شەهید بوونیم پێگەیشت. من ئەوکاتە بەماڵەوە گەڕابوومەوە سلێمانی. لەوێ ناڕاستەوخۆ پەیوەندییەکم لەگەڵ ئەو چریکانەدا هەبوو کە "حامید بەگ"یان گرتبوو، یەکێکیش لە ڕابەرەکانیم دەناسی. ئەگەر زووتر باسەکەم دەست بکەوتبا، بێگومان مەسەلەکە وای لێ نەدەهات، مەخابن. حامید بەگ بووە قوربانیی ئەو لایەنانەی کە دەبوو بیپارێزن و نەیانکرد. بەینی گرتن و شەهیدبوونی ماوەیەکی خایاند، پرسیار ئەوەیە: ئایا نەدەکرا لەو بەینەدا چارەسەرێکی بۆ بدۆزرێتەوە؟!

من چل ساڵ لەگەڵ زەبیحی ژیاوم. وەك دوو براو مامۆستاو قوتابی و دوو هاوڕێ پێکەوە ژیاوین. جا بۆیە بیرەوەریەکانم لەگەڵ ئەو بێکۆتایی‌یە. هەرچی تائێستا سەبارەت بە ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی تۆمار کراوە، تەنیا یەك لایەنی ژیانیەتی کە بەداخەوە زۆریش شێوێنراوە. بەلای منەوە، بۆ ئامادەسازی ئەم کارە گرینگە، وا باش بوو ژیان و بەسەرهاتی لە بارودۆخ و کەژێکی گونجاو لەگەڵ بیرو بۆچوونەکانی خۆیدا ئامادە بکرێ.

**عەبدوڕەحمان زەبیحی**
**لە وتووێژی عەلی کەریمی لەگەڵ "مەلا عەولا ئیسماعیل"دا**

پەیوەندیەکان و دۆستایەتیی مامۆستا زەبیحی لەگەڵ "مەلا عەولا ئیسماعیل"دا لە پارتی‌یەوە دەستیان پێکردو برادەرییان خۆش بوو. کاتێك مەکتەبی سیاسیی پارتی مەلا عەولایان لە پارتی وەلاناو دەریانکرد، نازانم چۆن بوو زەبیحی دۆستایەتیی خۆی لەگەڵ مەلا عەولا تێك نەداو جارجار دەیپاراست، ئەگەرچی هۆی دەرکردنەکەی لە حیزب پێ ناڕاست نەبوو! مەلا عەولا ئەوکاتە لە (مەشتەل) لە بەغدا بارەگای کردبۆوە، کەم کەم پەیوەندیەکانیی لەگەڵ حکوومەت بەهێز کرد. وا قاوە دەڵێن زەبیحی پۆستی وەزارەتی بۆ مسۆگەر کردبوو. بە ڕێکەوت کە دەهاتە (دووکانی حوسەین ئاوارە) لە جادەی (وەسبە—وثبة)ی بەغدا، دەستی هەڵدەبڕی و لە خوا دەپاڕایەوەو دەیگوت: ((خوایە لە ماموستا زەبیحی بەزیاد بێ)). دوای ئەمە بزووتنەوەیەکی دەست پێکرد بەناوی (الحركة التقدمية الكردية)وە، وەك خۆی دەیگوت، ناوی بزووتنەوەکەشی هەر زەبیحی بۆی داناوە.

بەڵام گیرسانەوەی زەبیحی لای مەلا عەولا، بەلای منەوە، حیسابێکی دووروردرێژی زەبیحی دەگەیەنێ. دەبێ وای لێك دابێتەوە ئەگەر لە مەلا عەولا نزیك بێ، ئیتر حکوومەت دڵنیا دەبێ کە هاوکاری وەزیرێکی سەر بە خۆیانەو لەملاو ئەولا بە شوێنیەوە نابن، تاڕادەیەك گوشاری لەسەر کەم دەبێتەوە؛ لەولاشەوە مەلا عەولا لە کەسایەتیی خاوەن ئەزموون و ڕابردووی پاکی زەبیحی بۆ ڕاکێشانی خەڵك سوودی وەردەگرت! وەك مەسەلەکە بەرژەوەندییەکی دوولایەنە بێ. بەڵام بەداخەوە زەبیحی گشت لایەنە پڕ مەترسیەکانی ئەم هاوکارییەی لێك نەدابۆوە! نەیدەزانی یا باوەڕی نەدەکرد تەنانەت لە ماڵەکەی خۆی و زۆر لەو جێگایانەی وا هاتوچۆیان دەکا، لەژێر چاوەدێریی جیهازی ئەمنی حکوومەتدایە. لەلایەکی دیکەوە، دوکتۆر موراد عەزیز

پاش ئەوەی دوو ساڵ زیندانی بەسەردا سەپاندبوو, ئێستا کە ڕزگار بووە، خۆی لێ نزیك کردۆتەوە، تا وابزانێ پارێزگاریی لێدەکات. بەداخەوە مامۆستا برایم ئەحمەدیش هەروای بۆ چووبوو، بەڵام وانەبوو، چونکە من لە هەموو مواجەهەیەکدا بۆ "زەبیحی"م ڕوون دەکردەوە کە هاتوچۆی (فلان کەس) بۆ بێرووت هەموو جارێ بۆ (کەوڵ)ی تۆیە! جگە لەوەی کە ڕاپۆرتی هەڵسوکەوتیان ڕۆژانە بەهۆی ئافرەتێك دەدرێ بە سەفارەتی عیراق.

زەبیحی کاتێ لە لوبنان گەڕایەوەو حکوومەت گرتی، هەر ئەوکاتە نیازی حکوومەت وابوو بە یەکجاری کۆتایی بە مەسەلەکە بێنن، چونکوو سەرقاڵیی ئەو بە کوردایەتییەوەو هاوکاریو هاوفیکریی ئەو لەگەڵ مامۆستا برایم ئەحمەدو مام جەلال، بەتایبەت بەم وێنەیە کە دوکتۆر موراد بۆ حکوومەتی ڕازاندبوەوە؛ جگە لە ئیتیهامی سەفەری سووریا بە پەساپۆرتی بێژمارە، دیدار لەگەڵ کاربەدەستانی باڵای سووریا کە بە تەنهایی سنوور بەزاندنێکی بوێرانەی بێوێنەیە لە بەرامبەر یاسای عیراقو کاربەدەستانیدا! ئەمە لەلایەك. ڕەژیمی عیراق کە ئەو هەموو بەڵگەو هەواڵانەی لایە، تۆ بڵێی ئەمە لە مەلا عەولا، وەك وەزیرێکی ڕەژیم، شاردراوە بێ؟! یا ئەوەندە ساکار بێ لەسەر ئەوەشڕا بوێرێ لای سەدام بۆ زەبیحی پاڕابێتەوە؟!

لەلایەکی ترەوە، وەڵامەکەی "بەرزان تکریتی"ی مودیری موخابەرات دیسان بەهۆی مەلا عەولاوە، بە باشی سامناکیو گرینگیی مەسەلەکە ئاشکرا دەکات. ئینجا هاووڵاتییەك، یا کەسێك کە دادگا یا ڕەژیم دەیگرێ، دەبێ مەعنای ئەوە بێ ئەو کەسە، ئەگەر پاکیش بێ، تاوانبارە! کەوابێ ڕەژیم ئەوەی چۆن بۆ قووت دەدرێ وەزیرێکی وەك مەلا عەولا لە زینداندا سەر لە تاوانبارێك بدا یا داوای عەفووی بۆ بکات؟! یان هەمان وەزیر لە زینداندا سەر لە زیندانییەك بدات کە ڕەژیم خۆی حاشا دەکات ئەو کەسەی گرتبێ؟! ئەمەیان سەبارەت بە "ئەحمەد توفیق"ـە کە مەلا عەولا دەڵێ لە زیندان سەری لێداوە! ئەگەرچی لەپێشدا دۆستایەتی یا پەیوەندییەکی ئەوتۆیان نەبوە، تا وەزیرێکی عیراق هان بدات بچێ سەر لە (کوردێکی ئۆپۆزسیۆنی ڕەژیمی شا) بدات!

ئینجا سەبارەت بە خودی زەبیحی، وەك فارس دەڵێ: ((شنیدن کی بود مانند دیدن))، بیستن کەی وەك بینینە، کاتێك دڵنیا بووین مەسەلەکەی سووك کراوە، دەنێردرێ بۆ (فزێڵیەی بەغدا)و لەوێ دەدرێ بە دادگا, ڕۆژی دیاریکراو لە (فزێڵیە)

ئامادە بووم، لیستی پێداویستەکانی لە پێخەف و قاپ و قاچاخ و ... هەرچی لە زیندان پێویستی پێ دەبێ بۆم ئامادە کرد. ڕۆژی حوکمی دادگا بە ماشێنی زیندان گەیشتینە دادگا، سەعات دووی پاشنیوەڕۆ دوو ساڵ حوکمیان بەسەردا سەپاند، دیسان بە ماشێنی زیندان گەڕاینەوە بۆ (فزێلیە)و لەوێوە بۆ زیندانی (ئەبوغرێب)، خۆم و ئەفسەرێکی برادەرم لەگەڵیان بووین تا تەسلیمی زیندان کرا، دوایی ئێمە گەڕاینەوە بۆ بەغدا. بۆ ڕۆژی دوایی کە بە ڕێکەوت (ڕۆژی چاوپێکەوتن) بوو، وا وێدەچوو ناڕەحەتە، بردبوویان بۆ قاوشێکی دووسەد کەسی، لەوێ زیندانیە کۆنەکان ناڕەحەتیان کردبوو. ئەو ڕۆژە لە ئەبوغرێب دەرنەکەوتم تا مەسەلەی قاوشێکی (دوو نەفەری)م بۆ جێبەجێ کرد. هاوبەشەکەی، ئەوجار کوردێکی سمێڵبابڕی چوارشانەی مەحکووم بە قەتل بوو، بەڵام لە بنەماڵەیەکی باش و ناسراو بوو، بەیەکەوە گونجابوون.

لە ماوەی ئەو (١٨) هەژدە مانگەی کە مامۆستا لە سیجنی (ئەبوغرێب) گیرابوو تا ڕۆژێك پێش دەرچوونی لە بەندیخانە، گشت (ڕۆژانی چاوپێکەوتن) خۆم و کوڕێکم لای ئامادە بووین، هەرچی داوای کردبێ بۆمان بردووە. بەڵام بەداخەوە لەو ماوە دووروودرێژەدا من نە مەلا عەولام چاوپێکەوتووە نە سکرتێری مەلا عەولا سەریان لە زەبیحی دابێ و نە مەنجەڵە یاپراخ کە بۆیان هێنابێ. هەروەها دەبێ بوترێ کە فەرموودەی ئەو زاتە بەڕێزانە کە گوتوویانە (بە مەنجەڵە چێشتەوە!) سەریان لە زەبیحی داوە، بەداخەوە ئەو قسانە تەنیا لە خانەی (درۆی پاش مردوو)دا نەبێ جێیان نابێتەوە!

سەبارەت بە مەنجەڵە یاپراخێ کە گوایە بەهۆی کاك "ئیبراهیم خۆشناو" بۆ زەبیحی ناردراوە، جێگەی داخە لە وتووێژێکی ئاوادا باسی ئینسانێکی زۆر بەڕێزو ڕۆشنبیر بەم وێنەیە بکرێ! باشە ئەگەر ئەم برادەرە ئاوایە کە باسی کراوە، کەواتە مەلا عەولا چۆن دەیەویست بیکا بە سکرتێری خۆی؟ بێگومان ئەم مەسەلەیە بە پێچەوانەی ئەوەیە کە گوتراوە، چونکە ئەم برادەرە مرۆڤێکی ڕۆشنبیرو نەجیبە، شایانی ئەوە نییە لەو کتێبەدا سووکایەتیی وەپاڵ بدرێ. زەبیحی خۆی ئەم برادەرەی باش ناسیبوو و زۆریش ڕێزی لێدەگرت!

لێرەدا پێویست بوو کاك عەلی ئاگاداری ئەوە بێ کە کتێبەکەی وەك مینبەرێکی ئازاد بۆ غەرەزی شەخسیی و تایبەت سوودی لێ وەرنەگیرێ!

* * *

له لاپەڕەی ١٧٧دا، مەلا عەولا باسی چوار هەزار دینار دەکات کە هی زەبیحی بووە، لە ماڵی ئێمە دزراوە. پێویستە ڕوونی بکەمەوە، ڕۆژێك پێش ڕزگاربوونی زەبیحی لە زیندان، دەمانویست ماڵەکەی خاوێن بکرێتەوە. دوو کرێکارم لەگەڵ خۆم بردبوو بۆ ئەم ئیشە. بە ڕێکەوت لەلایەن یەکێك لەم دوو کرێکارە بە سەختی بریندار کرام، تووشی نەزیفی داخیلی بووم؛ گەیاندیانمە نەخۆشخانەی تەواریو نزیك یەك مانگ لە خەستەخانە مامەوە. لەم کەین‌وبەینەدا مەبلەغێك پارەی زەبیحی دزرا، زەبیحی خۆی دەیگوت وەسڵی پارەکە سێ هەزار دینار بووە، دوو جار پارەی لێ دەرێناوە. بە حیسابی خۆی دەبێ دزراوەکە بەینی دووهەزارو حەوتسەد (٢٧٠٠) دینارو (٢٣٠٠) دووهەزارو سێسەد دینار بێ. ئیتر نازانم مەلا عەولا بۆ بە چوار هەزاری لەقەڵەم داوە؟ من دووهەزارو پێنجسەد دینارم بۆ زەبیحی گێڕاوەتەوە. کەچی دوای دووساڵ لە وتووێژێکی تر لەگەڵ بەڕێز پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفادا، کاك عەلی کەریمی جارێکی تر ئەو مەسەلەیە زیندوو دەکاتەوەو مەبلەغەکە هێندێکی تر زیاتر دەکاو ئەمجارە بە (٤-٥) چوارپێنج هەزار دینار لەقەڵەم دەدرێ، بێ‌ئەوەی ئەو پارەیەی کە بۆ خودی زەبیحی گەڕاوەتەوە، ئاماژەی پێ‌کرابێ!

جگە لەمە، دوکتۆر مەسەلەکە بە لەهجەیەك دەگێڕێتەوە وەك لە خودی خۆی، مامۆستا زەبیحی، بیستبێ کە گوایە ئەم پارەیە بۆ چاپی فەرهەنگەکە داندرابوو! بێ‌ئەوەی ئاگاداری ئەوە بێ کە ئەم مەسەلەیە ساڵی ١٩٧٥ ڕووی داوە، پاش بیست ساڵ میرزا عەلی کەریمی بۆ دوکتۆر عیزەدینی ڕازاندۆتەوە! پارەکەش بۆ چاپی فەرهەنگ دانەنراوە، ئەگینا زەبیحی لێی خەرج نەدەکرد. پارە بۆ چاپی فەرهەنگ لە ساڵی ١٩٧٠دا دەستەبەر کرابوو، پێش ئەوەی تەنانەت فیشەکانم دەس پێ‌کردبێ. ئەمە جگە لەوەی کە زەبیحی موحتاج نەبوو، لە یەکدوو جێگەی تر پارەی هەبوو. ئەوکاتە کە لە زیندانی ئەبوغرێب زیندانی بوو، من لە یەکێك لەم دوو برادەرە بۆ خەرجیی خۆیو هاوقاوشەکەیو کرێ‌خانوو، پارەم وەردەگرتو بۆم خەرج دەکرد.

ئاشکرایە ئەوانەی کە زەبیحی‌یان دەناسی، ئاگادار بوون پیاوێکی ڕاستگۆ بوو، سەبارەت بە هەق شەرمی لە کەس نەدەکرد؛ لەوانە نەبوو لای من بە جۆرێك باسی چەندوچوونی پارەکە بکاتو ئینجا لای دوکتۆر عیزەدین بە جۆرێکی ترو لای مەلا عەولا شتێکی تری گوتبێ، سەرباقی ئەوەش ناوی ئەو دووهەزارو پێنجسەد دینارە نەیەنێ کە بۆی ڕەت کراوەتەوە. ئەو خۆی لە سەرەتادا دەیگوت با باسی نەکرێ،

بەڵام ئەوە من بووم کە بۆ مەلا عەولاٌم گێڕاوەتەوە بە هیوای ئەوە کە وەزیرە دەستی دەڕوا، بەڵکی بتوانێ شتێك بکات تا پارەکە نەڕوات.

بێگومان کاك عەلی مەسئوولییەتێکی زۆری دەکەوێتە سەر ئەستۆ، چونکە ساڵی ١٩٨٢ هاتە لام، من هەرچی سەبارەت بە زەبیحی دەمزانی پێم گوتو دوایی ناردم بۆ لای مەلا عەولاٌ. باش وابوو بۆ مەسەلەی پارەکە جارێکی تر بگەڕێتەوە لام، پێم بڵێ مەلا عەولاٌ وا دەڵێ. ئەوسا منیش باری ڕاستی مەسەلەکەم بۆ ڕوون دەکردەوەو ڕاستیی مەسەلەکە باشتر دەردەکەوت.

ئەمما سەبارەت بەو ناوو ناتۆرانەی کە لە مەهابادو دەوروبەری وەشوێن زەبیحی کەوتبوو، باشە وەبیری بێنینەوە کە مەلا عەولاٌ بۆ ئەوەی هاوکاریی خۆی لەگەڵ حکوومەتی عیراق تەوجیە بکات، وای پێشان دەداو هەر واش بڵاوی دەکردەوە: زەبیحی، کە مامۆستای خۆیەتی! لەگەڵ بەعسییانەو زۆر لێیان نزیك بۆتەوە، بگرە پەیوەندیی هەیە بە کۆلیجی ئەمنی بەعسیەکانەوەو جاروبار محازەرەیان بۆ دەدا! لەولاشەوە بە هاوکارەکانی خۆی دەگوت کەسایەتێکی وەك زەبیحی کە مامۆستای خۆیەتی! هاوکاریمان لەگەڵ دەکات!

دەیویست ئا بەم جۆرە ناوی زەبیحی ناڕاستەوخۆ وەك ((عوونسوری خەتەرناکی بەعس بە خەڵك بناسێنی!))؛ جا ئەمەش عەفەویو لەڕووی نەزانیو نەفامیوە، یاخود عەمدیو بە مەبەستی بەدناوکردنی مامۆستا بێ! هەر ئەو پڕوپاگەندە ناپاکە بوو کە کاك حەمەدەمین سیراجیو هاوبیرانی، تەنانەت بۆ لەناوبردنی حامیدبەگی باوەجانی وەك (عامیلی سەر بە عونسووری خەتەرناکی بەعسی "زەبیحی")، بڵاویان دەکردەوە.

مەلا عەولاٌ لە لاپەڕە ١٧٢دا دەڵێ ((زەبیحی نەیهێشتووە کەس لە ڕەفیقەکانی ماڵی بزانن)). بێگومان ڕاست نییە، چونکە بەشی زۆری ڕەفیقەکانی ماڵیان زانیوەو هاتوچۆیان کردووە. تەنانەت ساڵی ١٩٦٥ کە برادەران لە ئێران گەڕابوونەوە، پاش ماوەیەك کە هاتن بۆ بەغدا، من خۆم ئەوساتە لە ماڵی ئەو بووم، نیوەڕۆ بوو، مام جەلالو شەهید عەلی عەسکەریو کاك حیلمی عەلی شەریفی ڕەحمەتیو چەند برادەری تر ڕاستەوخۆ وەژوور ماڵەکەی کەوتن. ئینجا دواترو پێشتریش بەردەوام برادەرەکانی هاتوچۆی ماڵیان کردووە؛ نەك هەر ئەوانە، بەڵکوو ئاشنایانی تریشی زۆر کات لە ماڵێ سەریان لێدەدا، وەك خوالێخۆشبوو کاك عومەر مستەفا، کاك عەبدوڵلا کانیمارانی، تەنانەت زۆر جار کاك ڕەفیقو شێخ جەبار هاتۆچۆی ماڵیان دەکرد. بەڵام ئەوەندە هەیە

لەپاڵماڵە ئاشكراكەیدا لە جادەی مەشتەل، ماڵێكی نهێنیی تریشی هەبوو بۆ كاتی مەترسی و لێقەومان. ئەم ماڵەیان، جگە لە خۆی و من، كەسی تر پێی نەدەزانی. كاتێ لە ئەبوغرێب زیندانی بوو، ناچار بووم ئەم ماڵەیان بگوێزمەوە بۆ شوێنێكی تر، بێئەوەی خۆی ئاگادار بێ تا كاتی ڕزگاربوونی. ئەوسا ئەم ماڵە تازەیەشم پێ نیشان دا. ئافرەتە خاوەن ماڵەكەم وا تێگەیاندبوو كە مامۆستا لە هەندەرانە. ئەمما سەبارەت بەوەی كە چەند (ناو)ی هەیە، جگە لە ناوی "عەبدوڕەحمان زەبیحی"و "بێژەن"، لە زۆر جێگەی بەغدا بەناوی "قادر"یش ناسرابوو.

* * *

یووسفی ڕێزوانی "عەبدوڵڵا شلێر" كە زۆر دۆستو ئاشناو نزیكی مەلا عەولا بوو، لە نامەیەكدا بۆ كاك عەلی كەریمی باسی ئەوە دەكا كە مەلا عەولا سەبارەت بە عەبدوڕەحمان زەبیحی ئاگادارییەكی زۆری هەبوو، بەڵام نەیدەوێرا بیدركێنێ. جگە لەمە، لە چەند جێگای تر ئەم باسە لەگۆڕێیەو پرسیار دەكرێ كە زەبیحی خۆی پێی خۆش نەبوە بگەڕێتەوە بۆ ئێران و ئەو هەولانەی لەو لایەنەوە دراون سەرنج ڕاكێشن! چونكە ئەو گونجانی خۆی لە كوردستانی عیراقدا بەلاوە باشتر بووە لە گەڕانەوە. تۆ بڵێی ناچار كرابێ؟! یا نائومێدی لە ژیاندنەوەی (ژ. ك) بەو حاڵەی بردبێ؟ ئینجا بەجێهێشتنی تەنیای مامۆستا لە هەولێر، ئەویش خۆی پرسیارێكی تر زەق دەكاتەوە، چونكە مەلا عەولا وەك وەزیرێك یا كارمەندێكی سەر بە حكوومەت دەیتوانی بەهۆی دەستوپێوەندی لەناو حەفلەكەشدا ئاگاداری وەزعەكە بێ و بزانێ چیی بەسەر دێت؟! هەروەها بڵاوكردنەوەی دەنگۆی وەك (لە سلێمانی بینراوە!)، یا چووە بۆ ئێران و لای هەژار مردووەو لە (كەرەج) تەعزیەیان بۆ داناوە ... ئەوانە گشتی، ئەوە دەگەیەنێ: تا لەوكاتەدا كە دەگیرێ خەڵك نەڵێ لە ماڵی مەلا عەولا گیراوە یا ئەو ئاگای لێ بووە. هەروەها بڵاوكردنەوەی هەواڵی درۆی وەك: ((نامەی مام جلال یا كاك نەوشیروان لە گیرفانیدا گیراوە!))، ئەوانە گشتی بۆ شوێنەونكە بووەو گومانی خەڵكی زیاتر كردووە، چونكە وێدەچێ مامۆستا پێش ئەوە، هەر كە لە ماڵی مەلا عەولا دەرچووە، گیرابێ و بۆ شەو بردبێتیانەوە بۆ ماڵەكەی خۆی، ماڵەكەشیان چۆڵ كردبێ. بەڵام مامۆستا شێخ جەلال كە بێگومان ئاگادار بووە مامۆستا عولەما گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا، لە وەڵامی نامەی مەلا عەولادا نووسیبێتی مامۆستا زەبیحی چووە بۆ تاران! من مەسەلەی نامە بەڕاست نازانم.

ئینجا پێم وایە پێش گەیشتنی زەبیحی، دەبێ مەلا عەولا لەلایەن موخابەراتەوە هۆشیار کرابێتەوە کە بەرێوەیەو ئەمجارە دەبێ بگیرێ! کاك ڕفیق پشدەری لە یەکێك لەو کتێبانەیدا کە بڵاوی کردۆتەوە، باسی شتێك دەکا کە ڕاست یا ناڕاست شایانی لێوردبوونەوەیە:

((ساڵی ١٩٧٥ کە زەبیحی لە بێرووت دەگەڕێتەوە، بەیانی زوو ڕەفیق بە شوێنیدا دەچێ کە بیبا بۆ ئەمن. بەڵام پێش ئەوەی لە ماڵی زەبیحی دەربچن، ڕەفیق پێی دەڵێ: ئەوا من دەتبەم بۆ ئەمن، وێدەچێ لەوێ بتگرن، خوا دەزانێ چیت لێ دەکەن؟! جا باش بیر بکەوە. ئەگەر دەتەوێ ڕابکەی بۆی دەرچی؟! ئەوا "کەمال"ی برام لە سنووری (بەمۆ)یەو چاوەڕێیە. من خۆشم ئامادەم هاوڕێتان بم!)).

لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێش: کە مەلا عەولا لەپێشەوە زانیویەتی زەبیحی دەگیرێ، ئایا نەدەکرا بە جۆرێك هۆشیاری بکاتەوە تا خۆی دەرباز بکاو بۆی دەرچێ!؟ بەڵام بۆ نەیکرد!؟ ئایا ئەوەندەشی پێ نەدەکرا؟!

**دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ:**

کاك عەلی کەریمی لە (ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی)دا وتووێژی لەگەڵ دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ سەبارەت بە پەیوەندیەکانی لەگەڵ مامۆستا عولەما ئەنجام داوە. ئەگەرچی ئەم وتووێژە لەخۆیەوە کورتە مێژووی بەشێکی گرینگی ژیانی ماموستا "زەبیحی"یە، بەڵام بەداخەوە لە چەند جێگە ئاگاداریەکانی دوکتۆر کەموکوڕییان تێدا بەرچاو دەکەوێ. بۆیە بەپێویستم زانی تێبینیەکانی خۆم سەبارەت بەم کەموکوڕیانە تۆمار بکەم، شایەد توانیبێتم لەم کەلێنەوە خزمەتێکم بە مێژووی ئەو سەردەمەی گەلەکەمان کردبێ.

لە لاپەڕە (٢٣٨)دا سەبارەت بە هاتنی زەبیحی بۆ عیراق نووسیویەتی: ((کە هات یەکسەر چوو بۆ ماڵی شێخ لەتیف، ئەوە بوو ساڵی ١٩٥٠ وەزعی ئەوانیش تێك چوو)).

بەڵام باری ڕاستی هاتنەکەی بۆ عیراق بەم جۆرەیە: زەبیحی، دوای تێکچوونی کۆمار، لەگەڵ برادەرێکی هات بۆ کوردستانی عیراق. هەر لە سنوورەوە خۆی تەسلیمی کاربەدەستانی عیراق دەکات. حکوومەتی عیراق دووری دەخاتەوە بۆ شاری (ناسریە). من ئێستا هەر لە مەهاباد بووم. لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٧دا نامەیەکی ئەوم لە (ناسریە)وە پێگەیشت، ناوەڕۆکی ئەو نامەیەم بەر لە ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕین لە

جێگەی تر باس کردووە. دوای ئەمە لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٤٧دا هەواڵم پێگەیشت کە ماموستا زەبیحی لە (ناسریە) ڕای‌کردووەو لە دێی (سیتەك)ی شاربازێڕی کوردستانی عیراق لای "شێخ لەتیف"ی حەفید گیرساوەتەوە. وابوو لەگەڵ کاك غەنی بلووریان سابلاغمان بەجێ‌هێشت و ڕۆژی نەورۆزی ساڵی (١٣٢٧)ی هەتاوی (١٩٤٨/٣/٢١ی میلادی) لە شارۆچکەی (خەلان)ی سنووری کوردستانی عیراق بووین. دوای ئەمە لە سەرەتای مانگی نیسانی ١٩٤٨دا لە سیتەك لای ماموستا زەبیحی بووین.

ئینجا دوکتۆر لە جێگەیەکی تردا سەبارەت بە چاپی (ژمارە ١٠)ی "نیشتمان" نووسیویەتی: ((چاپخانەیەکی پارتی لای شێخ لەتیف مابوو کە زەبیحی ژمارەیەك "نیشتمان"ی پێ دەرکردووە)). سەیرە، دوکتۆر هەمیشە سەرۆکاری لەگەڵ چاپ و چاپەمەنی و ئەو جۆرە شتانەیە، لێرەدا (ئالەتی تابیعە)و (ئامێری چاپی) لەیەك جیانەکردۆتەوە! ئەوەی دوکتۆر باسی کردووە، ئالەتێکی تابیعەی پەککەوتوو بووە کە لەگەڵ ئامێری چاپ جیاوازیی زۆرە. ئەوکاتە کە دوکتۆر باسی کردووە، ڕاستە پارتی دوو ئالەتی تابیعەی هەبوە، یەکیان ئەمەی لای ماڵی شێخ لەتیف کە ئەگەر ساغیش بایە بۆ چاپی "نیشتمان" نەدەبوو، ئەوی تریان لە بەغدا بوو.

بەڵام ئەو ئامێرە کە ژمارە (١٠)ی "نیشتمان"ی پێ چاپ کراوە، ئامێرێکی چاپی ژیکەڵە بووە کە بۆ ئەووەڵ جار لە مێژووی چاپ و چاپەمەنیی کوردستاندا محەمەدی شاپەسندی دروستی کردووە. بەڵێ، ئەم ئامێرە من لە ماوەی یەك مانگدا لە دووکانی "شێخ حوسێنی ئاسنگەر" لە سلێمانی دروستم کردووەو "هەژار"ی ڕەحمەتی لە (چێشتی مجێور)دا و کاك غەنی بلووریان بە دووورودرێژی لە (ئاڵەکۆك)دا باسیان کردووە. هەروەها (حرووف) بۆ ئەم ئامێرە لەلایەن خوالێخۆشبوو شێخ لەتیف و عەبدوڕەحمانی زەبیحی لە بەغدا دەستەبەر کراوە؛ ئەگەرچی لە وەڵامی نامەیەکی کاك عەلی کەریمی بۆ کاك غەنی بلووریان، کاك غەنی خۆیشی بە هاوکار دادەنێ لە دروستکردنی ئامێرەکەدا، کە بێگومان ئەمەش خیلافی واقیعە. ئینجا لەوەش سەیرتر، ئەوەیە کە نازانم بۆ زەبیحی، بەو هەموو چاوتێرییەی خۆیەوە لە ماڵی دنیا، مەسەلەی پارەکەی کە دزراوە بە ئاب‌وتابەوە بۆ دوکتۆر باس بکات! بەڵام باسی دروستکردنی ئامێری چاپ نەکات کە لە تاریخی چاپ و چاپەمەنیی کوردستاندا بێوێنەیە؟! هەروەها ئەمەش دیسان جێی پرسیارە، کێ بڕوا دەکات زەبیحی

دووهەزارو پێنجسەد دیناری بۆ بگەڕێتەوە، بەڵام لە دوکتۆری بشارێتەوەو ناوی نەهێنێ؟! بێگومان ئاشکرایە کە کەسایەتیی شەخسی زەبیحی لەم وتووێژەدا ئامادە نەبوە، ئەمە کاك عەلی کەریمی‌یە کە مەسەلەکەی بە باشی‌و تەواوی‌و بارودۆخێ کە تێیدا ڕووی داوە ((لغاية في نفس يَعقوب)) بۆ دوکتۆر نەگێڕاوەتەوەو دوکتۆری تووشی ئەم ئیشتیباهە کردووە.

دوای چاپی ژمارە ١٠ی "نیشتمان"و گەڕانەوەی لەناکاوی میرزا غەنی بۆ مەهاباد، هێندێك گیروگرفتمان لەگەڵ سەرکردایەتیی پارتی بۆ پەیدا ببوو. مەسەلەکەش تەنها لە جیاوازیی بۆچوونەکانی مامۆستا هەمزەو "عەبدوڕەحمانی زەبیحی"دا بوو، کە عولەما ئامادە نەبوو لە هەموو جێگەیەکی کوردستاندا خۆی بە (میوان) دابنێ‌و مامۆستا هەمزەش چاوەڕوان بووە سنوورێك بۆ ئیختیارات‌و هەڵسوکەوتی دیاری بکات!! دوای ئەمە لە خەیاڵی ئەوەدا بووین خۆمان بۆ چاپی ژمارەیەکی تری "نیشتمان"، یانی بۆ ژمارە ١١، ئامادە بکەین؛ ڕۆژێك مەلا عەلیی سەرکاری شێخ لەتیف لە (سیتەك) لێمان وەژوور کەوت‌و گوتی: ((کوڕینە! دەزانن حکوومەت بە باشی ئاگادارە کە ئێوەی ئێرانی لای "شێخ لەتیف"ن‌و چالاکیی سیاسیتان هەیە!؟)). ئێمەش کە ئەوەمان زانی، هەر زوو بۆ ئەوەی شێخ تووشی کێشە نەبێ، بڕیارمان دا (سیتەك‌و سلێمانی) بەجێبێڵین. پاش شاردنەوەی ئامێرەکەو گشت کەرەسەو ئەسبابی سەرنج ڕاکێش، من، بەڵێ تەنیا خۆم، ڕۆیشتم بۆ کەرکووك. لەوێ سەرم دا لە سەید ئەحمەدی کوڕی سەید تەها، لەلای ئەو تەسکەرەیەکم دەس کەوت بەناوی "عەدۆ سمۆ"، واتا "عەبدوڵلا ئیسماعیل". بۆ ڕۆژی دوایی لە بەغدا بووم‌و هەر ئەو ڕۆژە بەهۆی ناسیاوێکی کۆنی سابلاغی‌و تاجرێکی (جوولەکە) لە جادەی ڕەشیدی بەغدا (باب الآغا)، لە جەریدەی یەحیا قاسم "الشعب"و جەریدەی "الامة" بە نانەزگی دامەزرام. ئەگەرچی زمانی عەرەبی شارەزا نەبووم، بەڵام دەمتوانی ئەرکی خۆم جێبەجێ بکەم.

دوکتۆر لە لاپەڕە (٢٤٩)دا باسی شێخ لەتیف‌و زەبیحی دەکات، کە ((سەبارەت بە گیرانی مەلا عەلیی سەرکاری شێخ، ورتەورتیان بووە)). ڕاستە، ئەم مەلا عەلی‌یە خەڵکی کولتەپەی سەقز بوو، جگە لەوەی کە سەرکاری شێخ لەتیف بوو، لە هەمان کاتیشدا کارمەندی دایرەی ئیشغال بوو. پاش شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ و ڕووخانی ڕەژیمی پادشایی‌و زیندانیکردنی گەورەپیاوانی ڕەژیم، "مەلا عەلی"شیان

به تۆمەتی (پەیوەندی به دەزگای ئیستخباراتی ئینگلیزەوە) دەسگیر کردو خستیانه زیندانەوە. له زیندان، لەبەر ئەوەی زۆربەی زۆری زیندانیەکان دەیانناسیو ناسراو بوو، کردیان به چایچیی زیندانو یارمەتیشیان دەدا، تا ڕادەیەك بووژابۆوەو بگره خەرجیی ماڵو منداڵیشی دەناردەوە. من بەهۆی خەسوویەوە "باجی خانم" خێزانی سەیدە گوڵەی ئەفسەری کاتی کۆمار، تێکەڵیی خێزانیمان هەبوو، ئاگاداری وەزعی بووم. دوای ماوەیەك، پاش لێپرسینەوەکی زۆر، پێش ئەوەی "مەهداوی" محاکەمەی بکات، دەرکەوت بێگوناهە، ئازاد کراو گەڕایەوە ناو ماڵو منداڵو سەر دایرەکەی.

ئەم برادەرە، کاتی شۆڕشی تەممووزو پاش شۆڕشیش، پیاوەتیو چاکەی زۆری هەبوو بەسەر گشت ئەوانەی دوای کۆماری کوردستان ڕوویان دەکردە کوردستانی عیراقو بەتایبەت سلێمانی. هەروەها تا بڵێی به ئێمەوە، به زەبیحیو هەژارو قزڵجیو شاپەسندیو حەیدەریو ئەوانەوە، ماندوو بوو؛ ماڵو منداڵی به برسێتی دەهێشتەوە بۆ ئەوەی ئێمه تێر بین. سەفەری زەبیحی بۆ سووریا، هەر ئەو مەلا عەلیيه گەیاندیه مووسڵو لەوێوە بەڕێ کرا بۆ سووریا.

## مامۆستا عەبدوڕەحمان زەبیحی
## له وتووێژی عەلی کەریمیو مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەددا

عەلی کەریمی دەربارەی چوونی مەلا مستەفاو بارزانیەکان بۆ کوردستانی ئێران پرسیار دەکا، دەڵێ وابزانم لەپێشدا بەباشی قەبووڵ نەکرا؟ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد: له لاپەڕە ٢٧دا دەڵێ: وەك جاسووس سەیر کرا؟!

ئەم وەڵامەی مامۆستا سەبارەت به حکوومەتی سۆڤیەت زۆر ڕاستە. بەڵام گەلی کورد له ئێران به چاوێکی جیاوازەوە سەیری مەلا مستەفایان دەکرد. ئەمە تەنیا ڕەئی سۆڤیەت بوو. ئەوان بوون که له هەموو شتی عیراق، ئینسانی عیراق، داروبەردی عیراق دڕدۆنگ بوون، وایان دەزانی ئینگلیز دژی لەشکری سوور ئەوانەی ناردووە بۆ ئێران. ئەمە له حاڵێکدا بوو که قازی محەمەد پێویستی به هاوکاریی لەشکری بارزان هەبوو، کەلێنێکی له بەرەکانی شەڕ بۆ پڕ بکاتەوە. لەلایەکی تریشەوە، شووڕەوی نەیدەویست قازی محەمەد ئەوەندە بەهێز بێ بتوانێ له بەرامبەر خواستەکانی ئەوانو ئازەربایجاندا قەد بەرز بکاتەوەو ببێ به کۆسپ. بۆیه لەم لایەنەشەوە شووڕەوی هاتنی بارزانییان بۆ کوردستانی ئێران به دژی سیاسەتی خۆیان لێك دەدایەوە!

باقرۆف سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی ئازەربایجان هەر لەسەرەتاوە مەلا مەستەفای خۆش نەدەویست، ئەگەرچی سەید عەزیز شەمزینی دەڵێ: ((یەکێتیی سۆڤیەت لە بەهاری ١٩٤٧دا بارزانیەکانی بە پەنابەری سیاسی وەرگرت، ل٢٢٨))، بەڵام بەداخەوە باسی ئەوە ناکات کە باقرۆف چیی بەسەر بارزانیو بارزانیەکاندا هێنا؟! هەروەها دوکتۆر شەمزینی لە ل٢٨٨دا دەڵێ: ((پێشمەرگەکانی عیراق، واتا بارزانیەکان، بەقسەی قازی محەمەدیان نەکردو خۆیان بەدەستەوە نەداو چەکیان دانەنا ...)). بەداخەوە دیسان لەڕاستییەوە دوورە، نازانم چۆن جێی باوەڕە قازی محەمەد ئاڵای کوردستان بسپێرێ بە بارزانی، لە هەمان کاتیشدا داوای چەکدانانی لێ بکات!؟

بەداخەوە لە کتێبەکەی "دوکتۆر شەمزینی"دا لەم بابەتانە زۆرن کە ناڕەوا گشت کەموکوڕیەکانی سیاسەتی نادۆستانەی شووڕەویی خستۆتە ئەستۆی حکوومەتی کوردستانو شەخسی قازی محەمەد. سەبارەت بەمە، پێشەوا لە زینداندا دەڵێ: ((حکوومەتی ئێران زۆر هەوڵی دا تا نامەیەك بۆ بارزانیو پێشمەرگەکانی بنووسینو داوایان لێ بکەین چەك دابنێن! بەڵام بە قسەمان نەکرد تا بارزانیەکان درێژە بە جەنگ بدەن. (نهێنیەکانی موحاکەمەی قازی محەمەدو یارانی، ل٥٨).

لە لاپەڕە (٢٩٠)دا مامۆستا برایم باسی پارەیەکی (١٥-١٦) هەزار دیناری دەکا کە لای زەبیحی بووەو ئەویش لای کابرایەکی تری داناوەو بەشی زۆری خوراوەو تەنیا (پێنج- شەش) هەزاری دەس کەوتۆتەوە. دوایە مامۆستا ڕوونی دەکاتەوەو دەڵێ: ((ئەمە لەکاتێکا بووە کە جەماعەت ویستوویانە حزبێکی تازە بەناوی "شۆڕش"ەوە دروست بکەن. یەکێك لەوانە دەڵێ: لەو حیزبە تازەیەدا بێگومان مامۆستا برایم بە سکرتێر هەڵدەبژێردرێ، بۆیە حەق دەدا بە خۆی ئەو پێنجشەش هەزار دینارەی کە ماوە، بۆ ئەو بێ! زەبیحی ڕازی نابێو پارەکە دەگێڕێتەوە بۆ مامۆستا لە لەندەن)).

بێگومان هەر دەبێ بەهۆی تێداچوونی نزیکەی دەهەزار دینار لەم پارەیە بووبێ، وەك مامۆستا باسی دەکا: ((زەبیحی ویستبێتی خۆی بکوژێ!)). بەداخەوە جاری وایە مرۆڤ هەرچەندە بلیمەتو هۆشیارو زیرەك بێ، لە بەرانبەر ڕووداوی تاڵو نالەبارو چاوەڕواننەکراودا خۆی بزر دەکاو سەری لێ دەشێوێو تووشی هەڵەی گەورەتر لە ڕووداوەکە دەبێو زیاتر بە زیانی تەواو دەبێ! مەسەلەی خەیاڵی خۆکوشتنی زەبیحی شتێکی ئەوتۆ دەبوو کە بێگومان بە دەیان وێنەی ناشایست تەئویلو تەفسیری بۆ دەدۆزرایەوە!

نازانم بۆ دەبێ پیاوێکی وەك زەبیحی بیر لە خۆکوژی بکاتەوە؟! لەحاڵێکدا دەیتوانی بەو پارەیەی کە بۆ چاپی قامووس دانرابوو، هەروەها لەگەڵ ئەو بڕە پارەیەی کە لای دوو برادەری هەیبوو، مەسەلەکە چارەسەر بکات؛ ئەگەرچی بەڵێنی دابوو پارەی قامووسەکە بۆ هیچ شتێکی تر خەرج نەکاتو لەوەش دەترسا ئیتر بەم زوانە نەتوانێ قامووسەکە چاپ بکات. بەڵام ئەوەندە هەیە خۆ لە سومعەی خۆیو ژیانی خۆی گرینگتر نەبوو، دەیتوانی بە بێدەنگی پارەی حیزب پڕبکاتەوەو ئەوسا بە سەربەرزی لەو گێچەڵە ڕزگار دەبوو. دڵنیام زۆری پێ نەدەچوو مەسەلەکە هەر ئاشکرا دەبوو، مامۆستا برایمو برادەران پێیان دەزانی، ئەوکاتە کامەیان قەبووڵیان دەکرد زەبیحی بە پارەی چاپی فەرهەنگو پارەی تایبەتی خۆی تاوانی ئەم زیانە بژمێرێ؟! ئەوکاتە پارەکەی بۆ دەگەڕایەوەو مەسەلەکەش بە قازانجی سومعەی ئەو کۆتاییی پێ دەهات.

مەسەی دزران یا تێداچوونی پارەی (ئەمانەت) لای زەبیحیو من وەك یەك وابوو، جیاوازیەکە لەوە دابوو هینەکەی من لەکاتێکدا ڕووی دابوو کە خۆم بە برینداری لە خەستەخانە کەوتبووموماڵەکەمان چۆڵ بوو، ئەگەرچی زەبیحی خۆشی ناڕاستەوخۆ کاریگەریی هەبوو لە دزینی پارەکەدا. لەسەر ئەوەشڕا، سەرم بۆ کەس شۆڕ نەکردو ئەوەندەی زەبیحی خۆی گوتبووی داومەتەوە. بەڵام پاش ٢٧ ساڵ بە زیاد لەقەڵەمدانی مەبلەغی پارەکە، لەلایەن کاك عەلی کەریمیی خوارزای زەبیحییەوە، نازانم دەبێ مەبەستی چی بێ؟! ئەگەر مەبەستی پارەی ترە، ئامادەم بیدەمێ. ئەگەر مەبەستی تری هەیە، منیش بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر ئامادەگیی زیاتر لەخۆمدا دەبینم؟!

### پروپاگەندەی پەیوەندیی مامۆستا عولەما
### بە جیهازە ئەمنیەکانی ڕەژیمی پێشووی عیراق

بە پێچەوانەی هەرچی ناحەزان لەم بارەوە بڵاویان کردۆتەوە، پێش هەموو کەس هەر خۆیان باشتر ئاگادارن کە ڕابردووی بێپێچ‌وپەنای خەباتی ئەم کەسایەتیە کوردە خەباتگێڕە، زۆر لەوە پتەوترو پاكو خاوێنترە کە ئەم زاتانەی دەیانەوێ (دەستی چەوری) خۆیان دەسەری ئەمو ئەو هەڵسوون! .

بەڵێ، ئەم خەباتگێڕە نەبەزەی کە ئەمڕۆ ئەم تاوانە شوومانەی (بەعسیبوون) یا (نزیکبوون) لە ڕەژیمی بەعسی وەپاڵ دەدرێ، تا دوێنێ لە سێ پارچە لە چوار

پارچەی کوردستاندا ئاسەواری خەباتی وەك ڕۆژ بەدەرەوە بوو. سەرچاوەو خاوەنی ئەم قسانە کە هەر ئەوکاتە خۆی بە شاگردو قوتابیی عەبدوڕەحمان زەبیحی لەقەڵەم دەدا، لە هەمان وتوویژدا، هەر خۆی ئەم قسانە وەدرۆ دەخاتەوەو وا پیشان دەدا ئەم قسانەی وەك تاریفکردنی بلیمەتی و زیرەکیی زەبیحی لە دەمی ترازابن، چونکە کاتێك کاك عەلی کەریمی لێی دەپرسێ:

ماموّستا ((بۆ، زەبیحی ئەندامی حیزبی بەعس بوو؟!))

مەلا عەولا: ئەندامی کێ بووبێ؟ چی؟! بەعسی بووبێ؟!

لا، لا، زەبیحی گەلەك لەوە بەرزتر بوو ببێتە ئەندام و شتی وا!

نەخێر عەرزت ناکەم محازەرەو شتی وایان پێدەنووسی. ئەدی بۆ بچێتە کولییەی ئەمنی قەومی؟! کە بچێ محازەریان بداتێ!

دوایی مەلا عەولا دەڵێ: ((تەماشام دەکرد هێندێك شتی خراپ بوو، دەمگوت کاکە ئەوە نەزەرێکی ترت لێ وەردەگرن، ئەوە بگۆڕە ... لەوانە داخی گرانم ئەو پیاوە ورد نەبوو، ئەو پیاوە بە حوسنی زەنێکی سەیر لەگەڵ ئەوانە ئیشی دەکرد! وایدەزانی ئەوانە برادەرن، ئەمنیش دەمگوت: مامۆستا ئەوانە برادەری ئێمە نینە، دوایە تۆ دەبێ وریابی لەخۆتەوە خۆت لە زمان نەدەی)). (ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی، ل١٨٦)

ئەمەی کە مەلا عەولا وەك نزیکبوونی زەبیحی لە ڕەژیمی کۆنی بەعسی عیراق باسی دەکا، بێگومان ئەوکاتەیە کە لەگەڵ ژانراڵ مەحموودی پەناهیان و چەند لایەنێکی تر لە بەرەیەکدا هاوکاریمان دەکرد. ئەوکاتە ئامادەکردنی کەرەسەی پێویست بۆ ڕۆژنامەی "راه اتحاد" و (ڕادیۆی شۆڕشگێڕانی ئێران) ئەرکی سەرشانی مامۆستا عولەماو کاك حەمەدەمینی سیراجی بوو. بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە، زۆر جار زەبیحی ناچار دەبوو لە ماڵەکەی خۆی یا لە ماڵی مەلا عەولا هەر خەریکی نووسین بایە. بەڵام زەبیحی لەزووەوە ئەمە عادەتی بوو: کاتی نووسین و سەرقاڵی ئەگەر برادەرێك، دۆستێك لێی پرسیبا ((ئەوە مامۆستا خەریکی چیی؟!)) هەر جێبەجێ لەپاڵ خۆیدا تووڕە دەبوو، یا وەڵامی نەدەدایەوە، یا وەڵامێکی وەهای دەدایەوە کابرای گێژ دەکرد. جا زۆر وێدەچێ مەلا عەولا وای بیر کردبێتەوە کە ئەوانەی وا مامۆستا زەبیحی کاریان لەگەڵ دەکا، بۆ بەعسییان کاربکەن و لەوان بن. ئەوجار سەیر لەوەدایە مەلا عەولا دەڵێ مامۆستا محازەرەکانی نیشان دەدام!

وێدەچێ ئەمە بە بۆچوونی مەلا عەولا بێ، بەڵام ئەگەر وا نەبێ، پێش هەمووشتێك کێ باوەڕ دەکا حیزبی بەعس ئەوەندە ساویلکەو سادە بێ، بەو هەموو دەزگا ڕۆشنبیریانەوە، بەو هەموو کادرە زانایانەوە، ڕوو بکەنە یەکی وەك مامۆستا عولەمای نەتەوەپەرستی هاوکارو هاوبیری مامۆستا برایم ئەحمەدو مام جەلال و سەرکردایەتیی یەکێتی، کە بەعس بە دوژمنی سەرسەختی خۆی حیسابیان بۆ دەکا؟! جا نازانم کێ باوەڕ دەکا هاوکارو هاوڕێیەکی ئەم دوانە (بەعسی) بێ؟! جگە لەوانەی کە ئاسۆی بیروباوەڕی (حیزبایەتییان) لە هی (کوردایەتی) پان و بەرینتر بێ!

* * *

لە لاپەڕە (٣٦٠)ی (ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی)دا، کاك عەلی لە مامۆستا شێخ عیزەدین دەپرسێ: ((بۆچی مامۆستا زەبیحی دوای کۆمار لەگەڵ کوردی ئێران هەر نەدەگونجا، هەر ئیشی نەکرد؟)).

کاتی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ عەبدولکەریم قاسم و لێشاوی کوردی ئێران بۆ عیراق، عەبدوڕەحمانی زەبیحی بەڕاستی دەیەویست جارێکی تر هەوڵ بدا بۆ ژیاندنەوەی کۆمەڵە یا دەستی کەم بووژاندنەوەی حیزبی دیموکراتی کوردستان. بەڵام بەداخەوە لێرەشدا سەرکەوتوو نەبوو. مەسەلەکە بەو جۆرەی کە ئەو لە مێشکی خۆیدا گەڵاڵەی کردبوو و بەرنامەی بۆ دانابوو، وا دەرنەچوو. حیزبی دیموکرات پارچە پارچە ببوو، حیزبی توودە وەك (مۆرانە) گەرای تێدا دانابوو. زەبیحی لەوماوەیەدا لەگەڵ یەك‌یەکی ئەوانەی خۆیان بۆ ڕێبەرایەتیی حیزب بە موناسبترین کەس دانابوو! دیدارو کۆبوونەوەی ئەنجام دا. تەنانەت لەگەڵ کادرەکانیش کە هەر کەسە ٢٠-٣٠ کەسی بە لایەنگری خۆی لەقەڵەم دابوو، ئەوانەش بەو جۆرەی کە زەبیحی داوای دەکرد ئامادەی هاوکاری نەبوون، ئەوسا (توودایەتی) زیاتر باو بوو!

لە کادرەکانی ئەو سەردەمە، ئەوە شەهید قادر شەریف کە ٢٠-٢٤ کەسی بەدەورەوە بوو. ئەوە کاك "کاوە مارەغەنی"، ئەوە مامۆستا شێخ ڕەشیدو ئەوە ... ئەمانە هەموویان زۆر بەڕێزەوە هاتوچۆی ئێمەیان دەکردو پرس‌وڕایان بە مامۆستا دەکرد، ئەویش بە هەموو بارێکدا یارمەتیی دەدان، بێئەوەی چاوەڕوانییەکی لێیان بێ. ئیتر لەوکاتەوە پێی خۆش نەبوو لەگەڵ هیچ کەس لە کوردی ئێران باسی ئەو جۆرە شتانە بکا! تەنانەت کۆمیتەی شۆڕشگێڕ کە هاتن بۆ بەغدا، هەرچەند زۆر

بەتوندی تەنبێ کرابوون کە چاویان بە هیچ کەس لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو بەتایبەت زەبیحی نەکەوێ، بەڵام پاش نوێژێك کاك سمایل شەریفزادە وەژوور کەوت، تەنیا من لەماڵەکەی زەبیحی بووم. دوایەش زەبیحی هاتەوەو تا ئێوارە تێروپڕ قسە کراو زەبیحی ڕەئی خۆی بۆ ڕوون کردەوەو درەنگ وەختێك کاك سمایل خواحافیزیی کردو بەرەو کوردستان گەڕایەوە. عەیبی کاری ئەم کۆمیتەیە ئەوە بوو درەنگ گەڕانەوە بۆ ئێران، دوژمن هوشیار ببۆوەو ئامادەکاریی خۆی کردبوو.

## گەڕانەوەی مامۆستا عولەما بۆ مەهاباد

مەسەلەیەکی سەرنجڕاکێش لە گەڕانەوەی "زەبیحی"دا بۆ ئێران، ئەوەیە کە کێ هانی دەدا یا ناچاری کردبوو بۆ گەڕانەوە؟! چونکە وا دیار بوو خۆی نەیدەویست بگەڕێتەوە، پێی دەڵێن: مامۆستا ئیتر هیچ پاساوێك (مبرر)ت نەماوە بۆ چوونەوە، وەڵام دەداتەوە ((من بیروباوەڕی خۆم هەیە، ئەو برادەرو دۆستانەی هەمبوون، یا ئاوارەی وڵاتانن، یا تاقولۆقیان ماون. ئەوانەی ئێستا لە ساحەی کوردایەتیدان، لەگەڵ من دۆستایەتییان نییە، ئەوەندە خۆشیان ناوێم. لەبەر ئەوە من بیروباوەڕی خۆم هەیە، ڕەنگە بە کارەکانی ئەوان ڕازی نەبم. حەزیشم زیاتر لێرەیە، دوایە فەرقی ئێران و عیراق نییە، بۆ من هەریەکە. ئەو ئیشەی کە لێرە دەیکەم، هەر عەینی ئەوەیە کە لەوێ دەیکەم)). بە هەرحاڵ وازیان لێ نەهێنا، مامۆستا عولەمایان خستە سەر ئەوەی بگەڕێتەوە! بەڵام زۆر نارەحەت بوو بە گەڕانەوە!! (ل١٦٧-١٦٨).

مەلا عەولا ئەگەرچی وا پیشان دەدا کە پێی ناخۆشە بگەڕێتەوە، بەڵام بەبۆنەی ڕازیبوونی بۆ گەڕانەوە، میهمانییەکی باش دەکا، کە کەسایەتێکی زۆری کوردی دانیشتوانی بەغدا: وەك بابەکر ئاغای پشدەری، مامۆستا عەونی یووسف، شێخ عەزیز شەمزینی، کاك کەمال مفتیو ... دەعوەت دەکا. ئەمجار ئەم کەسایەتیانە هەر کەسە نۆرەی خۆی ڕۆژێك مامۆستایان دەعوەت کردووە، بەو حیسابەی مامۆستا بگەڕێتەوە بۆ ئێران!! ((بەڕاستی مامۆستا زۆری حەز لێ نەبوو، مەلا عەولاش ئاگادارە)).

گوایە شێخ لەتیف بەرزنجی تا سنوور لەگەڵی دەبێ (ل١٦٨، ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی). وا دیارە لە گەڕانەوەدا مسوەدەکانی قاموسەکەیو زۆری لە کتێبەکانی لەگەڵ خۆی بردبێتەوە بۆ مەهاباد، چونکە باس کراوە پڕی ماشێنێك کتێبو ئەو جۆرە شتانەی لەگەڵ خۆی بردۆتەوە!

* * *

هاوكات لەگەڵ گەڕانەوەی زەبیحی بۆ ئێران، ڕۆژێك لە (شێنێ) مام جەلال بە شێخ عیزەدین دەڵێ: ((پێم خۆشە مامۆستا زەبیحی بێتە ئێرەو دەفتەرێك دانێو دەفتەرەكە ویسعەت پەیدا بكا لە كوردستاندا، ئەویش ببێتە سازمانێك، ئەمما وەك دەفتەر))، ل٣٤٥.

مامۆستا شیخ عیزەدین دوای سەرنەكەوتنو نەهاتنەدیی ڕەغبەتەكەی مام جەلال، لە وتووێژێكدا دەڵێ: ((جا ئەمن ئەو وەختە نەمدەزانی ئەوە چەند كۆسپی لەسەر ڕێیە، موشكیلاتی چییە؟ بەڕاستی ئەودەم ئەمن زۆر سادەتر بووم لە ئەلئان، كە ئەلئانیش ئەو ئەندازە فڕوفێڵی سیاسی نازانم. من موافقەتم كرد، یانی زۆرم قسە لەسەر نەكرد، پێشم وابوو هەر زەروورەن ئیقدام ناكا، بەڕاستی، جیددەن! بەڵام پاش بەینێك مامۆستا زەبیحی پەیدا بوو ....، ل٣٤٧)).

وێدەچی ئەوكاتە ئێستا مامۆستا شێخ عیزەدین بۆی ڕوون نەبووبێتەوە كە بەكردەوە خۆیو بارەگای لەژێر سێبەری كۆمەڵەو ئەو كەسانەدان كە لە دەوری كۆبوونەوە. ئەوانەی دەستی كەم لایەنگری كۆمەڵەو لەگەڵ مامۆستا گونجابوونو ئەویش لێیان ڕازی بوو. بەڵام بەو پڕۆژە تازەیە ڕازی نەبوون كە مامۆستا زەبیحی نوێنەرایەتیی دەفتەری مامۆستای پێ بسپێردرێ! سەرەڕای ئەمەش، دیسان پاشان ڕوون دەبێتەوە كە تەنانەت پارێزگاریو حەراسەتی بارەگاو هی شەخسی مامۆستا "شێخ عیزەدین"یش هەر كۆمەڵە دەیبینێو بەهۆی ئەندامانی كۆمەڵە ئەنجام دەدرێ، بێئەوەی كاتی هاتنەگۆڕێی ئەم مەسەلەیە ئەوە بۆ مام جەلال ڕوون بكاتەوە. سەرباری ئەم گیروگرفتە سەرەكیەی كە مامۆستا شیخ عیزەدین یا مامۆستا زەبیحی بە خەیاڵیاندا نەهاتووە! ئینجا "ئازاد هەورامی" بۆ ناوچەكانی هەورامانو جافایەتی ڕەوانە دەكەن تا لەوێ تەبیلغات بكاو بزانێ وەزعەكە چۆنە؟! كاتێ دەگەڕێتەوە، دەردەكەوێ بەو هیوایەی كە ڕۆیشتووە وا نەگەڕاوەتەوە! گوایە ئازاد هەورامی بە مام جەلال ڕادەگەیەنێ كە ((فایدەی نییە!!، ل٣٤٥)).

پاشان مامۆستا شێخ عیزەدین بارودۆخی ئەوكاتە ئاوا باس دەكات: مامۆستا زەبیحی زۆر فرسەتی ئەوەی نەدەكرد بێتە لای من، بەڵام جارجارە سەری لێ دەدامو قسەمان دەكردو زۆریش بەینمان خۆش بوو. ئەمما ئەحزابو سازمانەكان بەدگوێیان لێ دەكرد، دژی دەدوان، تەبلیغاتی ئاوایان دەكرد. جا ئەو جۆرە تەبلیغاتە هەم

ماموستا زەبیحی‌یان پێ خراپ دەکرد، هەم من‌و هەم ماموستا شێخ جەلال. جا ئەوە ببوو بە تیرێك سێ نیشانیان پێدەنگاوت. جا ئەوە سەیر بوو ... (ژیان‌و بەسەرهاتی زەبیحی، ل٣٥٠).

## ماموستا عولەما لە وتوویژی کاك عەلی کەریمی لەگەڵ "کاك حەمەدەمینی سیراجی"دا

لە ١٩٩٥/٣/١١دا کاك عەلی کەریمی وتوویژێکی لەگەڵ کاك حەمەدەمینی سیراجی سەبارەت بە کەسایەتیی ماموستا عولەماو زۆر لە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە ئەنجام داوە. بەڵام بەداخەوە کاك حەمەدەمین لە وەڵامی هێندێك لە پرسیارەکاندا، بە پێچەوانەی باری ڕاست‌و ڕاستەقینەی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە دواوە. بۆیە بە باشم زانی زانیاریەکانی خۆم بۆ ڕاستکردنەوەی وەڵامی ئەو پرسیارانە لێرەدا تۆماربکەم:

من هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم کاك حەمەدەمین سەرباری ئەوەی کە بەسەر خۆی‌و هاوبیرانی خۆیدا هێنا، جارێکی تر ماوە بە خۆی بدا سەبارەت بە کەسایەتیی زەبیحی‌و کردەوەکانی بەم جۆرە داوەری بکاو بە کەڵك وەرگرتن لە سادەیی‌و کەم ئەزموونیی کاك عەلی کەریمی بەم جۆرە ماموستا زەبیحی خەتابار بکاو شتێکیش قەرزداری بکا! ئەمە لە حاڵێکدا کە "دکتۆر ڕادمەنیش" سکرتێری حیزبی توودەی ئێران بۆ ئامانجی تایبەتی حیزبی توودە، هاوکاریی تێدا کردووە. کەواتە بۆ دەبێ بۆ یەکێکی وەك ڕادمەنیش ڕەواو شتێکی ئاسایی بێ، بەڵام سەبارەت بە زەبیحی بە (تەڕەسوبات!)ی کارەکانی پێشووی بژمێردرێ‌و کاریگەری مەنفی بکاتە سەر کەسایەتیی ئەو، هەروەها سەبارەت بە من بە (تەبەعییەت- تبعیت) لە ماموستا حیساب بکرێ؟! نەخێر کاکی بەڕێز! ئەمە تەبەعییەت نییە، ئەمە هاوکاریی پێ دەڵێن، هاوبیریی پێ دەوترێ. بەڵام تەبەعییەت ئەوەیە کە مرۆڤ قازانجی لایەنێکی (دۆڕاوی) لە بەرژەوەندی گەل‌و نەتەوەی خۆی پێ باشتر بێ! ئینجا مەسەلەی ئەم چەکدارانەی کە باستان کردبوو، سیاسەتێکی نوێی تایبەتی بوو، زۆر کەس سەریان لێ دەرنەدەکرد. ئەم هێزە لەڕاستیدا هێزێکی خۆمانە بوو، بە جۆرێك ئامادەکرابوو بە کاری هەردوولا بێ!

لەلایەکی ترەوە، دیسان سەبارەت بەم چەکدارانە، لە (لاپەڕە ٢٠٦)دا کاك حەمەدەمین لە وەڵامی پرسیارێکدا، ویستوویەتی تاوانەکانی ژانڕاڵ پەناهیان

نێردراوی حیزبی توودە بۆ بەغدا بەسەر مامۆستا زەبیحی و مندا بسەپێنێ؛ ئێمە بە هۆکاری بەدبەختیی ئەو چەکدارانە لەقەڵەم بدا، گێرەشێوێنییەکی وەستایانەی تایبەت بە خۆی بۆ شێواندنی ڕاستیەکانی مێژووی ئەو سەردەمەی تێدا بەکار بێنێ!

ناکرێ کاک حەمەدەمین ئاگادار نەبێ کە مەسەلەی ژانراڵ بەختیارو پەناهیان، ئەگەرچی سەروبنی یەك ڕووداون، بەڵام جیاوازییەکی زۆر هەیە لە بەرنامەی ئەهدافی ئەم دوانەدا. بەرنامەی بەختیار لەسەرەتاوە ڕوون و ئاشکرا بوو، بەڵام پەناهیان کە دوای تێرۆری بەختیار نێردرابوو بۆ عیراق، مەسئوولییەتی هەڵوەشاندنەوەو لەڕیشەدەرهێنانی هەرچی کە بەناوی بەختیار دامەزرابوو، پێی سپێردرابوو. کاتێك گەیشتە بەغدا، بە هاوکاریی دوکتۆر موراد عەزیزو شێخ جەبار، ڕۆژانە چەند دەستەی ٢٥-٣٠ نەفەریی بە ناوی چالاکی و دەستوەشاندن، بۆ باشووری ئێران ڕەوانە دەکردەوە، بەڵام چونکە خەیانەتی تێدا بوو، هەر زوو بەشێکیان دەکوژران و یا بریندار دەکران. ژمارەیەکی زۆریشیان بۆ ڕومادی و شارەکانی تر دوور دەخرانەوە، تەنانەت حامید بەگی باوەجانی فەرماندەی چەکدارەکان بە ماڵ و منداڵەوە بۆ (سامەڕا) دوور خرابوونەوە.

سەبارەت بە حامید بەگ، کاک حەمەدەمین زۆر بێبەزەییانە دەڵێ: ((... ئەوانە (مەبەست حدکایە)، نەیانکردو منیش گوێم نەدایەو ... حامید بەگ بەم شێوەیە تێدا چوو!!؟)). خوێنەری خۆشەویست! بزانە کەسایەتێکی شۆڕشگێڕو ڕۆشنبیری وەك کاك حەمەدەمین! چۆن دەڕوانێتە ژیانی مرۆڤێکی بەدبەختی گرفتار! لە حاڵێکدا بە ئاسانی دەیتوانی ڕزگاری بکات، چونکە ئەوکاتە چریك دۆست و یارمەتیدەری پێڕەوان بوون. تەنانەت کاك غەنی لە (ئاڵەکۆك)دا باسی دەکا کە چریك سەبارەت بە پێڕەوان لە حیزبی توودەش باشتر بوون! جگە لەوەی کە (ستادی هاوبەشیان) هەبوو. بەڵێ ئا بەم جۆرە (گوێنەدان)ی کاك حەمەدەمین، دانستە یا نەدانستە، تاوانێکی بەشوێنەوە بوو، بە تێداچوون و شەهیدبوونی حامید بەگ تەواو بوو.

هەروەها دیسان لە جێگەیەکی دی کاك حەمەدەمین مەسەلەی هاوکاری لەگەڵ ئەو بەرەیەی کە ژانراڵ پەناهیان و دوکتۆر موراد عەزیز پێکیان هێنابوو، دێنێتە گۆڕێ و دەڵێ: ((کارکردن لەگەڵ ئەوانە تا حەدێك زەربەی لە ئیعتیباری مامۆستا عولەما داوە!؟)). کەچی خۆیشی لە هەمان بەرەدا لەگەڵ ئێمە هاوکار بوو! تەنانەت ماڵەکەشی هەر لەو نزیکانە لەپەنا دەفتەرەی ژانراڵ پەناهیان بوو! جا مەگەر لە خۆی بپرسین:

ئەریّ کاکە چۆن دەبیّ سەبارەت بە مامۆستا (زەربە) لە ئیعتیباری بدا، بەڵام سەبارەت بە خۆتان زەربە کارتان تیّناکا؟! تۆ بڵێی ئیعتیباری کاک حەمەدەمین دژی زەربە بیّ؟!

کاک حەمەدەمین لە لاپەڕە (٢٢٣)دا سەبارەت بە مانەوەی مامۆستا لە بێرووت لە ساڵی ١٩٧٤داو گیرانی پاش گەڕانەوەی بۆ بەغدا، دەڵیّ: ((جا سەرجەم شتەکان ئەوەبوو کە بەعس لە هەڵسوکەوتی ناڕازی بوو، تا دەیانبردەوە سەر نزیکترین کەس بە مامۆستا کە حاجی بوو!)). کاکە ئەمجارەش دەستخۆش! کوڕە سەیرە ئێوە شانامەی پێڕەوانی کۆنگری چوارو چوونە ناو تووەدەو بەسەرهاتەکانی دوای کۆنگرەی چواری خۆتان لەبیر دەبەنەوە، لە هەمان کاتیشدا هەوڵ دەدەن پیلان و عەیب و عار بۆ ئەم و ئەو دروست بکەن؟!

کاکە، مەسەلەی وەدرەنگکەوتنی مانەوەی مامۆستا عولەما لە بێرووت کە گەورەترین و بیمناکترین گێچەڵی بۆ دروست کردبوو، هەر لەسەرەتاوە ئاگاداری بووم، تەنانەت ئاگام لە گشت وردەکاریەکان بوو کە بۆ تیژکردنی ئاگری ئەم پیلانە چەپەڵە لەکاردا بوون. بەڵام بەپێچەوانەی کە ئێوە تێی گەیشتبوون، ئەوە من بووم کە ئەم پیلانە گەورەیەم پووچەڵ کردەوە! بەڵیّ من بووم لەگەڵ هاوکارو دۆستانی خودی مامۆستا زەبیحی توانیم کەسایەتێکی وەها بخەمە ناو مەسەلەکەوە بتوانیّ بە سەرکۆماری عیراق "ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر" بڵیّ: ((قوربان! مامۆستا زەبیحی مرۆڤێکی پاکە!))، چونکە ئەگەر بەم جۆرە بەپیر کێشەکەوە نەچووباین، بیّگومان مامۆستا بۆ ئەوە نەگیرابوو بە (١٨) هەژدە مانگ زیندان وازی لیّ بێنن! ئێستا کە (٣٠) سی ساڵ بەسەر ئەوکاتەدا تیّدەپەڕیّ، شاهیدی زیندوو ماون کە بتوانن لەم لایەنەوە کاک سیراجی دڵنیا بکەن! وە بۆ ئەوەی باش وەبیرتان بێنمەوە، ئەمە ئەوکاتە بوو کە تازە لە خەستەخانەی جەمهووریی کەرخ ڕزگار ببووم و جەنابتان هاوڕیّ لەگەڵ هاوکارێکتان خەریکی کێشەی (سەیارە) بوون، گوایە دوکتۆر بەڵێنی (سەیارە)ی پیّدابوون.

ویّدەچیّ ئەم برادەرە زۆرباش ئاگادار بیّ کە من نزیك بە پەنجا و چەند ساڵە لەم وڵاتەدا دەژیم، بەڵام ویّدەچیّ باش ئاگادار نەبیّ کە بەشی زۆری ئەم ماوەیە لای لایەنێك گیرساومەتەوە کە باوەڕم پێیان هەبوە؛ ئەوانیش لێم ڕازی بوون، لە بەغدا لە سلێمانی، لە عیساویّ، لە خەزێنە، ئاوکورتیّ، گردە ڕەش، بەرپرسی چاپخانەی حیزب بووم. (١٦) ساڵی ڕەبەق لە بەغدا لە ناوجەرگەی ڕەژێمدا چاپخانەی حیزب لە

ماڵمدا بووه! به حوکمی گرینگیی کاری چاپو چاپەمەنی، بەردەوام سەروکارم لەگەڵ ڕابەرایەتیی باڵای (م .س)دا بووە. ئەم شازدە ساڵەی بەغدا خۆمو دوازدە نەفەر ماڵو منداڵم لەژێر ڕەحمەتی هەڕەشەی ڕەژیمدا ژیاوین.

کاکە سیراجی گیان! من لام وایە ئەوانەی لەو ماوە دووروودرێژەدا ئاگاداری هەڵسوکەوتی من بوون، باشتر دەتوانن دەربارەی من داوەری بکەن، نەك ئەوانەی بە شەوارە کەوتوونو وا بیردەکەنەوە دنیا ڕووناکیی تێدا نەماوە!

## نامەیەکی مامۆستا شێخ عیزەدین بۆ حامید بەگ

ئەم شەهیدە نەمرە "حامید بەگی حەمە تایەر بەگی باوەجانی" تا ساڵی ١٩٦٩ لەناو پێشمەرگەی "مام جەلال"دا سەرلق بوو. دوایی مام جەلال بۆ فەرماندەییی هێزەکانی سەیید سادقو هەڵەبجەو خانەقین هەڵیبژارد. ئەوکاتە دووسێ ساڵ بەیەکەوە بووین؛ تا بڵێی ئازاو دڵسۆز، ڕووحسووكو جوامێرو بەتەواوی مەعنا پێشمەرگە بوو. بەڵام بەداخەوە دوای هاتنی ژانراڵ "مەحموودی پەناهیان" بۆ بەغداو تێکچوونی بارودۆخی ژیانی ئەم پێشمەرگانەو بڵاوەپێکردنیان، حامید بەگ بە ماڵو منداڵەوە دوورخرایەوە بۆ شاری (سامەڕا)، تا ساڵی ١٩٨٠ لەوێ مایەوە. جارجارە کە لە جادەی ڕەشید یا لە دووکانی خوالێخۆشبوو "حوسەین ئاوارە" چاوم پێدەکەوت، لێم دەپرسی: ئەرێ بۆ ناچیتەوە بۆ ناو کەسوکارو عەشیرەتی خۆت؟ وەڵامی دەدامەوە: ((مامۆستا عولەما نایەوێ بچمەوە. وا دیارە دەیەوێ لە مەهاباد دەفتەر بکاتەوە، بەڵام تائێستا بە باشی تێی نەگەیشتووم!)).

من خۆم حامید بەگم باش دەناسی، دەمزانی زۆر سەرڕاستە، لە تیپی شەهید عەلی شیعەو ئەوانە بوو. هەموو شتێکی باشی لێ دەوەشایەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا ئاگاداری ئەوەش بووم کە زۆر کەسی وا هەن دانوویان لەگەڵی ناکوڵێ؛ بە دەردی مامۆستا شێخ عیزەدین باسی کردووە: ((چارەیان لەگەڵ مامۆستا زەبیحی نەدەهات!)). وێدەچێ پێیان خۆش نەبێ لە مەهاباد (دەفتەر) بکاتەوە! ئەمە کاتێك بوو مامۆستا زەبیحی تازە گەڕابۆوە بۆ مەهاباد، بەڵام وا دیار بوو خۆی پێی خۆش نەبێ بگەڕێتەوە، حەوانەوەی خۆی لە ئێرەی پێ باشتر بوو. بەڵام لەسەر ئەوەشڕا، وەك دەڵێن ڕەنگە ناچار کرابێ بۆ گەڕانەوە! هەروەرها وەك دەڵێن کاتێك دەگاتە ناو

کەسوکاری، لێی دەپرسن: ئەرێ کاکە بە یەکجاری هاتوویتەوە؟ وەڵام دەداتەوە: بەڵێ، بەڵام جارجارە هاتوچۆو سەفەران دەکەم!

دوای ئەمە دیسان سەفەرێکی بەغدا دەکاو لە گەڕانەوەدا بۆ مەهاباد هێندێك چەك و تەقەمەنی و یارمەتی لەگەڵ خۆی دێنێ. ئەگەرچی لەڕێگا کەمێك گیروگرفتی بۆ پەیدا دەبێ، بەڵام بێوەی دەبێ و لە مەهاباد دابەشیان دەکات. بەڵام ڕوون نەکراوەتەوە لەم سەفەرەیدا حامید بەگی لەگەڵ دەبێ یا خێر؟! وادیارە هەر ئەم سەفەرە بۆ جەماعەتێ کە لە دەوری ماموستا شێخ عیزەدین دەبن، ئاشکرا دەبێ کە شێخ دەیەوێ بارەگاو دەفتەرەکەی بە ماموستا عولەما بسپێرێ. دەڵێن شێخ بە خەتی خۆی دوو نامە دەنووسێ بۆ ئەوەی ماموستا عولەما وەك موعتەمەدی دەفتەر بە خەڵك بناسێنێ! جەماعەتی پێشووی دەفتەر کە وا دەزانن جگە لە دووسێ نەفەر کە لەپێشەوە هاوڕاو هاوبیری ماموستا عولەما دەبن، ئەوانی تر تێکڕا مەسەلەکە ڕەت دەکەنەوەو ڕازی نابن ئەم کارە سەر بگرێ. جگە لەمە، بە کردەوە دەفتەرەکە لەبەر دەستی ئەواندا دەبێ. خۆ ئاشکرێ شێخ ئەمانە دەربکاو ماموستا "زەبیحی"ی تێدا دانێ، کە پێش ماموستا عولەما لێرەن، لەگەڵ شێخ گونجاون و شێخیش لێیان ڕازییە، وەك خۆی گوتوویەتی! ئا بەم جۆرە مەسەلەی ڕەغبەتی مام جەلال سەرناگرێ. دوای ئەمە ماموستا شێخ عیزەدین بە ماموستا عولەما دەڵێ: ((ئەمن پێم وابوو هەموو کوردن و کوردایەتی دەکەن))، دەبێ هەموو لە خزمەتی خەڵقدا بین! ئەمن ئەو شتانەم نەدەزانی، نەیانهێشت ماموستا زەبیحی ئەو شتە دروست بکاو دیارە مام جەلالیش زۆری پێ ناخۆش بوو (ل٣٤٧).

دوای ئەمە، دیار نییە حامید بەگ چ کاتێك لەگەڵ ماموستا عولەما یەك دەگرنەوە. بەڵام خێزانی سوورە لەسەر ئەوە کە حامید بەگ ویستوویەتی بە (ناوزەنگ)دا بڕوا بۆ مەهاباد، تا لەپێشدا چاوی بە مام جەلال بکەوێ، ئینجا ماموستا زەبیحی. بەڵام لەبەر نەبوونی ڕێگا ناچار بە سنووری (ڕایات)دا ڕۆیشتووەو لە مەهاباد لەگەڵ ماموستا عولەما بەیەك گەیشتوونەوە. وا وێدەچێ دەبێ مەلا عەولا مەسەلەی کارسازیی سەفەری حامید بەگی بۆ مەهابادێ جێبەجێ کردبێ. تاریخی سەفەری حامید بەگ بۆ مەهاباد ئاشکرا نییە، بەڵام لەوکاتەدا کە حامید بەگ دەگاتە مەهاباد، مامم جەلال لە لەندەن دەبێ و چاوی پێ ناکەوێ!

سید عزالدین حسینی
امام جمعه مهاباد

هەروەها پێش ئەمە لە تاریخی ١٣٥٨/١٠/٢دا لەلایەن دەفتەری مامۆستا شێخ عیزەدین نامەیەك بۆ حامید بەگ نێردراوە؛ ناوەڕۆکی برێتییە لە دوعاو سڵاوو ئامۆژگاری بۆ هەڵسوکەوتی باشی لەگەڵ هاوولاتیان‌و ئەم جۆرە شتانە. بەڵام سەیر لێرەدایە، کاك حەمەدەمین سیراجی زۆر بەپەرۆشەوە باسی گرتنی حامید بەگ دێنێتە گۆڕێ‌و دەڵێ: دیموکرات هێناویانەو میوانی ئەوانە، بەڵام لەلایەن چریکی فیدائی‌یەوە بەناوی ((حامید بەگی جوانڕۆ عامیلی سەر بە بەعس‌و پیاوی زەبیحی عونسووری کۆن‌و خەتەرناکی بەعس! لە یەکێك لە میوانخانەکانی شاری مەهاباد گیراوە! )). تاریخەکەش دوای کۆنگرەی چوارو جیابوونەوەی پێڕەوان بە سێ مانگ لەقەڵەم دەدا، دەڵێ ئەوکاتە خۆی لەگەڵ چریك هیچ پەیوەندییەکی نەبوە. بەڵام ئەوەی لەبیر دەچێ کە خۆی یەکیك بوو لە بەرپرسە گرینگەکانی (پێڕەوان)و ئەگەر بە ڕواڵەتیش بووبێ (کۆڵەکەیەك)ی گرینگی سەرکردایەتیی بووە! ئینجا ئەمە جگە لە (ستادی هاوبەش) لەگەڵ چریك‌و تەوقیتی گرتنی حامید بەگ، بێگومان دەبێ پەیوەندیی هەبێ بە کاتی دڵنیابوون لە تێداچوونی مامۆستا زەبیحی.

بەقسەی خێزانی، حامید بەگ کاتێ دەگیرێ، دوو پێشمەرگەی لا دەبێ: یەکیان بەناوی "مەحموود حەمەتایەر"و برای خۆی دەبێ، ئەوی تریان بەناوی "برایمی ئامەی فەقێ ئەحمەد"، ئەمانە پاش ماوەیەك ئازاد دەکرێن.

## چۆنیەتی گەڕانەوەی دوا جاری
## مامۆستا عولەما بۆ لای مەلا عەولا

مەلا عەولا باسی دەکاو دەڵێ: مامۆستا عولەما کە لە نیوەی دووەمی نیسانی ۱۹۸۰دا گەڕایەوە، بۆی باس کردم کە مەسەلەی شێخ عیزەدین ئاکامی نەبوو و نەگونجا، گەڕانەوەشم بۆ ئێرە ناجوورە. دوایی مەلا عەولا بەردەوام دەبێ لەسەر قسەکانیو دەڵێ: ((ئەمڕۆ ۲۱ی مانگی نیسانی ساڵی۱۹۸۰ بەم بۆنەوە حەفلەیەك هەیەو دەعوەتیش کراوم، بەڵام لەبەر خاتری مامۆستا نایەوێ بچێ بۆ حەفلەکە!؟)). دوایی مامۆستا داوای لێ دەکا بڕوا، دەڕواو کاتێ لە حەفلە دەگەڕێتەوە، مامۆستا عولەما لەوێ نەماوە!؟

لێرەوە قسەی خەڵك دەست پێدەکا. هی وایە دەڵێ: لە ۲۵-۲٦ی نیسان مامۆستا لە سلێمانی بینراوە . مەلا عەولا گوایە یەکیك دەنێرێ بۆ لای مامۆستا شێخ عیزەدین، نامەیەکی پێدا دەنێرێو ئەحواڵی مامۆستا زەبیحی دەپرسێ؟ مامۆستا شێخ جەلال وەڵامی نامەکە دەنێرێتەوەو دەڵێ: گوایە مامۆستا زەبیحی بە نهێنی چۆتە تارانو نەگەڕاوەتەوە!! لێرەدا سەیر ئەوەیە کە مەلا عەولا گوتوویەتی: پاش ساڵێك بابەکر ئاغا مەسەلەی چوونە تارانی مامۆستا زەبیحیی بۆ مەلا گێڕابێتەوەو گوتوویە: ((وەك خەبەری یەقین! مامۆستا زەبیحی لە ئێران لەکن هەژاری شاعیر مردووەو لەوێ لە کەرەج تەعزێیان بۆ داناوە!)).

هەمان ڕۆژ کە مەلا عەولا مامۆستا بەجێدێڵێو دەچێ بۆ حەفلە، بۆ شەو مامۆستا زەبیحی لە ماڵی بابەکر ئاغای پشدەری دەبێو لەوێرا تەلەفۆن دەکا بۆ ماڵی دوکتۆر عیزەدینو پێی دەڵێ ئەوە لە ماڵی بابەکر ئاغام، وەرە بۆ ئێرە، هەر ئەوشۆ لێرەم، خاوەن ماڵیش پێی خۆشە بێی. دوکتۆر دەڵێ: کە چووم قسەی ڕەقم پێگوت! ((بڕۆ لەگەڵ توودە، لەگەڵ حیزب، لەگەڵ کۆمەڵەو لەگەڵ شێخ عیزەدین، هەرچی دەیکەی بەس مەیەوە بۆ ئێرە، چواری وەك من نەبێ!؟ دەنا کەس قسەی خێر ناکا. تۆ ئەو هەمووهاتوچۆیە دەکەی؟!)).

دوایە دوکتۆر دەڵێ: تەبیعی من گەیاندمەوە ماڵەکەی لە (بەغداد جدیدە)، ئیتر ڕۆیشتەوە، کە ڕۆیشتەوە ون بوو. ئیتر هەر ئەو ونبوونە بوو. سەیرە، تۆ بڵێی کاتێکی وەهاو ئەوێ جێگەی ئەم قسە ڕەقانە بووبێ؟! لام وایە هەموو جێگەیەك بۆ

ئەوە نابێ مرۆڤ، بەتایبەت کەسایەتێکی خاوەن وەزنی وەك پرۆفیسۆرێك، بێنیازیو بێباکیی خۆی بە گوێی خەڵك هەڵکێشێو ئامۆژگاریی وەها بخاتە بەردەم دۆستانی کە کار لەکار ترازابێو مەجالی جێبەجێکردنی بەسەرچووبێ. زەبیحی کاتی بیستی ئەم قسە ڕەقانە ئاگای لە دەردی خۆی هەبوە، کاتێ کە بە دوکتۆری گوتووە هەر ئەوشۆ لێرەم! زانیویەتی بەرەو ڕووی چارەنووسی خۆی بۆتەوە. جا بۆیە ئەم قسانە لەم کاتە ناسکەدا ناتوانێ لە (گوللەی ڕەحمەت) بەولاوە شتێکی تر بێ!

وێدەچێ تاریخی گرتنی حامید بەگ لەلایەن چریکی فیدائییەوە، وەك کاك حەمەدەمین باسی دەکاو دەڵێ حامید بەگ ئەو کاتە لە جەڕەیانی شێخ عیزەدینو ئەوانەدا نەمابێ، زۆر ڕاست نەبێ؟ چونکە ئاخر دابەشکردنی چەك لەلایەن مامۆستا عولەماوە، دەبێ کەوتبێتە نیوەی ئەووەڵی مانگی نیسانی ١٩٨٠، وەك کاك سەلاح موهتەدی ئاماژەی پێدەکا، وا دیارە حامید بەگ ئامادە بووە! هەرچەندە کاك سەلاح ئەم ئامادەبوونە وەك شتێکی نائاساییو سیاسەتو سیتراتجێکی نوێ لەقەڵەم دەدا! پاشان درێژە بە مەسەلەکە دەداو دەڵێ: ((لەسەر داخوازی مام جەلالو بەرنامەو دەستووری زەبیحی بۆ حامید بەگ کە بەشی زۆری چەکەکانی بەسەر پێشمەرگەکانی یەکێتی دابەش بکات! زەبیحی وەبەر شەپۆلی غەزەبی حکوومەتی عیراق دەکەوێو سەری تێدا دەچێ!)). ئیتر مەعلووم نییە لەبەرچیو بۆچی وای لێ دێ، لەکاتێکدا مامۆستا زۆر باش ئاگادار بوو کە تەنیا خۆی وەڵامدەرەوەی گشت کەمو زیادییەکە کە لەم بەرنامەیەدا ڕوو دەدات. کەواتە بۆ ماوە درا بەم بارەدا بکەوێ؟!

## مامۆستا زەبیحیو زمانەوانی

لە ئێران، نە لە تەورێزو نە لە مەهاباد کاری زمانەوانیو تەئلیفی قامووسی کوردیو ئەو جۆرە شتانەم لە مامۆستا زەبیحی نەدیبوو. بەڵامساڵی ١٩٤٨ کە لە (سیتەك)ی شاربازێری کوردستانی عیراق بەیەکەوە بووین، جارجارە خەریکی شیکردنەوەی ناوی پەلەوەرو شارو دێهاتو ئەم جۆرە شتانە دەبوو. باشم لەبیر ماوە ڕۆژێکیان باسی ناوی (کەو)ی بۆ کردین، گوتی ئەم ناوە لە ڕەنگی -کەو- وەرگیراوە کە لە خۆڵەمێش دەچێ. بەڵام ناوی (کۆتر) واتا (کەوتر)، یانی (شینتر)، هەر بەم جۆرەیە. لە زمانی فارسیشدا ئەم ناوانە هەر بەم جۆرە وەرگیراون، (کبك) لە (کەبود) واتا شین، هەروەها بە (کۆتر)یش دەوترێ (کبوتر- واتا شینتر).

دوای شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨ کە لە سووریا گەڕایەوە، دیسان جارجارە بەم باسانەوە خەریك دەبوو. بەڵام دوای ساڵانی ١٩٦١ کە لە ماوەت و ئاوکورتێ بووم، داوای لێ کردم ئەوەندەی بۆم دەکرێ زاراوەی ئەوناوە کۆبکەمەوە. لە(گردە ڕەش) لە (چاپخانەی خەبات) بەدەم ئیشەوەو کاتەکانی حەسانەوەم لە دێهاتی دەوروبەری ماوەت، ئاوکورتێ، عیساوێ، خەزێنە ، ژاژڵەو ... کاتی بێکاری خۆم بەم ئیشەوە ڕادەبوارد. تا لە پائیزی ١٩٦٤دا بە ئەمری مامۆستا برایم و مام جەلال لە (بێتووش)ـەوە گەڕامەوە بۆ بەغدا بۆ لای زەبیحی. لە ساڵی ١٩٦٥دا زەبیحی بۆ هێنانەوەی برادەران سەفەرێکی تارانی کرد، لە گەڕانەوەدا فەرهەنگێکی چوار جلدیی فارسیی لەگەڵ خۆی هێنابوو. لە ١٩٦٨دا زەبیحی داوای لێ کردم دەس بکەم بە فیش سازکردن. لە قامووسە سێ جلدیەکەی شێخ محەمەدی خاڵ و هەرچی دەست دەکەوت، دەستم کرد بە ئامادەکردنی فیش. ساڵی ١٩٦٩-١٩٧٠ کە هاتوچۆی سەیید سادق و هەڵەبجەو خانەقینم دەکرد، دیسان بەدەم کارو هاتوچۆوە، هەر خەریکی کۆکردنەوەی وشەو زاراوەی ئەوناوە بووم. تا ساڵی ١٩٧٣ بەینی (٣٢ تا ٣٦) جلد فیشەم ئامادە کردبوو، تەنیا پێویست بە مەعنا لێکدانەوەو شیکردنەوەیان هەبوو، کە چاوەڕوان دەکرا زەبیحی دەستیان پێ بکات.

من و ئەو "زەبیحی" بەم جۆرە ڕێك کەوتبووین: ئامادەکردنی هەموو فیشەکان و ئەرکی هاتوچۆی چاپخانەو هەڵەبڕیی جاری یەکەم و دووەم، هەروەها هەموو وردەکارییەکی تر لە ئەستۆی من بێ، تەنیا ئەرکی مەعنا لێکدانەوەو شیکردنەوەی وشەکان لە ئەستۆی ئەو بێ، بەو مەرجە منیش هاوبەش بم لە تەئلیفەکەدا. بێگومان من بەتەمای دەسکەوتی ماددی نەبووم، تەنیا مەبەستم ئەوەبوو با بوونەکەم دیاربێ.

بەڵام بەداخەوە ساڵی ١٩٧٦ ساردییەك، کە خەتای منی تێدا نەبوو، کەوتە بەینمانەوە، زۆری نەمابوو بە کوژرانی من تەواو بێ. ئەگەرچی مەسەلەکە لە ئاکامی هەڵەیەکی ئەو ڕووی دابوو، لەسەر ئەوەشڕا، ئامادە نەبوو بەشە مەسئوولیەتی خۆی وەئەستۆ بگرێ. هەرچەند بەڕێز کاك حیلمی عەلی شەریف و بەڕێز پارێزەر کاك عەبدوڵڵا کانیمارانی هەوڵی باشیان دا چل ساڵ برادەری بەفیڕۆ نەڕوا، بەڵام کشانەوەی خۆم بەلاوە بە باشتر زانی تا برادەری و دۆستایەتییەکی یەکلایەنە!

ساڵی ١٩٨٠، پێش تێداچوونی، بیستم کە دوو جلد لە فەرهەنگەکەی چاپ کردووەو بڵاوی کردۆتەوە، بێ ئەوەی ئاماژەیەك بۆ ناوی من کرابێ، تەنیا ئەوەندە

نەبێ کە دەنووسێ: ((برادەرێکی کۆنم یارمەتی داوم)). لەسەر ئەوەشڕا من لە ماندووبوونی خۆم پەشیمان نیم، خۆزگە سەد ئەوەندە ماندوو دەبووم و فەرهەنگەکە گشتی چاپ دەکراو بڵاو دەکرایەوە. دیارە مەبەستی سەرەکیی هەمووومان خزمەتی فەرهەنگی کوردە. بەڵام بەداخەوە مەرگ ماوەی نەداو بەجێی هێشتین. ئەوەندە هەیە سەنگینیی ئەم ڕووداوە سەبارەت بە من هەرچەند بێ، ناتوانێ بیرەوەریەکانی چل ساڵەی ئێمە لە باری ڕاستی خۆی دوور بخاتەوە یا بیشێوێنێ.

## پێشەوا قازی محەمەدو عەبدوڕەحمان زەبیحیو پەیوەندیەکانیان

مرۆڤ کاتێك ساڵانی دووروودرێژ لەناو چوار دیواری بۆچوونەکان، داوەریەکان و خەیاڵ پلاوەکانی خۆیدا ئەسیرو قەتیس دەمێنێتەوە، ئیتر ئازایەتییەکی ئەوتۆی نامێنێ کەمێك لە مەستیی خەیاڵاتی دوور بکەوێتەوەو گوێ بگرێ لە بیرو بۆچوونی ئەوانەی کە لە دەرەوەی ئەم چوار دیوارەوە داوەریی خۆیان دەردەبڕن، چونکوو ئەم جۆرە کەسانە لە بۆچوونەکانی خۆیان زیاتر، ڕەئی هەموو کەس بە درۆ یا زیادەڕەوی و... لەقەڵەم دەدەن. هەر لەبەر ئەوەشە ئەم جۆرە مرۆڤانە ناچار دەمێننەوە بەردەوام سوورو دەمارگرژ بن لەسەر بیروباوەڕەکانی خۆیان و بەس. با دوور نەکەوینەوە، خۆشبەختانە پێویستم بە هەوڵی زۆر نابێ بۆ بەڵگەهێنانەوە بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو ناکۆکیانەی کە کاك عەلی کەریمی لە (ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی)دا بۆ مەبەستێکی تایبەتی بەرزی کردوونەوە، چونکوو بێگومان ئەمانە ناتوانن بەسەر وریایی و زیرەکیی خوێنەری خۆشەویستدا تێپەڕن.

دڵنیابە هەر ئەو ڕووداوانە خۆیان بەڵگەیەکی زیندوون و هاوارت لێ دەکەن: کاکە عەلی! ببوورە بە هەڵە چوویت و پێش هەموو کەس ڕەعنا خانمی دایکی هاواری لێ دەکاو پێی دەڵێ: ((ڕۆڵە! دەڵێن قازی، زەبیحیی خۆش ناوێ، بەڵام وانەبوو)).

١- زەبیحی کاتێك لە زیندانی تاران ڕزگار دەبێ، ڕۆژێك بۆ باوەژنەکەی دەگێڕێتەوە: باجی! پێشەوا وتوویەتی: ((هەر جێگەیەکی خەتەر بێت و شکم لێ بێت و لێی نیگەران بم، دەبێ زەبیحی بچێ، چون ئەو خۆی پێ ڕزگار دەکرێ، زیرەکەو لێی خاترجەمم!)).

ئایا ئەم وشانەی سەرەوە ئەوپەڕی متمانەو ڕەزامەندیی پێشەوا سەبارەت بە زەبیحی ناگەیەنێ؟! ئایا لە قسەکانی "زەبیحی"دا جگە لە دڵسۆزیو شانازی بە متمانەی پێشەوا زیاترمان دەسگیر دەبێ؟!

٢- له لاپەڕە (١٥٢)دا ڕەعنا خانم خوشکی عەبدوڕەحمان زەبیحی دەڵێ: ((کە کۆمار تێك چوو، قازی محەمەد چوار میرزای نارد بۆ ماڵی زەبیحی تا هەرچەند بەڵگەو سەنەدو ئەوراق هەیە بیسووتێنن)). دوایی دەڵێ: ((وەك بیستوومە لە چوار ماڵ تەنوور داخرابوو بۆ بەڵگە سووتاندن. وەك دەڵێن پڕی ژوورێك بەڵگە لە ماڵی زەبیحی کۆببۆوە، دەبوو بسووتێندرێ)). باشە، ئەمە ئەگەر نیشانەی هاوکاریی زەبیحیو متمانەی پێشەوا نەبێ، دەبێ نیشانەی چی بێ؟!

٣- مەسەلەیەکی تر کە باشتر هەڵوێستی زەبیحی سەبارەت بە پێشەواو پەیوەندیەکانی ئەم دوانە ڕوون دەکاتەوە، ئەمەیە:((... دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ لە وتووێژێکدا سەبارەت بەم مەسەلەیە دەڵێ: جا ئەوە کە مەلا مستەفاش هاتەوە بۆ عیراق، ئەوە زەبیحیو هەژار لەپێش بوونو دایمەن لەوێ بوون، بەڵام فەرقەکە، پیاو حەق بۆ مێژوو بیڵێ: کە کاك هەژار زۆر چووە پێشەوە! موشکیلەکەش ڕەنگە موشکیلەی پێشەوا قازی محەمەد بێ، کە هەژار ئامادە بوو ناوی نەهێنێو باسی نەکا! بەس مامۆستا زەبیحی لە موقابیل مەلا مستەفادا دایمەن دیفاعی لێ دەکرد. مەلا مستەفاش لەو هەڵوێستەی قازی محەمەد لەوکاتەوە هەر عاجز بوو کە لەگەڵیا نەڕۆیشتبوو. ئیتر ئەوە مەسەلەی مێژووە، هەموو شت ناگوترێ. بەس مامۆستا زەبیحی هاتبوو بۆ ناو پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق، حەقی وانی نەمابوو، ل٢٥٢)).

ئەم وتانەی دوکتۆر عیزەدین بۆ هۆشیارکردنەوەی ئەوانەیە کە نایانەوێ ڕاستیەکانی مێژوو بێپێچوپەنا ڕوون بکرێنەوە. زەبیحی لە بەرانبەر بارزانی، تەنانەت لەبەر خاتری ئەویش، ئامادە نەبوو لە ڕاستیەکان لابدا. من پێم وایە بەڵگەی لەوە باشترو ڕێکوپێکتر نادۆزینەوە بۆ ڕەتکردنەوەی هەرچی سەبارەت بەم مەسەلەیە نووسراوە. من لەو باوەڕەدام ڕووحی زەبیحی نەفرین لەوانە دەکا کە دەیانەوێ بیکەن بە دەستەچیلەی ئاگری بیرو بۆچوونی چەواشەکارانەو بوختانو تۆمەت.

٤- زەبیحی، لە ئاخر سەعاتەکانی کۆماردا، دەیەوێ پێشەوا ڕازی بکا تا سابلاخ بەجێبێڵێو بەیەکەوە بەرەو عیراق وەڕێ بکەون. بەڵام پێشەوا کە لەپێشەوە بڕیاری دابوو سابلاخو سابلاغیان بەجێنەهێڵێ، پێشنیارەکەی ڕەت کردەوە. ئەمجارە ناچار دەبێ ڕووبکاتە کونسوڵگەریی شووڕەوی، لە ورمێ داوای ئیجازە بۆ ١٧ ماڵ (بە ماڵی پێشەواشەوە) بکات، بەڵکە پێشەوا ڕازی بێ یا دەستی کەم بنەماڵەکەیو چەند ماڵی

تر ڕووبکەنە ئازەربایجانی شووڕەوی. بەڵام لێرەش زەبیحی سەرکەوتوو نابێ، بە ناچاری تەنیا خۆیو برادەرێکی بەرەو عیراق وەڕێ دەکەوێ!

٥- بە ئەمری پێشەوا قازی محەمەد، مامۆستا عولەما ئارشیڤی کۆمار دادەمەزرێنێ: پێشەوا قازی محەمەد کە بە سروشت کەسایەتێکی دیموکرات بوو، بە پێچەوانەی هەرچی کە تائێستا نووسراوە یا گوتراوە، لەوانە نەبوو گوێ بداتە ئەوە داخوا ئەوکاتەی کە ویستوویەتی بێتە ڕیزی ئەندامانی کۆمەڵە کێ دەنگی بۆ دابێ یا کێ نەیویستبێ دەنگی بۆ بدا. هەر بە ڕزگاربوونی مامۆستا عولەما لە زیندانی تارانو گەڕانەوەیان بۆ مەهاباد، باوەشی بۆ دەکاتەوە تا لەوە زیاتر لە مەیدانی خەبات دوور نەخرێتەوە؛ ڕەغبەتی خۆی بۆ دامەزراندنی ئارشیڤێك بۆ کۆکردنەوەو پارێزگاریی ئەو بەڵگەنامە گرینگانەی کە دەنێردرێن بۆ کۆمار یا شەخسی سەرکۆمار لە ماڵی خودی مامۆستاو دوور لە چاوو ڕەزای گرانی ناحەزان تێدەگەیەنێ، مامۆستاش ئەم بیرۆکەیەی بەدڵ دەبێو پەسندی دەکاو ئۆدەیەك لە خانوەکەیان بۆ ئەم کارە پیرۆزە تەرخان دەکا. بۆ ڕۆژی دوایی دەس دەکا بە جوورکردنو ڕێکوپێککردنی هەرچی دەگاتە ژێر دەستی، پاش ئەوەش بە دڵسۆزییەکی تەواوەوە خەریکی ئەم ئەرکە پیرۆزە دەبێ. بەڵام بەداخەوە پاش تێکچوونی کۆمار، هەر بە ئەمری خودی پێشەوا هەرچی کە تا ئەوکاتە کۆکرابۆوە لەگەڵ هی دایرەکانی تر دەسووتێندرێ!

## پەیوەندیی عەبدوڕەحمان زەبیحی بە مەلا مستەفا بارزانییەوە

بەبۆنەی لە گۆڕێبوونی ناکۆکیە هەڵبەستراوەکانی زەبیحی لەگەڵ چەند کەس لە ڕابەرانی ئەو سەردەمە، کە بەداخەوە سەبارەت بە بارزانیش لە عیراقدا نوێ کراوەتەوە، پێویستە بوترێ: ساڵی ١٩٦٣ بەبۆنەی کۆنگرەی (کۆیە)ی بارزانی، لەگەڵ زەبیحی لەوێ بووین. لە ماوەی هەفتەیەکدا ڕۆژانە لەگەڵ زەبیحیو هەژار لای بارزانی دەبووینو تا ئێوارە لەوێ دەماینەوە، شەوانە دەگەڕاینەوە بۆ ماڵی کاکەزیادو لە ماڵی کاك سەعیدی حەمەقالە دەنوستین. لەو ماوەیەدا من شتی وەهام نەبیستووە کە ناکۆکیی ئەم دوانە بگەیەنێ.

زەبیحی لەو سەفەرەدا دووهەزار دینار پارەی بۆ بارزانی هێنابوو. ئەوانەی کە باسی ئەو جۆرە ناکۆکیانە دەکەن، با بە چاوی خۆیان ببینن کە بەکردەوە مامۆستا

عولەما بەرپرسی ماڵیی پارتی‌یە. من پێم وایە دۆستایەتیی ئەم دوو کەسایەتیە لە مەهاباد بناغەی داڕێژراوەو لەوانە نییە بەقسەی خەڵك تینی بەردەوامی خۆی لە دەس بداو سارد بێتەوە. ئەمەشیان کە گوایە بارزانی بۆ سەرهەنگ "عیسا پەژمان"ی باس کردبێ جایزەی بۆ کوشتنی زەبیحی داناوە، لەڕاستییەوە دوورە، چونکە بارزانی لەوانە نەبوو بۆ پیاوی ئاوا ئەم باسانە بکا. جگە لەوەی کوشتنی زەبیحی پێویستی بەم تەشریفاتە نەبوو. ئەم باسە بە بەڵگەشەوە دەبێ وانەبێ!

ئەوەی ڕاستی بێ، من لەو سەفەرەدا هیچ کات هەستم بە ناڕێکیو ئەو جۆرە شتانە نەکردووەو بارودۆخەکەم زۆر بەئاسایی دەهاتە پێش چاو. تۆ بڵێی ئەگەر شتێکی ئەوتۆ هەبێ، لەوەوە بێ کە عولەما وەك ئەحمەد تۆفیق و هەژار لەژێر باڵی "بارزانی"دا نەبوە، لای (م. س) گیرساوەتەوەو هاوکاریی ئەوانی کردووە. ئەو مەسەلەیە بە هەر بارێکدا لێك بدرێتەوە، هیچ کات نەگەیشتۆتە ڕادەیەك کە بیر لە لەناوبردنی زەبیحی کرابێتەوە؛ یا وەك دەڵێن عیسا پەژمان -وەك خۆی دەڵێ- لە خودی مەلا مستەفای بیستبێ کە جایزەی دیاری کردووە بۆ کوشتنی زەبیحی. بەڵام ئایا کوشتنی زەبیحی ئەوەندە زەحمەت بوو تا پێویستی بە جایزە بێ؟! زەبیحی هەمیشە لەبەر دەستدا بوو. کاتێ لە ماڵ دەبوو، دەرگای ئاواڵە بوو، چەکی نەبوو، ڕقیشی لە چەك بوو، حیمایەی نەبوو، حیمایەی بە پێویست نەدەزانی، بەڵام تەنیا گەورەیی و بلیمەتیی زەبیحی لە مرۆڤایەتی و زیرەکیی کەسایەتیەکەیدا بوون، خۆی بە دوژمنی کەس نەدەزانی و کەسیشی بە دوژمنی خۆی نەدەزانی و نەدەناسی.

### مامۆستا عولەماو بەیعەت!

دوکتۆر ئەمیری حەسەنپوور پێشەکییەکی (سی‌وپێنج) لاپەڕەییی بۆ کتێبی (ژیان و بەسەرهاتی عەبدولڕەحمانی زەبیحی- مامۆستا عولەما) نووسیوە. لەوێدا دوکتۆر ئەمیری حەسەنپوور بۆ ساغکردنەوەی هەندێك لایەنی ژیانی زەبیحی، چووەتە نێو چەند باس و بابەتی جۆراوجۆرەوە. لە بەشێکی ئەو پێشەکیەدا، باسی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی (ژ. ك)و دامەزراندنی (حیزبی دیموکراتی کوردستان)ی کردووەو نووسیویەتی: ((وادیارە زەبیحی بە حیزبی دیموکراتی کوردستان و کۆماری کوردستان ڕازی نەبووبێ)). ئینجا بۆ سەلماندنی بۆچوونەکەی، پەنای بردۆتەوە بەر بەرگی دووەمی قامووسەکەی زەبیحی و دەقی لێکدانەوەکەی زەبیحی بۆ وشەی

(بەیعەت)ی بە بەڵگە هێناوەتەوە، بەدوای ئەوەدا نووسیویەتی: ((زەبیحی لەو تێبینییەیدا بەڕاشکاوی ڕەخنە لە پێشەواو ڕابەرایەتیەکەی دەگرێو ئەوەش بۆچوونی کاك عەلی کەریمی سەبارەت بە ناکۆکیی نێوان قازی محەمەدو زەبیحی، کۆمەڵەی (ژ. ك)و (ح. د. ك) وەڕاست دەخا. لێرەدا زەبیحی دەڵێ قازی محەمەد بە شێوەی "گشتیو ئیمڕۆیی" کە مەبەستی حیزبایەتییە بە سەرۆکایەتیی کۆمار هەڵبژێردرابوو، بەڵام ڕێوشوێنی هەڵبژاردنو سەرۆکایەتیی کاتیی وەلانا، دینو سیاسەتی تێکەڵ کردو داوای بەیعەتی لە خەڵك کرد. جیاکردنەوەی دینو سیاسەت یەکێك لە پێداویستیەکانی دیموکراسییەو وادیارە کە زەبیحی لە تێکەڵاوکردنی دینو سیاسەتدا خنکانی دیموکراسیی بەدی کردووە[٢٠].

من بە حوکمی (چل) ساڵ هاوڕێیەتیو برادەری لەگەڵ عەبدوڕەحمان زەبیحی، شارەزاییو ئاگاداریم سەبارەت بە زۆر لایەنی ژیانی ئەو هەیە. بۆیە لە خۆم ڕادەبینم لە ئاست ورووژاندنی نارەوای (مەسەلەی بەیعەتی پێشەوا قازی محەمەد)دا باری ڕاستی هەندێك ڕووداوی پەیوەست بەم باسە ڕوون بکەمەوە. بەر لە هەرچی، پێم باشە دەقی لێدوانەکەی زەبیحی بۆ وشەی "بەیعەت " وەکوو خۆی بخەمە بەرچاوی خوێنەران. پاشان دەچمە نێو مەبەستە سەرەکیەکەم. زەبیحی لە قامووسەکەیدا بەم جۆرە وشەی "بەیعەت"ی لێك داوەتەوە:

بەیعەت– (= عەرەبی:البیعة). (ناو) عەهدو پەیمان.

بەیعەت پێکردن– (مەصدەری تێکەڵاوی لازم) ڕازی بوون بە سەرۆکایەتی کەسێو جڵەوی کاروباری خۆ تەسلیم کردن. هەڵبژاردنی سەرۆکی وڵات بە شێوەی ئیسلامەتی. تێبینی: أ) بۆ کردنی کەسێ بە خەلیفەی ئیسلام، موسڵمانان کۆدەبنەوەو تەگبیرو ڕاوێژ دەکەن تا ڕایان دێتە سەر یەکێك بیکەن بە خەلیفە. ئەوجار یەکە یەکە هەڵدەستنو دەستی ئەوکەسە دەگرنو دەڵێن: بەیعەتم پێکردی. ب) خوالێخۆشبوو قازی محەمەدی شەهید سەرەڕای ئەوە کە بە شێوەیەکی گشتیو ئیمڕۆیی بۆ پێشەواییو سەرۆکایەتی حکوومەتی میللی کوردستان هەڵبژێردرابوو، تا ماوەیەکیش هەرکەس بۆ دیتنی دەچوو داوای لێ دەکرد (بەیعەتی پێبکا)و دەیگوت تا سەرۆکایەتیەکەی شێوەی شەرعیو ئیسلامەتی وەربگرێ[٢٠].

---

[20] قامووسی زمانی کوردی، بەرگی دووەم، بەغدا، ١٩٧٩، ل٢٢٩.

سەیرە! وشەی بەیعەت ئەم هەموو پەڕوباڵەی لێ پەیدا دەبێ، وای لێ دێ خەڵك لێی بپرینگێنەوە! کەچی بەیعەت تەنها پەیمانێکە لەڕووی ئیمانو متمانەوە، یا لەبەر بەرژەوەندی لەنێوان دوو کەسدا دەبەسترێ. لەو باوەڕەدام ئەگەر هەوری تاریکی بۆچوونە چەوتەکان پێشی ڕۆشنایی ڕاستیەکانمان لێ دانەپۆشێ، خۆمان زۆر بە ئاسانی دەتوانین بە ئاشکراکردنو وەبیرهێنانەوەی ئەو بەڵگە ڕاستو بەهێزانەی کە قابیلی ڕەتکردنەوە نین، تەلیسمی هەموو ئەو باس‌وخواسانەی کە سێبەری هەڵبەستراوی ناڕێکیو ناتەباییو ناتوورەی نارەوا دەخاتە پاڵ سەردەمی پڕ لە شانازیی کۆماری کوردستانو پەیوەندیی نێوان کەسایەتیەکانی ئەودەمە، بە ئاسانی پووچەڵ بکەینەوە.

ئەو زەبیحی‌یەی کە من ناسیومەو ماوەیەکی دووروودرێژ نزیکترین کەس‌و هاوڕێو هاوکاری بووم: بڕوا ناکەم لە هێنانەگۆڕی وشەی بەیعەتدا مەبەستی ئەو هەموو بڕوبیانوانە بێ کە دوکتۆر ئەمیری حەسەنپوور لێکی داونەتەوە! ئەوەش کە دوکتۆر ئەمیر بە خنکاندنی دیموکراتیو هەڵپەساردنی زەبیحیو تەسککردنەوەی بواری سیاسیی زانیوە، بەپێچەوانەوە من بە گەشانەوەی دیموکراسیو پشکووتنی خونچەی بواری سیاسیی دەزانمو بە هیچ جۆرێکیش هەڵپەساردنی زەبیحیی تێدا بەدی ناکەم. هەڵپەساردنی زەبیحی، پێش مەسەلەی بەیعەت، لەلایەن کاربەدەستانی شووڕەوییەوە لە تەورێز ڕووی دابوو. ئەوە پێشەوا قازی محەمەد بوو کە باوەشی بۆ زەبیحیو تێکۆشەرانی دیکەی وەك ئەو کردەوەو دەرگای خزمەتکردنو تێکۆشانی بۆ خستنە سەر پشت.

من بەپێچەوانەی ئەوانەوە کە لایان وایە زەبیحی لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا لائیك بووەو لە وەزعەکە نارەزاییی هەبوە، لەوباوەڕەدام ئەوکات خودی زەبیحی بەتەواوی ساغ نەببوەوە، چونکە باری باوی ئەوکاتەو بارودۆخی ئەو سەردەمە هیچ زەمینەیەکی بۆ بیرکردنەوە لە جیاوازیی ئاینو سیاسەت نەهێشتبوەوەو لەناو کۆمەڵگای ئەوسای کوردەواریدا هەستی پێنەدەکرا. بەڵام دوای (٣٠ ساڵ) وروووژاندنی ئەم مەسەلەیە، ئەوە ناگەیەنێ کە ئەوکاتەش زەبیحی لائیك بووە. ئەم ئاغایانە کە دوای ئەو ماوە دووروودرێژە، بە پەنابردنە بەر چەند وشەی وەك وێدەچێو ڕەنگە، بە گومانەوە دەیانەوێ ئەوە بسەلمێنن کە گوایە زەبیحی لەلایەك لەگەڵ پێشەوا قازی محەمەد ناکۆك بووە، لە هەمان کاتدا حیزبی دیموکراتی

کوردستان و کۆماری کوردستانی بەدڵ نەبوە، ئەم ئاغایانە ناتوانن وەك من ئاگاداری باری ڕاستی ئەو مەسەلانە بن، چونکە من لەنێو ڕووداوەکاندا ژیاوم و زەبیحیشم لەوان باشتر ناسیوە.

لەلایەکی ترەوە، لە سەرەتای شەقامی (تاڵەقانی)یەوە هەتا ئەولای چوارچرا، ئەمبەرو ئەوبەر جادەکە دووکانی جوولەکە مەیفرۆشەکان بوون، لە پەستوو یان پێشەوەی دووکانەکانیان کەرەستەی مەیفرۆشتنیان دانابوو، شوێنەکانیان پێ ڕازاندبووەوە. ئیواران و شەوانە بە ئازادی خەریکی مەیفرۆشتن بوون. ماڵی زارا شەلی مەیفرۆش وەك دیوەخان بەردەوام ئاوەدان بوو. فرۆشگەی"باڕۆن"ی ئەرمەنی بە جۆرەها مەی ئاخنرابوو. دەرگای ماڵی "سوڵتان خانم" تا دوای نیوەشەو لەسەر پشت و جێژوان و نزرگەی ئەویندارانی قەدو باڵای سوڵتان خانم بوو. لەوسەریشەوە، لە چەند قەدەمی ماڵی"بابە خەلیفە"وە هەتا نزیك (باخی سیسە)، شوێنی حەسانەوەو پشوودان بوو. ئێواران و شەوان دەستە دەستە خەڵك ڕوویان تێدەکرد. ئەوجار جێی خۆیەتی باخی سیسەمان لەبیر نەچێ. ئەم باخە کەوتۆتە باکووری ڕۆژئاوای شاری مەهابادەوە، لە لای باشوورو ڕۆژهەڵاتەوە دیواری بۆ کرابوو، دەرگای هەبوو؛ لەلای ڕۆژئاواشەوە چەمی سابلاغ سنووری بوو. لە دەرگای ڕۆژهەڵاتەوە چەند پلیکانە بۆ خوارەوە، ئاشگێڕێك ئاوی ساردو ڕوون بە باخەکەدا تێدەپەڕی. لەم باخەدا ئێواران باشترین چای "مێشوولەدار"ی بەناوبانگ پێشکەش بە مشتەریەکان دەکرا. لە بەهاران و هاوینانیشدا شەوانە دەستە دەستە جەوانان ڕوویان تێدەکردو بەدرێژایی ئاوەکە بیساتی عەیش و نۆش ئامادە دەکراو هەتا بەرەبەیان، پێش ئەوەی ڕووناکی باڵ بەسەر شاردا بکێشێ، هەرکەسە لەبەر خۆیەوە بە زەمزەمەی خوداحافیزەوە بەرەو ماڵ دەبووەوە.

من بۆیە لێرەدا هەردوو دیوی باری ژیانی کۆمەڵایەتیی خەڵکی کوردستان لەو سەردەمەدا دەخەمە ڕوو، تا بە باشی ڕوون ببێتەوە کە خەڵك لەودەمەداو لە شاری مەهابادی ژێر سایەی کۆماردا کاتی خۆیان چۆن بەسەر دەبرد. دیارە کەسانێك لەنێو ڕووداوەکاندا ژیابن و بووبێتنە بەشێك لە ڕووداوەکان، باشتر دەتوانن ئەو واقیعە مێشکی خەڵکی ئێستادا نزیك بکەنەوە، تا ئەو کەسانەی کە لە زمانی ئەم و ئەوو بەگومانەوە باس لە ڕووداوەکان دەکەن. دەتوانم زۆر بەدڵنیاییەوە بڵێم: ئەو شارو ناوچانەی کوردستان کە ئەودەم لەژێر سایەی کۆماری کوردستاندا بوون، لە بارێکی

زۆر ئارام‌و خۆشگوزەرانتر لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان دەژیان‌و نموونەیەکی بەرزی دیموکراتییان تێدا بەرقەرار بوو.

ئەم ئازادی‌و دیموکراتییە لەحاڵێکدا بوو کە لە زۆربەی وڵاتەکانی دەوروبەری کوردستان، سەرەتاکانی حوکمی دیموکرات بەدی نەدەکرا، خەڵکەکانیان لە سایەی کۆمەڵێك ڕەژیمی دیکتاتۆردا ژیانیان بەسەر دەبرد! بەڵام لەو بەشەی کوردستاندا کە لەژێر سایەی کۆماردا بوو، مرۆڤ تاڕادەیەك هەستی بە ئازادی‌و ئاسایش دەکرد؛ نە کەس هەبوو سەرزەنشتت بکات: ئەرێ کابرا تۆ باب‌و باپیرت دیندار بوون، ئەی تۆ بۆ نوێژ ناکەی؟ بۆچی بەڕۆژوو نابی؟ نە حکومەت نە کەسی تر دەیتوانی بە بیانووی (موبارەزەی دژی میللیگەراییی بۆرژوازی!)یەوە مزگەوت‌و کەنیسەکان بەسەر خەڵکە باوەڕدارەکانیاندا بڕووخێنێ‌و بیانکات بە گەراجی تراکتۆر. مەگەر تەنها بە ئاماژەکردن بە وشەی بەیعەت حکوومەتی کۆمار دەبێ بە حکوومەتی تیئۆکراسی؟ ئایا حکوومەتی کوردستان ئەحکامی ئاینی بەسەر گەلی کورددا سەپاندبوو؟! یاخود ئەو دیاردانە کە لەگەڵ ئاینی ئیسلامدا ناکۆك بوون، لە کووچەو بازاڕەکاندا قەدەغە کرابوون؟ ئایا چالاکیی سیاسی‌و ڕۆشنبیری لە ژنی کورد قەدەغە کرابوو؟

وەك من لەنزیکەوە ئاگام لێ بووە، زەبیحی تا دواساتەکانی کۆمار لەناو ئەو کۆمەڵگایەدا بە گیان‌و دڵ هاوبەشیی کردووە، ئەگەر وەك پاساو کە دەڵێن لەبەر خاتری کوردایەتی بێدەنگیی لێ کردووە، خۆ دەستی کەم دەیتوانی دوای کۆمار لە سلێمانی، لە بەغدا کە دەزگای ڕەخنەی ڕەواو ناڕەوا لەسەر پشت بوو، بگرە ناڕەوا هانیش دەدرا! ئەوسا وەك دەیان وتاری سەبارەت بە چەند باس‌و ڕووداوی دیکەی نووسی، دەیتوانی سەبارەت بە ناڕێکی‌و ناعەدالەتیی کۆمار بنووسێ، یان لە فەرهەنگەکەیدا لەگەڵ هێنانەگۆڕی باسی بەیعەتدا بە ڕۆشنی باسی هەموو شتی کردبا! بەڵام من دڵنیام ئەم هیپۆتزو گومان‌و خەیاڵاتە گشتی ساختەو پەرداختەی ناحەزانی کوردو کۆماری کوردستان‌و پێشەوان‌و بەشێکن لە تێئۆری چەواشە. ئەوانە جگە لە تەشقەڵەیەکی ئایدۆلۆژی، هیچی تر نین! ئەم جۆرە کەسانە کە گەرەکیانە زەبیحی لە بەرانبەر پێشەوادا ڕابگرن‌و (بەزۆر) بیکەنە ناحەزی پێشەوا، بەو کارەیان ناتوانن لە کەسێتی‌و ڕۆڵ‌و نەخشی زەبیحی زیاد بکەن! بەڵکوو بەو کارەیان لە کەسێتیی هەردوکیان دەدەن‌و ڕاستیەکانیش ژێرپێ دەخەن!

زەبیحی کە بە تێگەیشتن‌و بە کردەوە پیاوێکی ژیرو زاناو دووربین‌و سیاسی بوو، جێی باوەڕ نییەو ئەوەی لێ ناوەشێتەوە لە زیندانی تارانەوە نامەیەکی پڕ لە هەڕەشەی بۆ پێشەوا ناردبێ‌و تێیدا نووسیبێتی ئەگەر زوو هەوڵ نەدەن بۆ ئازادکردنمان واو وا دەکەم. بێگومان کەسایەتێکی وەك زەبیحی ئەوەندە کەم ئەزموون نەبوو کە ئەوجۆرە کردەوانەی لێ بوەشێنەوە، بەڵکوو ئەمە زاراوەی کەسێکە کە هەست بە مەسئوولیەت نەکات. زەبیحی خۆی ڕێزدار بوو، بۆیە ڕێزی هەموو کەسیشی لەلا بوو. تەنانەت خوشکە ڕەعنا (خوشکی زەبیحی) سەبارەت بەم جۆرە قسانە دەڵێ: ((خەڵك دەڵێن قازی زەبیحیی خۆش ناوێ، بەڵام وانەبوو!)). ئەمە گوتەی خوشکی زەبیحی‌یە، بەڵام تۆ بڵێی کاك عەلی کەریمی ئاگاداری شاهیدی وا نزیك نەبێ یان نەیبیستبێ؟!

بەداخەوە کاك عەلی (لە ل١٢٤، ١٢٥دا) لەمەش بەولاوە دەبێتەوەو نامەسئوولانە دەنووسێ: قازی محەمەد لەپێشدا بە کردەوە دەبێتە سەرۆکی کۆمەڵەی (ژ. ك)، کە ئەوە دژی مەبەستە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵە بوو کە ئاغاو شێخ‌و مەلاو سەیید بتوانن ببنە سەرۆکی کۆمەڵە! چونکە قازی محەمەد هەم ئاغا بوو، هەم مەلاو توانیی بە ماوەیەکی کورت بە کۆکردنەوەی ئیمزا لە خەڵکی سابڵاغ کۆمەڵە تێك بداو حیزبی دیموکرات لە جێگای دروست کاو ئاغاوەت‌و سەردار عەشیرەتەکان بوونە شۆڕشگێڕو هاتنە سەرۆکایەتیی حیزبی تازەوەو جێگای شۆڕشگێڕانی واقیعیی کۆمەڵەی (ژ. ك)یان گرتەوە!

ڕاستیی ئەم مەسەلەیە بە جۆرێکی دیکەیە. لە سەرەتادا بڕیارەکانی کۆمەڵەی (ژ. ك) سەبارەت بە مەرجەکانی ڕابەرایەتی هەرچی بووبێ، بە نزیکبوونەوەی ڕابەرایەتیی کۆمەڵە لە یەکێتیی شووڕەوی‌و ئاشکراکردنی زۆر لە نهێنیەکانی کۆمەڵە بۆیان (کە نەدەبوایە ئەو هەڵە گەورەیە بکرێ!!)، ئیدی کۆمەڵە لە باری واقیعییەوە لەگرێژنە چووبوو. باش ئەوەیە کاك عەلی لە کتێبەکەیدا ڕاستیی مەسەلەکەی تۆمار کردووەو ئەو بۆچوونەی خۆی پووچەڵ کردوەتەوە! ئەوەتا دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ (ل٢٥١) لە زمانی زەبیحی خۆیەوە گوتوویەتی: ((ماموستا زەبیحی ئەیوت وەختی خۆی کە ویستوویانە یەکێك بکەن بە سەرۆك، وتیان دەبێ یەکی ناودار بێ، وتی ئێمە هیچمان خەڵك نەیئەناسین‌و هەموو کوڕە فەقیر و گەنج‌و خەڵکی ناوشار ... بووین)).

پاشتریش هەر دوکتۆر عیزەدین (ل٢٥٢) ئەوە تەئکید دەکاتەوە کە زەبیحی پاش ئەوەی کۆمار ڕووخاو چووە عیراق، هەردەم (دیفاعی) لە پێشەوا قازی محەمەد کردووەو ((داینەنواندووە)).

سەیر ئەوەیە، ئەم برادەرانە نایانەوێ یان زات ناکەن پاش (پەنجا ساڵ) دان بەو ڕاستییەدا بنێن کە دەسەڵاتێکی باڵاتر لە دەسەڵاتی کوردان چاوەدێریی هەموو بڕیارەکانی حکوومەتی کوردستانی دەکردو هەرچی لە بەرژەوەندی سیاسەتی خۆیاندا نەبایە، ڕەت دەکرایەوە. ئەمەش هەموو سەرچاوەی کەموکوڕیو گیروگرفتەکانی کۆماری کوردستان بوو. سەرباری ئەوە، تەنانەت دەیانەوێ ئۆباڵی ئەو گیروگرفتانە وەپاڵ حکوومەتی کوردستانو ڕابەرە بەشەرفەکانی بدەن، پێیان وایە بەم جۆرە دەتوانن لە بایەخی کۆمارو کەسایەتیەکانی کەم بکەنەوە. بەڵام من دڵنیام کۆماری کوردستان بۆ هەمیشە لە مێژووی نەتەوەکەمانداو لە بیرو هۆشی هەموو کوردێکی نیشتیمانپەروەردا بە شانازییەوە دەمێنێتەوە.

## زەبیحیو هێزی چەپ!

ئیتیهامی پەڵەداربوونی ڕابردووی عەبدوڕەحمانی زەبیحی سەبارەت بە هێزی چەپ، قەوانێکی سوواوی کۆنەو وەك جاران بایەخی نەماوە؛ ئەگەرچی ئیستاش لە وڵاتی ئێمە بەداخەوە عادەتێکی کۆن لەناو هێندێك لە چەپنوماکاندا فەرمانڕەوایە، ئەویش ئەوەیە کە هەر کەس وەك ئەوان یا لە خۆیان نەبێ، وەك بێگانە سەیری دەکرێ. جاری وایە ئەگەر بەپێویستی بزانن، ناوو ناتوورەی ناڕەوا دەخرێتە شوێنی! بێگومان ئەمەی "عەبدوڕەحمان زەبیحی"ش هەر شتێکی ئەوتۆیە. جگە لەمە، زەبیحی تەنیا لە بەرانبەر گەلو نەتەوەکەیدا خۆی بە وەڵامدەرەوە دەزانی، نەك لە بەرانبەر کەسی تر. ئیتر گوێی لەوە نەبوو داخۆ (چەپ) لێی ڕازی دەبێ یان نا؟!

کاتێك ژانراڵ تەیموری بەختیار گەیشتە بەغداو بەرنامەکانی خۆی ڕاگەیاند، دوو خاڵی گرینگ لەم بەرنامەیەدا سەرنجڕاکێش بوو:

١-زیندووکردنەوەی قانوونی ئەساسیی ئێران،

٢-حوکمی زاتی بۆ کوردستانی ئێران.

ئەم دوو خاڵە بوو بەهۆی نزیکبوونەوەی زەبیحیو هاوبیرانی لە ژانراڵ بەختیار، بەتایبەت زۆر لەوانەی کە نەیاندەویست دواڕۆژی خۆیان بە بەرژەوەندی بەرنامەکانی

بێگانە ببەستنەوە. ئینجا هاوکات لەگەڵ ئەمەداو ماوەیەکیش پێشتر حیزبی توودەی ئێران بە ڕابەرایەتیی دەبیری ئەووەڵی حیزب "دوکتۆر ڕەزا ڕادمەنیش"و تاقمێك لە هاوکارانی بۆ بەشداریو هاوکاری لەگەڵ ژانراڵ تەیمووری بەختیار، بەڵام ئەوجار نەك بۆ لەناوبردنی بەختیار خۆی، بەڵکوو بۆ لەناوبردنی شای ئێران، لە بەغدا ئامادە بوون. تەنانەت ڕادمەنیش، ئەم هاوکارییەو جگە لە هاوکارێش، ژیانی بەغدای ئەوەندە بەلاوە خۆش بوو کە زۆرترین کاتی خۆی هەر لە بەغدا ڕادەبواردو گوێی لەوە نەبوو هاوکارانی لە (لایبزیك) لە مانەوەی زۆری ئەو لە بەغدا ڕازی یا ناڕازی بن!

لێرەدا مەسەلەیەکی تر کە وەك (ڕان) زۆر کەس ئاگاداری نەبوو، ئەوەیە کە لە سەرەتادا حیزبی توودە بۆ ئامانجی ڕووخانی شا دەیەویست لەگەڵ بەختیار هاوکاری بکات. بەڵام لەناکاو گۆڕانکاری لە سیاسەتی شووڕەویدا بوو، ئەمجارە بەرژەوەندیان لەوە دابوو (شا) لە خۆیان نزیك بکەنەوە. کە ئەویش بە لەناوچوونی ژانراڵ بەختیار تەواو دەبوو.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم گۆڕانکارییە لە سیاسەتی شوڕەویدا، یا باشترە بڵێین، بۆ جێبەجێکردنی ئەم پیلانە، هاوکاریو یارمەتیی گەورەی مۆرەیەکی باڵادەستی (ساواك) هەموو کەموکوڕیەکانی ڕەچاوکراوی مەسەلەکەی پڕ کردەوە. ئەم گەورە مۆرەیە، هەمان "عەباس عەلی شەهریاری- ئیسلامی" مۆرەی بەناوبانگی (ساواك)و لە هەمان کاتدا بەرپرسی سازمانی حیزبی توودەو هەروەها دۆستی نزیكو بڕواپێکراوی دوکتۆر ڕەزا ڕادمەنیش بوو، توانیبووی هاوکاریی چەند لایەنێکی تریش مسۆگەر بکاتو کاریگەرییەکی هەبێ لە جێبەجێکردنیدا، هەر وەهاشی لێ هات!!

لێرەدا دەمێنێتەوە بزانین دەبێ پەیوەندیی عەبدوڕەحمانی زەبیحی چی بێ بەم هەڕاجە بازاڕەی سیاسەتەوە؟! ئایا دەبوو چاوەڕوونیو دەستخۆشی لە هێزی چەپ بکا کە لەم مەسەلەیەدا جێگاو دەوری خۆی لەگەڵ (هێزی ڕاست!) گۆڕیوەتەوەو هەریەکەیان لە جێگای ئەوی تر بەم ئەرکە نوێیە هەڵساوە؟! زەبیحی بەگوێرەی بەرژەوەندی هاوبەش لە هاوکاری لەگەڵ ژانراڵ بەختیاردا دوو ئامانجی هەبوو؛ سەرەکیەکەیان هاوکاری بۆ ڕووخاندنی ڕەژیمی شا، دوژمنی سەرەکیی گەلانی ئێرانو بەتایبەت گەلی کورد، دووهەمیان ئامانجێکی ژێر پەردەی سیاسی بوو کە لە بەرژەوەندی (م. س)دا بوو و خودی زەبیحی یەکێك بوو لەوان. ئەم جەماعەتە (م. س)، لە بەرژەوەندی گەلی کوردو بۆ مەیدان چۆڵکردن لەبەردەم ڕێککەوتنەکەی ساڵی

١٩٧٠ی (بەیانی ئازار)، بڵاوەیان بە هێزی چەکداری پێشمەرگەی خۆیان کردبوو. بەم بۆنەوە بۆشایی‌یەك کە لە بەرژەوەندیاندا نەبوو، پەیدا ببوو. ئینجا بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە، هاوکاری لەگەڵ بەختیار دەستی پێکرد. زەبیحی جێبەجێکردنی ئەم مەسئوولیەتەی بە من سپارد، بێئەوەی خۆی جگە لە چاوەدێریی دووربەدوور بەشداریی تێدا کردبێ. تەنانەت بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە کتێبەکەی "کاك عەلی کەریمی"دا ئاماژەی پێکراوە، تەنیا بۆ یەك جاریش سەری لەم ناوانە نەداوە. بەڵام ئەوەندە هەبوو هەموو سەری مانگ ڕاپۆرتی چالاکیەکانی خۆم پێ ڕادەگەیاندو متمانەیەکی بێسنوور لەنێوانماندا هەبوو. ئێمە لە سەیید سادق و هەڵەبجەو خانەقین نزیك هەزارو دووسەد چەکدارمان ئامادە کردبوو. لە سەفەرەکانی خۆمدا بۆ سلێمانی، دوو ئەفسەری پەیوەندی‌و نوێنەرێکی تایبەتی حکوومەت، هاوکارییان لەگەڵ دەکردم. ئەم چەکدارانە، کە بەشی زۆریان پێشمەرگەی کۆن بوون یا ئەو ئێرانیە کۆنانە بوون کە لەزووەوە وەك میوانەکانی (م. س) لە (چەمی ڕێزان، مالوومە، ئاوکورتێ و ...) لەناوماندا ژیابوون، حامید بەگی باوەجانی فەرمانده‌یان بوو.

حامید بەگ لەپێشدا لای مام جەلال (سەرلق) بوو، دوایی بە فەرماندەی ئەم چەکدارانە دیاری کرا. من لەوکاتەوە کە سێ‌چوار ساڵ بەیەکەوە بووین، لە گیانی نەبەزی‌و خۆبەختکردن لەڕێگەی پێشمەرگایەتی بەولاوە، هیچ شتێکی ترم تێدا بەدی نەکردبوو. بەڵام بەداخەوە بەهاری ١٣٥٨ی هەتاوی (١٩٧٩ ی میلادی) لە شارە نەبەزەکەی مەهاباد لەلایەن (چریکی فیدائیی خەلق) دەستگیرو زیندانی کراو بەهاری ١٣٦٠ی هەتاوی شەهید کرا.

## عەبدوڕەحمان زەبیحی‌و ئاین

لە بنەماڵەی "سۆفی حەمەدەمین زەبیحی"دا، بێگومان منداڵێکی وەك عەبدوڕەحمان لە شیری دایکیەوە هەستی ئاینی تێکەڵ بە خوێنی دەبێ. لام وایە درۆ نەبێ ئەگەر بڵێین هەستی ئاینی لای زەبیحی پێش هەستی نیشتمانی پەیدا بووە؛ دەشگونجێ بڵێین دوور نییە هەردوو هەستی ئاینی‌و نیشتمانی وەك یەك کاریگەرییان خستبێتە سەری، چونکە لە سەردەمی منداڵیی "زەبیحی"دا جیاوازیی بەینی دین‌و سیاسەت لە کوردستان بەم جۆرەی کە ئێستا هەیە، بەرچاو نەدەکەوت. توندڕەوی‌و زیادەڕەوی‌و حیزبایەتی لە ئایندا پەیدا نەببوو. مەگەر ئەوسا بەشی زۆری ڕابەرانی نیشتمانیمان پیاوانی ئاینی نەبوون؟! مەگەر ئێمە ئیلهامی

نیشتمانپەروەریمان لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام وەرنەدەگرت؟ بەڵام ئەوەندە هەبوو ئەوکاتە لەناو ئێمەدا دین لە سووکترین‌و هاسانترین شێوەی خۆیدا بەکار هێنراوە.

کوردستانی ئێمە، وەك زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیی غەیرە عەرەب، وەك پێویست لە مەفهووم‌و مەعنای دین نەگەیشتبوون. سەبارەت بەمە، مامۆستا مەلا شێخ ئەحمەدی مەولایی، کە زانایەکی بەڕێزی ئاینی بوو، ئەم ڕووداوەی خوارەوەی بۆ گێڕاینەوە کە واقیعی حاڵی ئەو سەردەمەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، دەڵێ: ((جارێك مەلایەکی لادێ لە پرسەیەکدا خەریکی قورئان خوێندن دەبێ، کە دەگاتە ئەم ئایەتە (تجافا جنونهم عن المضاجع يدعون ربهم خوفاً وطمعاً ومما رزقناهم ينفقون- سورة السجدة، آية ١٧). بەڕێکەوت ئاغایەکی (بوڵباس) لەوێ دەبێ، وا دەزانێ مەلا باسی عەشیرەتی (جاف) دەکات، لەپڕ ڕاست دەبێتەوەو دەڵێ: خەڵکینە! چۆن دەبێ خوا لە قورئاندا باسی عەشیرەتی جاف بکات، بەڵام باسی عەشیرەتی (بوڵباس) نەکات!؟ ئەدی ئەوە نییە دەڵێ: ((تەتەجافا!)) ئەدی بۆ ناڵێ: ((تەتەبوڵباس))!

زەبیحی لە نەوجەوانیدا وەك بابی سۆفی‌مەنیش هەڵکەوتبوو، نوێژکەرو ڕۆژووگرو پابەند بە ئەحکامی ئیسلام بوو، بۆیە لە بارودۆخێکی ئاوادا باوەڕ ناکەم توانیبێتی دین‌و سیاسەت لەیەك هەڵاوێرێ. لەسەر ئەوەشڕا، ئەگەرچی هەستی ئاینیی زەبیحی زۆر زوو هەر لە شاری (تەورێز) سارد ببۆوە، بگرە لە نوێژو ڕۆژووش دوور کەوتبۆوە، بەڵام لە دەروونیدا ڕیشەی هەر مابوو؛ تەنانەت پاش ماوەیەکی بیست ساڵی، واتا لە ساڵانی (١٩٦٥-١٩٦٦)دا، ژیان‌و فەلسەفەی "شێخ محێدینی عەرەبی" کاریگەرییەکی زۆری خستبوە سەر مێشکی.

هەروەها ساڵی ١٩٧٥ لە زیندانی ئەبوغرێب بڕیاری دابوو، ئەگەر ئەوجاریش لە زیندان ڕزگار بێ، کراسی (چل هەتیو) دەکا بە خێر! ئەمانە ڕیشەداربوونی ئەم هەستە دەگەیەنێ کە بە ئاسانی لە دڵ‌و دەروونی خاوەنی دوور ناکەوێتەوە.

### گەمە لە ژیانی مامۆستا "زەبیحی"دا

زەبیحی مرۆڤێکی زۆر جیددی‌و سەنگین بوو، ئەهلی شۆخی‌و گاڵتەوگەپ نەبوو. بە دەگمەن هەڵدەکەوت لەگەڵ یەکێك گەمە بکات. ئەگەر جارجارەش گەمەی لەگەڵ کەسێك بکردایە، چاوەڕوان نەبوو وەڵامی بدرێتەوە، یا تۆڵەی لێ بسەندرێتەوە. جارێك لەبیرم نەماوە بە چ بۆنەیەك بوو، بەیەکەوە دەگەڕاینەوە بۆ مەهاباد. دوو

ئەفسەری ڕووسیمان لەگەڵ بوو. لە ڕێگای تەوریز- مەهاباد بۆ ئەوەی تاوێك بحەسێینەوە، لە (خانیان) دابەزین.

زەبیحی دەستی گرتمو بردمیە ئەولاوەو باشتر لێم نزیك بۆوەو پێی گوتم: ئەم ئەفسەرە ئازەریانە دەیانەوێ بخۆنەوە! دوو بوتڵ وۆدکاو ڕانێك گۆشتی کەبابیان پێیە، من تاوێك خۆم گوم دەکەم، تۆ لەگەڵیان دانیشەو خەریکیان بکە! بەم جۆرە زەبیحی توانیی خۆی ببوێرێو دوور بکەوێتەوە. ئەوکاتە زۆر نەبوو فێری خواردنەوە ببوو. لەگەڵ هەموو کەس نەیدەخواردەوە. دوای ئەمە دانیشتینو بێ ئێوە ناخۆش دەستمان کرد بە وۆدکا هەڵدانو پلە گۆشتی برژاو خواردن! پاش ماوەیەك زەبیحی گەڕایەوەو داوای لێبووردنی لە ئەفسەرەکان کرد، بۆ ئەوەی نەیتوانیبوو لەگەڵیان دانیشێ. کاتێ هەڵستاین وەڕێ بکەوین، ئێستا وەسەر ماشێن نەکەوتبووم، ڕووی تێکردمو گوتی: گۆڕت دەسووتێنم شاپەسند! ئەوا گۆشتی بەرازیشم دەرخوارد دای، جا چی دەکەی بیکە. کە ئەوەم لێ بیست بە جارێك تێك چووم، کەوتمە هێڵنجدان. ئەوە حاڵم بوو تا گەیشتینە میاندواو. چیی وای نەمابوو هەرچی ڕیخۆڵەمە بە دەممدا فڕێی بدەم.

دوای ئەمە چەند ڕۆژێك لە سابلاخ ماینەوە، بەڵام من زووتر لە زەبیحی گەڕامەوە بۆ تەوریز. لەلاوە دەمزانی زەبیحی بە کامە ڕەگی (لاوازی) زۆر تووڕە دەبێ، دەستم لێ گیر بوو و بەزیادەوە تۆڵەی خۆم ئەستاندەوە. چاوەڕوان نەبوو بەم جۆرە لەگەڵی دڵڕەق بم! دیاربوو لەناخەوە تۆراو دەنگی لێ گۆڕیم. چەند ڕۆژێك قسەی لەگەڵ نەدەکردم، من چاوەڕوانی ئەوە بووم تا کەمێك ساردبێتەوە تا ڕۆژێك کاکە "خانە" ڕووی تێکردو پێیوت: ((ئەرێ کاکە زەبیحی پێم ناڵێی تۆ بۆ دەنگت لەو برادەرە گۆڕیوە؟! قابیلە مڵکەکانی ئێوەی داگیر کردبێ، یا زیانی لە باغو بێستانەکەت داوە؟!)) کە گوێی لەو قسانە بوو، زانیی خانە لەکوێوە قسە دەکات. ناچار وەپێکەنین کەوتو باوەشی پێدا کردمو ئاشت بۆوە.

ئەم جۆرە شۆخییانە زۆر جار لامان دووبارە دەبۆوە. بەڵام سەیر ئەوەیە ئەو شتانەی کە زەبیحی‌یان بەم جۆرە تووڕە دەکرد، بە پێچەوانە "خانە" پێی تووڕە نەدەبوو! ئەمە بەشێك بوو لە ژیانی تایبەتی ناوخۆمان، کە بێگومان نەیدەتوانی هیچ جۆرە کاریگەرییەکی لەسەر هاوڕێیەتیو هاوکاریو جێبەجێکردنی ئەرکە پێویستیەکانی سەرشانمان هەبێ.

## خۆشبەختی چییە؟*

لە مەیدانی پان‌و بەرینی زیندەگانیدا، هەموو کەس کۆششی خۆی بۆ گەیشتنی بەم ئامانجە کە "خۆشبەختی"ی ناوە، دەڕەتێنێ. هیچ کەس نییە ئەم ئارەزوە لە دڵیدا پەروەرش نەکات‌و هەر کەسە شتێك بە پێویستی خۆشبەختیی خۆی ئەزانێ. مەثەلەن: ئینسان لە بەهاری گەنجیدا پەیداکردنی هاوسەرێکی جوان‌و داوێن پاك وە نەخۆشێکی حاڵ نەزار چابوونەوەو ڕزگاری لە دەردی خۆی بە خۆشبەختی دائەنێ. ئەمما خۆشبەختێکی پایەدار نەبێت، قابیلی دڵ پێگرتن نییە. ڕەئی هەموو کەس لە هەڵبژاردنی خۆشبەختیدا جۆیجۆی‌و موخالیفە؛ کتێبی بوودای ئەڵێ: ((لە سەرەوەی کارچاکی‌و دروستکاری خۆشبەختی نییە)).

ئالبێرت هوبارد ئەڵێ: ((چاکترینی خۆشبەختی یاریدەکردن بە خەڵکییە)). ئەگەرچی ئەم دوو ڕەئیانەی سەرەوە زۆر بەنرخە، بەڵام بەعضـــێك ئەبێتە مایەی خۆشبەختی، وە بۆ هەموو کەس بە وەسیلەی بەختیاری ناناسرێن. هەروەها عیلم‌و صەنعەت‌و ثەروەت‌و کۆشش- ڕاجیعە بە موەفەقییەتی ئەشخاص‌و بەپێی دەکارهێنانیان، یا ئەبێتە وەسیلەی نیعمەت‌و ئاسایش وەیا مایەی بەدبەختی.

خۆشبەختیی ئەصڵی ئەمەیە کە ئینسان لە سایەیدا بە بەرزترین سەعادەت‌و خۆشی بگات. چون بەختیاری لە کۆششەوە دێتە بەرهەم‌و لە زیندەگانیشدا کۆشش‌و کار ئەبێتە ئەنجامی وەظیفە، بۆیە پێویستە ئینسان بۆ خۆشبەختیی خۆی هەوڵ بدات، چون ماکس مولەر ئەڵێ: ((گوناهی زۆر گەورە ئەمەیە کە ئینسان خۆشبەخت نەبێ)).

لەم ماوە دووروودرێژەدا کە نەتەوەی کورد زنجیری دیلیی لە مل‌و کۆتی بەدبەختیی لە پێ، لە حاڵەتی گیانەڵڵادا بە چاوی پڕ خوێن‌و دڵی پڕ خەم‌و خەفەتەوە بە داوی زوڵم‌و بێدادییەوە، باڵەفڕکەی بوو، لەبەر ئەمە بوو کە قەدرو قیمەتی ژیانی نەدەزانی وە لە هەوڵی کاردا نەیاندەتوانی کۆششتێکی وا بکەن کە بتوانن بەسەر هەموو بەرهەڵستی ژیاندا زاڵ بن. بۆیە ئێستا لە حەقی ژیانیش مەحرووم‌و بێبەش بوون.

---

* "نیشتمان" (گۆڤار)، ژ٦، ساڵ١، ڕەشەمەی ١٣٢٢، ل٧-٩؛

لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە: جەمال نەبەز، گۆڤاری نیشتمان تەمووزی ١٩٤٣- مایسی ١٩٤٤ زمانی حاڵی "کۆمەڵەی ژێکاف"و ئیدیۆلۆژی هوردە بۆرژوای ڕۆشنبیری ناسیۆنالیست لە کوردستاندا، بنکەی چاپەمەنی ئازاد- ستۆکۆڵم، ١٩٨٥، ل١٢٨-١٣٠.

... سلان ئەڵێ: تا لە ژیانداى، لە بەهرەو بەرەکەتی ئیستیفادە بکە، چون دونیا بۆیە خەلق کراوە کە ئینسان لە کەش‌وتووشی زیندەگانیدا دڵگیرو مات نەبێت، بەڵکوو پێویستە ئینسان خۆی لەمە زیاتر بزانێ کە سەختیو کوێرەوەری بتوانێ بەسەریدا زاڵ بێت. وە ئەوانەی کە قەرارو میزانی زیندەگانی نازانن، بۆ ژیان نابنو حەقی خۆشبەختییان نییە، چونکە خۆشبەختی سزای ئەنجامی وەظیفەیە. واتا بەختیاری شتێکە لە موقابیلی پێکهێنانی وەظیفەدا بە ئینسان دەبەخشرێ، بۆیە خۆشبەحتی یەکێکە لە گەورەترین وەظایفی ژینی ئێمە.

ئەگەر گاهێك بیر لە مێژووی چەند ساڵ لەمەوپێشی خۆمان بکەینەوەو ئەوضاعی بەدبەختیو گرفتاریی خۆمان بێنینە بەر چاو، بەچاکی بۆمان ئەزاندرێ کە بۆ نەتەوەی کورد غەیرەز ئازادی هیچ شتێك نابێتە مایەی خۆشبەختی. وە سەعادەتو خۆشیی ژیانی کورد نایێتە بەرهەم، بە ئازادی نەبێ. میللەتی کورد لە ئازادیو سەربەستی زیاتر هیچ شتێك بە بناغەی خۆشبەختیو نەجاتی خۆی نازانێ. کورد ڕاضی نییە کە لە ڕێزەی نەتەوەکانی گێتی بە گوناهکار بنووسرێتو ئامادەیە تا دوامین دەرەجە بۆ ئەنجامی ئەم ئامانجە پاکە کۆشش بکات وە بە هەموو هێزو توانیەوە تێئەکۆشێ تا لەبەرامبەر ئەنجامی وەظیفەدا شاهیدی خۆشبەختیو لە حورییەتو ئازادی بگرێتە باوەش.

شەماڵی کۆشش هەوری نەگبەتیی لەسەر ڕووی کوردو کوردوستان لادا، شەوی بەدبەختیو چارەڕەشی دوایی هاتو ئێستا بەیانی سەعادەتە. کورد ئەبێ بۆ جێژنە پیرۆزەی ئەم جێژنە گەورەیە وە بۆ وەدەستهێنانی سەربەستیو ئازادی وە ڕازاندنەوەی بەهاری کوردوستان، گوڵاڵەی نیشتمان بە خوێنی گەشی خۆی بگەشێنێتەوە. بژی کوردو کوردوستانو کۆمەڵەی ژ. ك.

## هاوار*

بێجگە لە چەند کەسێك کە وەك دڕك‌وداڵی نەگبەت بە زەوی‌وزاری کوردستاندا بڵاو بوونەوەو وا دەزانن هەموو موقەددەراتی قەومی کورد بەدەست وانەوەیە، لازم

---

* "نیشتمان" (گۆڤار)، ژ٧و ٨و ٩، خاکەلێوە- بانەمەڕ- جۆزەردانی ١٣٢٣، ل٨.

سەرچاوە: عەلی کەریمی، ژیانو بەسەرهاتی عەبدولڕەحمان زەبیحی (مامۆستا عولەما)، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٥٨٢.

نییــه باســی دانیــشتوانی تــری کوردســتان بخەینــە پــێش چــاوی خوێنــدەوارانی خۆشەویست، چونکوو حەرەکاتی میلليی کورد ئیمڕۆ لە کەس پۆشیدە نییەو هـەموو میللـەتانی ڕووی زەوی دەزانـن کـە نەتـەوەی کـورد بـە زۆرو کـەمو گـەورەو چووك لـە خەوی غەفڵەت هەڵستاون‌و وە غایەی ویجدانیی خۆیان تێگەیشتوون.

ڕۆژگاری پێشوو دەرسی عیبرەت بوو، ئیتر دەسخەڕۆی درۆو دەلەسەو فڕوفێڵی هیچ کەس نابێت، تەنیا عاشقی ڕاستی‌و حەقیقەتە. ناڵەی دایکی نیشتمان کە بە چـاوی فرمێـسکاوی‌و دڵـی پـڕ خـەم لـە سـەرەمەرگا دەلاڵاوە، بـە جارێـك کـوردی خەواڵووی ڕاپەڕاندو سەودای خۆڕزگارکردنی لە مێشکی گشت مونەووەرانی کورددا بـە خـەطـــێکی نـوورانی هەڵکەنـد، کـوردی بـلاو پـاڵی وێـك داو پـەردەی ڕەشـی دووبەرەکی‌و نیفاق بە دەستی پڕ زۆری برایەتی لە ڕووی کوردستان لادرا. سەرەنجام ئیمڕۆ جوملەی ((یا مەرگ، یا ڕزگاری)) بوونە ویردی زمانی هەموو کوردێك.

بەڵێ، هاواری من لەدەست ئەو کەسانەیە کە پەردەی خۆبینی‌و نەفامی بەسـەر چـاویان کـشاوەو بـە ئانتریکـانی دوژمنـان وەك میکرۆبـی طـاعـوون لـە کوردسـتان خەریکی پێشگیری‌و بەربەستکردنی فەعالییەتی گەنجانن. ئەمانـە هەڵخەڵـەتاوی درۆو دەلەسەی دوژمنانن، دراو کاسی کردوون. دەنا زۆر چاك دەزانـن ئەگـەر ئەوجار کورد بەتـەواوی ئازاد نـەکرێت، بـۆ خۆیـان لـە هـەموو کـەس زیـاتر تـالاوی ژێردەستییان بـە گەروویدا دەکرێت، چونکوو کەسێك بە ضددی مەصاڵحی میللـەتی خۆی وە تـەنیا بۆ خـاطـری مـەنافیعی شەخـصییە خـزمـەتی بێگانـە بکـا، هەمیـشە سـووك‌و چـرووك‌و ڕەذیـل‌و سـەفیلە، لـە مـەوقیعی موناسـیبدا ڕەوانـەی مردنـی دەکـەن، نـەوەك خەیانـەت بەوانیش بگات.

ئەو گلەیی‌و هاوارەش نابێ ببێتە واسیطەی خۆلێگۆڕانی ئەوانەی ڕووی قسەیان تـێ کـراوەو وا بـزانن کـە وجوودیـان بـۆ ژیـانی نەتـەوەی کـوردو دواڕۆژی کوردسـتان چاکەو خراپەی لێ دەوەشێتەوە. نـەء نـەء هـەرگیز نابـێ لـەو خەیاڵ‌پلاوانـە بفـەرموون. دواڕۆژی هـەموو میللـەتێك مـەربووط بـە کۆشـشت‌و خـەباتی لاوانـی ئـەم قەومەیـە. هەروەها موقەددەراتی کوردو کوردستان بەدەست گەنجانی بەغیرەت‌و ناموسە کـە لـە هەموو شوێنێکی ولات پاڵیان وێك داوەو شێرانەو مێرانە بۆ بـەرزێتیی قەومی کوردو ڕزگاریی کوردستان بە گیان‌و دڵ تێدەکۆشن. هەرچی کۆششتێك لە موقابیـل خـەباتی ئەوانـدا بکرێـت، بـەفیڕۆ دەچێ‌و هـەر تیرێـك بـۆ ئـەو ئامانجـە پـڕ تـاوبگرە وە سـوپەری

عەزمو ئیرادەی ئاسنینی لاوانی نیشتکانپەروەر دەکەوێو دەگەڕێتەوە بۆ سینەی پڕ کینەی تیرئەندازی بەدکار.

ئیمە لە ڕووی دڵسۆزیی کوردایەتیێوە ئامۆژگارییان دەکەین کە لەم ڕێگا خوارەی گرتوویانە بگەڕێنەوەو ڕێگای ڕاستی بگرنە پێش، تا لە دواییدا خەجاڵەت نەبنەوەو پەشیمانی نەکێشن کە بێکەڵکو سوود دەمێنێتەوە.

* * *

کورد ئەوەند کوردن بە صەد شەیطان لە کوردی ناکەون
ئیکە خەڵکی بۆچی بۆ خۆ دەردیسەر پەیدا دەکەن

### لەنینی دانشجوو*

لە قەراخی لای ڕۆژهەڵاتی چۆمی وۆڵگا لە پێچی چۆم، شارێکی ڕووسیو کۆن هەیە کە ئەوڕۆ (ئۆلیانوسك)ی پێدەڵێنو لەپێشدا (سیمبیرسك)ی ناو بوو. لە ساڵی ١٨٧٠ لەم شارەدا ویلادیمیر ئیلیچ ئۆلیانۆف "لەنین" لە بنەماڵەیەك لە پشکنێرانی قوتابخانەکانی میللی لەدایك بوو.

لەنین دەورەی منالیی خۆی تا تەواوکردنی دەبیرستان لەم شارەدا ڕابوارد. دەرسەکانی لەنین زۆر چاكو هەمیشە شاگرد ئەووەڵ بوو. وەختێکی لە تەمەنی ١٦ ساڵیو کلاسی حەوتەمی دەبیرستانی (گیمنازیوم)ی طەی دەکرد، موصیبەتێك بەسەر بنەماڵەکەیاندا هات، باوکی وەفاتی کرد.

تازە بنەماڵەی ئۆلیانۆف لە باری خەمو مەینەت ڕزگار ببوو؛ واتا ساڵێك پاش ئەو قەوماوە بەدبەختێکی تریان بەسەردا هات، ئەلکساندر ئۆلیانۆف کوڕی گەورەی ئۆلیانۆف دانشجووی ڕشتەی طەبیعیی دانشگای پوطرزبورگ بە گوناهی هاوکاری لە سووئی قەصد بە عەلەیهی تراز ئەلکساندری سێیەم لەلایەن ژاندرمەوە دەستگیرو لە مانگی مەی ١٨٨٧ موحاکەمەو هەڵوەسرا.

---

* "هاواری نیشتمان" (گۆڤار) (بڵاوکەرەوەی بیری یێکەتیی جەوانانی دێموکراتی کوردستان)، مەهاباد، ژ١، ساڵی هەووەڵ، ١ی خاکەلێوەی ١٣٢٥ (٢١ی مارسی ١٩٤٦)، ل٢٣-٢٧.

سەرچاوە: ڕۆژنامەی "کوردستان"- مەهاباد ١٣٢٤-١٣٢٥ی هەتاوی (١٩٤٦)، ئامادەکردنی ڕەفیق ساڵحو سدیق ساڵح، بنکەی ژینو دەزگای ئاراس- هەولێر، ٢٠٠٧.

بەڵام ئەو بەسەرهاتەش نەبوو بە هۆی شکستی ڕووحییەی لەنینی گەنج. ئەو لاوە لە بەرانبەر ئەو موشکیلاتە ڕاوەستاو بەربەرەکانیی کرد. لە ئیمتحانانی نیهائیی موتەوەسیطە وەدەرکەوت و بە وەرگرتنی میدالی زێڕ مووەفەق بوو. هەڵاوەسینی ئەلکساندر ئۆلیانۆف، چوونی دانشگای پوطرزبورگی بۆ لەنین گران کردبوو. لەبەر ئەوە لەنین خۆی ئامادە کرد داخلی دانشگای غازان بێت.

بنەماڵەی ئۆلیانۆف پاش دیتنی کاروباری خۆیان لە سیمبیرسک بۆ غازان ناردران. بەپێی ئائیننامە لەو وەختەدا داوخوازەکانی دانشگا تەعەهودێکیان ئیمضا دەکرد کە: نەبنە ئەندامی هیچ یەك لە کۆمەڵان وەك کۆمەڵی"هاوشاریان"و شیرکەتی تێدا نەکەن. وە هەروەها بەبێ ئیجازەی سەرۆك حەتتا داخلی ئەو کۆمەڵانەش کە بەپێی قانوون ئازادن، نەبن.

لە هەووەڵ ساڵی خوێندنی دانشگا لەنین ئەو دەرسانەی دەخوێند: عیلمول حەیات، مێژووی حقووقی ڕووس، مێژووی حقووقی ڕۆم، زمانی ئینگلیسی. هەر لە ڕۆژانی هەووەلدا، لەنین لە هاودەرسەکانی تری بە گیانێکی ئینقیلابی، مەعلووماتێکی وەسیع، هێزێکی زیاتر خۆی نواندو بەتوندی لە ڕاو بیری خۆی دیفاعی دەکرد.

بەبۆنەی ئیعدامی براکەی، دانشجوویانی زرینگ و پێشڕەوی دانشگا ئیحتیرامێکی تەواویان دەگرت. طەبیعییە کە ژاندرمەو سەرۆکانی دانشگا چەند کەسیان بۆ تەعقیبی وی دیاری کردبوو. هەر لەوساڵەدا لە مەسکەوو هێندێك لە شارەکانی تر هرووژێکی ئینقلابیی دانشجوویان دەس پێکرا. وە ئەو هرووژە دانشجوویانی غازانیشی داگرت. لەنین، لەسەر ئەوەشڕا کە تەعەهودی دابوو، هاتە ناو کۆمەڵی"هاوشاریان"ی سیمبیرسك.

نوێنەرانی کۆمەڵی"هاوشاریان" قەراریان دا، مەجمەعی عوموومیی دانشجوویان دەعوەت بکەن. بەیانییەك لەلایەن دانشجوویان خیطاب لەگەڵ تەزار نووسرا کە لەوێدا نیسبەت بە سیاسەتی ئیرتیجاعیی دەوڵەتی تەزار ئیعتیراضیان گرتبوو. لەنین دانشجووی ساڵی ١ لە سازکردنی ئەو بەیانیەدا نەخشێکی چاکی بازی کرد. ژاندرمەکان دەستیان بە پشکنینی دانشجوویان کرد. وەختێکی نوسخەیەك بەیاننامە لای دانشجوویەك دیتراوە، چەند نەفەریان ڕاگرت!

تەواوی ئەو کردەوانە بوو بە هۆی تەحریکی دانشجوویان. ٤ی مانگی دیسامبری ١٨٨٧ مەجمەعی ناوبراو تەشکیل و نزیکەی ٤ سەعات ماوەی کێشا. سەرۆکی

ئیدارەی فەرهەنگیی غازان بە سەرۆکی دانشگای دەستوور دا: بە هەر نرخێك حەتتا بە یاریی پولیس و ئەگەر لازم بوو بە هێزی نیظامی دانشجوویان لە دانشگا وەدەرنێ.
تەشکیلاتی پولیسی پوطرزبورگ دەستووری بە فەرمانداری غازان دا کە ڕەهبەرانی ئیغتیشاشاتی دانشجوویان لە دانشگا وەردەرنێ و لە شاریان تەبعید کا. لەنینیش دەگەڵ سایری ڕەهبەرانی دانشجوویان وەدەر نراو شەوی ٥ی دیسامبر لە ماڵی خۆیدا دەسگیر کرا.

لەو شەوەدا صەد نەفەر لە دانشجوویان تەوقیف کران و هەموویان لە وەتاخێك گردبوون. لەو مەجلیسەدا ڕوفەقا لە لەنینیان پرسی: کە پاش وەدەرکەوتن لە حەبس چی دەکەی؟ لەنین لە وەڵاما کوتی کە لە ڕێگەیەك زیاتر لەپێشم نییە، ئەویش بەربەرەکانیی ئینقیلابییە!

دەوڵەتی تەرازی تەواوی دانشجوویانی بە مەسقەطول ڕەئسی خۆیان تەبیعید کرد. چون لەنین لە (سیمبیرسك)دا کەسوکاری نەبوو، بۆ دێی (کوکوشکینو) لە چل کیلۆمەتریی غازان کە موڵکی بنەماڵەی خۆیان بوو، ناردرا. لەنین لەوێشدا لەژێر نەظەری پولیسدا بوو، لەم دێیەدا بەرنامەی دانشگای موطاڵەعەو بە خوێندنەوەی کتێبان مەشغووڵ بوو.

لە پائیزی ١٨٨٨ ئیجازەی گەڕانەوە بۆ غازان بە لەنین درا، بەڵام ئیتر حەقی داخڵبوونی دانشگای نەبوو. لەبەر ئەوە لەنین چووە لای وەزیری کیشوەری دەوڵەتی تەرازو داخوازیی لێ کرد کە بۆ ئیدامەی خوێندن ئیجازەی بدەن بچێتە خاریجە، بەڵام ئەو داخوازەش قەبووڵ نەکرا. لە هەووەڵی مانگی مەی ١٨٨٩ بنەماڵەی لەنین لە غازان هاتنە سامارا. بەڵام لە دەقیقەی هەووەلدا لەنین لە ڕیزەی ئەشخاصی ژێر نەظەر قەراری گرت.

پاش ماندووبوونێکی زۆر لە ساڵی ١٨٩٠ بە لەنین ئیجازە درا کە بە ناوی داوطەڵەب بۆ نامزەدی دوکتوری عولوومی حوقووقی دانشگای پوطرزبورگ ئیمتیحان بدا. لەنین ئەبوایە لە ماوەیێکی زۆر کەمدا غیابی تەواوی بەرنامەی دانشگا حاضر بکا، ئەبوایە دواتر کتێبێ بنووسێتەوەو لە پاشان ئەو دەرسانەی ژێرەوەش ئیمتیحان بدا: دۆگمای حقووقی ڕۆم، حقووق و موحاکەماتی مەدەنی، حقووق و موحاکەماتی تیجارەتی، حقووق و موحاکەماتی جەزائی، مێژووی حقووقی ڕووسی، حقووقی دەوڵەتی، حقووقی بەینەلمیلەلی، حقووقی پولیسی، ئابووری (اقتصاد)ی

سیاسی، ئامارناسیی حقووقی ماڵی، دائیرەتول مەعاریفی حقووق، مێژووی فەلسەفەی حقووق. لەنینی گەنج لە ساڵی ١٨٩١ بە هاسانی لە عوهدەی ئیمتیحانێکی وا گران هاتە دەر، نمرەی دەرسەکانی ئیمتیحانی (زۆر چاك) بوو.

لەنین وەختێکی لە سامارا بوو، مێژووی ڕووسیە، مێژووی گێتیی ئەدەبیات، ژیانی ئابووری، کۆمەڵایەتیی وڵاتەکەی زۆر بە قووڵی موتاڵا کرد، وە بە کۆششێکی زۆر ئاثاری "مارکس‌و ئینگلیس"ی وەردەگرت، لەناو لاوانی پێشڕەوی سامارا فەعالییەی ئینقیلابیی دەکرد. لەو وەختەدا لەنین بە زانستی قووڵی مارکسیستیی خۆی هەموو کەسی سەرلێسوڕماو کرد.

ویلادیمیر لەنین پێنج ساڵ لە سامارا ماوەو لە پائیزی ساڵی ١٨٩٣ لە پوطرزبورگ سەری وەدەرنا. هەر هەووەڵ وتارەکانی لە حەوزەکانی ئینقیلابی مارکسیستیی پایتەخت تەئثیراتێکی زۆری کرد. ئاسۆی پان‌و بەرینی بیرو نەظەریاتی لە بەشی زانستی کۆمەڵایەتی، باوەڕی ئیمان بە سەرکەوتنی ئامانجی میللەت‌و ئیستیعدادو کارزانیی تەشکیلاتی، لەنینی ٢٤ ساڵەی کردبوە ڕەهبەرو پێشەوای کۆمەڵە سەرکەوتوەکانی پایتەخت.

(هەڵۆی کوێستان)ی گەنج کە لە پاشان ڕەفیق ستالین لەنینی بەو ناوە ناودەبرد، لەو ساڵانەدا باڵی بەهێزی خۆی بۆ فڕین ئامادە کردبوو.

لە" اطلاعاتی هفتگی" وەرگیراوە:

**فیلد مارشاڵ کۆتۆزۆف**

**گەورە سەردارێکی کە ناپلئۆنی شکاند!***

کۆتۆزۆف کە گەورەترین سەربازانی تاریخە، لە ١٦ی سپتامبری ساڵی ١٧٤٥ لە شاری (سانپوطرزبورگ) لەدایك بووە. باوکی لە گەورە ئەفسەرەکانی سپای موهەندیسیی ڕووسیەو پیاوێکی فاضیل‌و ئەدیب بوو، کوڕەکەی لەپاش مردنی دایکی زۆر خۆش دەویست‌و، کۆتۆزۆفی بەو ئاکارانە کە ئەبوایە گەنجێکی نەجیبی ڕووسی بیزانێ، ئاشنا کردو، ئەویشی بە پیاوێکی ئەدەبپەروەر دەرهێنا.

---

* "کوردستان" (گۆڤار) (بڵاوکەرەوی بیری حیزبی دێموکراتی کوردستان)، مەهاباد، ژ٣، ساڵ١، خاکەلێوە– مارسی ١٩٤٦ (١٣٢٥ی هەتاوی). (هەمان سەرچاوەی پێشوو)

"مایکڵ کۆتۆزۆف" تەحصیلاتی نیظامیی لە ئامووزشگای (پوطرزبورگ) تەواو کرد. لەساڵی ١٧٦٠ هاتە ناو خزمەتی نیظام. وە لەبەینی ساڵانی ١٧٦٤و ١٧٦٩ لە لەهستان بوو. وە لەو شەڕانەدا کە لە ساڵی ١٧٧٠ تا ١٧٧٤ لەبەینی ڕووسیەو عوثمانی ڕێك کەوت، شیرکەتی کرد. وە هەر لەو شەڕانەدا چاوێکی بریندار کرا. ئازایەتی و کارزانیی کۆتۆزۆف زۆر زوو تەوەجوهی" سووڕۆف" سەرداری گەورەی ڕووسی جەلب کردو، خۆشەویستییەك لەنیو ئەو دوو سەردارە هاتە دی، کە تا ئاخەرین ڕۆژی ژیانی سووڕۆف نەبڕاوە.

کۆتۆزۆف لە ساڵانی پاش شەڕ هاتە ناو عالەمی سیاسەت. چەندێك سەفیری ڕووسی لە قوسطەنطنیە، لەپاشان فەرمانداری کوللی فلاندو سەفیری گەورەی ڕووس لە بەرلن و موددەتێکیش فەرمانداری کوللی (سانپوطرزبورگ) بوو.

لە ساڵی ١٨٠٥ کە ناپلئۆن لە ئوروپا دەستی بە بەرەکانی کرد، کۆتۆزۆف لە ڕۆژانی ١٨-١٩ی نوامبری ئەو ساڵەدا بەرهەڵستێکی گەورەی لەسەر ڕێگای نەیرووی فڕانسە بۆ لای (ویەن) سازکرد. وە لە شەڕێکی کە لەبەینی ڕووسەکان و فرانسەویەکان دەس پێکرا، موەفەقیەتێکی گەورەی دەس کەوت. بەجەرگی و ئازاییەکی ئەو سەردارەی لەنێو هاوخوێنەکانی مەشهوور کرد، لەنێو موتتەفیقینی ئەو زەمانیشدا ئاشکرابوو و لەوەی پاش هەمیشە بە ئیحترامەوە ناودەبرا. بەڵام ڕای کۆتۆزۆف لە شەڕی (ئۆستەرلیتز)دا قەبووڵ نەکرا. کۆتۆزۆف فەرماندەکانی موتتەفیقینی لە ڕووبەڕووبوونی لەشکری ناپلئۆن مەنع دەکرد، بەڵام وەختێکی نەیتوانی لەناو ژانراڵەکاندا هاوفکرێك پەیدا بکا، لە شەڕ ساردبۆوە. ئەو شەڕە لە دووەمی دەسامبەری ١٨٠٥ لەنێوان ئیمپڕاتۆری ئۆتریش و ڕووسیەو ئیمپڕاتۆری فرانسە هەڵایساو لە مێژوودا بە شەڕی سێ ئیمپڕاتۆر مەشهوور بووە، بە شکستی ڕووسەکان و ئۆتریشێکان تەواو بوو. وە هەر لەو شەڕەشدا کۆتۆزۆف بریندار کرا.

کۆتۆزۆف لە ساڵی ١٨٠٦ تا ١٨١١ فەرمانداری ( لیتوانی)و (کییێف) بوو. وە لەپاشان بە فەرماندەیی نەیرووی ڕووسی لە موقابیل نەیرووی عوثمانی هەڵبژێردرا. وابوو کە شەڕی ١٨١٢ دەس پێکراو ناپلئۆن لەشکرێکی بێمانەدی بەناوی (نەیرووی گەورە) کۆکردەوەو پەلاماری بۆ ڕووسیە برد.

لەو وەختەدا بوو کە دەوڵەت و میللەتی ڕووسیە ئەو ڕۆڵە خۆشەویستەی بۆ بەربەرەکانی بانگ هێشت و بە فەرماندەیی سپای ڕووسیە کە (لە بەرانبەر نەیرووی

گەورەدا دەكشانەوە) هەڵبژارد. كۆتۆزۆف لە (برودینو) شكا. بەڵام حیسسی پایەداریو دەماری ڕووسێتیی ئەو بەهێز بوو و نەیهێشت لە نەتیجەی جەنگ ناهومێد بێت. كۆتۆزۆف كشاوە دوایەو ناپلئۆنی بۆ لای مەسكەو ڕاكێشا. پایتەختی چۆڵ كردو فەرمانی دا ((شەڕ ئێستا دەس پێ بكرێ!)).

ئەوجار لەشكركێشیی ناپلئۆن، شەڕی ڕاستی بۆ ڕووسەكان دەس پێ كرا. تەواوی ئەهالیی ڕووسیە كە بۆ پێشگیریی نەیرووی گەورە كۆششو فیداكارییێكی زۆریان لەكار كردبوو، ئەوجار هەناسەیان هاتەوە بەر. بۆ لەناوبردنی نەیرووی فرانسەوی، پایتەختی خۆشەویستو مەسكەوی گەورەی خۆیان ئاگر تێبەردا.

ڕۆژێك كە ناپلئۆن لە (كرملین) سەری لە پەنجەرە هێنابوە دەرو شاری لەناو ئاگردا دیت، هاواری كرد: ((لەو مەملەكەتە عەجیبەدا چاوەنواڕی هەموو شتێكم بوو، جگە لەوە!! كێ بەبیریدا دێت كە میللەتێك پایتەختی خۆی ئاورتێ بەردا، چە ئیرادەیەكی گەورەو چە میللەتێكی عەجایەبە))!

ناپلئۆن خۆیو نەیروەكەی لەناو ئەو داوەدا كە كۆتۆزۆف بۆی دانابۆوە، گرفتار دەبێو ئەو چەند ڕۆژەی كە بە پەشێوییو نیگەرانی لەناو خۆڵەمێشو ئاگری مەسكەودا ڕایبوارد، دەستی ئاشتبوونەوەی بۆ لای كۆتۆزۆف درێژكرد. نامەییێكی لەخوصووص دەستڕاگرتن لە شەڕو ئیمضای قەراردادێكی صوڵحی بۆ نارد. وەڵێ وەرامێكی كە لە كۆتۆزۆفی بیستەوە، ئەوە بوو: ((بۆ من حەتتا گوتنی صوڵح مەمنووعە، چە جای لەولایەنەوە قسەكردنو ئیمضای قەرارداد!!)).

ناپلئۆن كە ئەیگوت: ((من تا مەسكەو پێشڕەوی دەكەمو لە یەكدوو شەڕدا كار دەبڕمەوە))، شەڕی مەسكەوی بە گەورەترین شەڕێك ناوبرد كە خۆی شیركەتی تێدا كردووە. وە لەولایەنەوە لە (سانت هێلن) بەو جۆرە نووسیی: ((لەوێ فرانسەویەكان خۆیان لایەقی وەدەستهێنانی پیرۆزی نیشان دا. لەو حاڵەدا كە ڕووسەكان بەو ڕادەیە گەیشتن كە بە شكست ناپەذیر مەشهوور بن)).

كۆتۆزۆف كە ئەیگوت: (شەڕی مەسكەو) ئاخەرین پیرۆزیی ناپلئۆن، وەختێكی نەیرووی گەورەی لە بەدبەختیو لە باوەش سەرمای سەختی ڕووسیەدا بەدەس شەڕكەرانی غەیرە نیظامییەوە دیت، خۆی ڕاگرتو پەلاماری نەبرد؛ چون ڕای وابوو: ((ئیتر ئێستا دە نەفەر ئەفسەرو سەربازی فرانسەوی ئەو نرخەیان نییە كە

سەربازێکی ڕووسیان بۆ لەناو برێ. ڕاوەستن خۆبەخۆ لەناو دەچن‌و ئەبێ کۆشش بکەین نەیرووی خۆمان بە سلامەتی بگەیەنینەوە سنوور)).

لەو بەینەدا وەظیفەی لەناوبردنی نەیرووی گەورە بە شەڕکەرانی غەیرە نیظامی ئەسپێردرا. ئەوان بوو کە شەوو ڕۆژ پەلاماریان بۆ فڕانسەویەکان ئەبرد. ئەوجار ناپلیۆن کە ئەو وەضعەی دیت، قەراری دا لە خاکی ڕووسیە بکشێتەوە. وەلێ لەبەر برسێتی‌و سەرما چی وا لە نەیروەکانی نەمابوون‌و نیزیك بوو ئیمپڕاتۆر خۆشی بەدەست دەستێك قازاقەوە دەستگیر بکرێ.

تاڵی‌و گرنگییەکی کە ناپلئۆن لەو لەشکرکێشیەدا چێشتی، پشتی پێ‌شکا. وابوو کە دیتراً لە چۆڵ‌و بیابانی ئورووپای ناوەندیدا ئەفسەرێك ڕادەکا ئەو ئەفسەرە ناپلئۆنی گەورەیە کە لە ڕووسیەو لە چەنگی کۆتۆزۆف‌و سەربازەکانی هەڵاتووە.

لە نەیرووی گەورە تەنیا صەد هەزار سوار توانییان گیانیان دەرکەن، سێصەد هەزار نەفەریان لە خاکی ڕووسیەدا خۆی لە باوەشی مەرگ هاویشتبوو. دەڵێن لەو کشانەوەیەدا ڕۆژێك سەرداری ئازاو بەجەرگی فڕانسە"مارشاڵ سە" ماندوو و مردوو بە لیباسی دڕاوو لەت‌وکوتەوەو دەست‌وپێ خوێناوی لەو پێشاپێشی شکستەدا لە شارێکی سنووری هاتە (شارداری)، لێیان پرسی تۆ کێیت؟ کوتی: ((من نەیرووی گەورەم!!)).

شکستێکی کە کۆتۆزۆف بە فڕانسەویانی دا بوو بە هۆی قووەتی قەلبی موتتەفیقین؛ ئۆتریش، پرووس، سوئێد تێکەڵی ڕووسیە بوون. بەڵام پیاوێکی کە پشتی ناپلئۆنی شکاندو لە ڕێگای پارازتنی نیشتمان ئیفتیخاراتی هەرە بەرزی دەس کەوت، نەتیجەی کاری ناپلئۆنی چاو پێ‌کەوت، چون زەحمەت‌و دەردیسەریی شەڕ کاری لەو سەردارە بەناوە کردبوو، لە ٢٨ی ئاوریلی ١٨١٣ فەوتاندی.

ئەوڕۆ ڕووسیەی شورەوی ((ئەو گەورەپیاوەی کە لەڕێگەی نیشتمانپەروەریدا نێوبانگی شازادەیی وەرگرت‌و خۆی هێنا ناو ناوی گەورە ڕۆڵەکانی ڕووسیە))، بە چاوێکی ئیحترام تەماشا دەکا. وە بۆ ئەوەی ناوی ئەو قارەمانە هەتاهەتایی بێت، نیشتمانێکی بەو ناوەو بە ئیفتخاری ئەو دروست کردووەو زۆر لە قارەمانان لەو شەڕی دواییدا بە وەرگرتنی ئەو نیشانە سەرفراز بوون.

## ژانرالیسمۆس ستالین

(بە بۆنەی شەست و شەشەمین ساڵی لەدایکبوونی)*

یووسف ئاستالین پێشەوای گەورەی ڕەنجبەران و کارگەرانی گێتی و ڕەهبەری میللەتەکانی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەویی سۆشیالیستی لە ۲۱ی دیسامبری ۱۹۷۹(۱۸۷۹) لە شاری گوری گورجستان لەدایك بووە. باوکی ئیستالین پیاوێکی کارگەر بوو، ئیستالین لە تەمەنی ۱۵ ساڵییەوە تێکەڵی نەهضەتی ئینقیلابی بوو و لە ساڵی ۱۸۹۸ تا ۱۹۰۰ ڕەهبەری مەحافیلی مارکسیستیی کارگەرانی دەکردو هەووەڵ کەسێك بوو کە لە ئینقیلابی مارکسیستی هەووەڵین تەشکیلاتی سۆسیالیستی دیموکراتی گورجستان قەراری گرت.

لە ساڵی ۱۹۰۱ ڕەسمەن فەعالییەتی ئینقیلابیی دەستی پێ کردو ئەساسی تەشکیلاتی ئینقیلابی ماوەرائە قەفقازی دامەزراندو لە سیاسەتی لینین و ڕۆژنامەکەی "ئایسکرا" پشتیوانی دەکرد، لە ساڵی ۱۹۰۲ وەختێکی لە تەبعیدی سبیریا بوو لەگەڵ لینین ڕابیطەی سازکردو بۆ هەووەڵین کەڕەت لە ساڵی ۱۹۰۵ لە کۆنفرانسی بەلشەویکەکانی (تامرفورس فنلاید) لینینی مولاقات کرد.

ئیستالین لە وەختی ئینقیلابی ۱۹۰۵-۱۹۰۷ لە ڕەئسی بەلشەویکەکانی ماوەرائە قەفقازدا بوو و بەربەرەکانی کاریگەران و جووتیارانی ماورائە قەفقازی ڕاهنومائی دەکرد. ساڵانی ۱۹۰۷-۱۹۱۰ تەشکیلاتی بەلشەویکی باکۆی ئیدارە دەکردو لە ساڵی ۱۹۱۲ بە عوضوییەتی کۆمیتەی مەرکەزیی حزبی بەلشەویك هەڵبژێردراو کاروباری ئینقیلابی ڕووسیەی لەگەڵ لینین ڕەهبەری کرد.

ئیستالین لە موددەتی ئینقیلابی خۆیدا هەشت جار حەبس و حەوت جار تەبعید کرا، بەڵام شەش جار لە تەبعید هەڵات؛ پاش ئینقیلابی فۆریەی ساڵی ۱۹۱۷ لە ئاخرین تەبعید ئازاد بوو و ڕۆیشتە پترۆگراد (لینینگراد)و فەعالییەتی کومیتەی مەرکەزی حزبی بەلشەویکی ڕەهبەری دەکردو ڕۆژنامەی "پراودا"شی بڵاو کردەوە.

لە مانگی مەی ۱۹۱۷ بە عوضوییەتی هەیئەی سیاسیی کومیتەی مەرکەزیی هەڵبژێردراو لە مانگی ئەیلوولی ۱۹۱۷ ڕاستەوخۆ کاروباری شەشەمین کۆنگرەی

---

* سەرچاوە: "کوردستان" (ڕۆژنامە) (بڵاوکەرەوەی بیری حیزبی دێموکراتی کوردستان)، مەهاباد، ژ۱، ساڵ ۱، پێنجشەممو ۱۳۲٤/۱۰/۲۰ (۱۱ی ژانوویەی ۱۹٤٦)، ل۱، ۲.

حزبی بەلشەویکی ڕاهنومائی کردو لە ڕۆژانی ئینقیلابی ئوکتۆبری ۱۹۱۷ لە ڕەئیسی مەرکەزی حیزب لە قیامی موسەللەحانەدا ڕەهبەری کرد.

ئیستالین لە ۱۹۱۷ تا ۱۹۲۳ کۆمیسەری میللیی ئومووری میللییەتی نەتەوەکان و لە ساڵی ۱۹۱۹ تا ۱۹۲۲ کۆمیسەری نەظارەتی کارگەران و جووتیاران بوو و لە ساڵی شەڕی داخلی لەگەڵ لینین سوپای سووری تەشکیل کرد.

لە ساڵی ۱۹۳۲ بە مونشیی کوللی کومیتەی مەرکەزیی حزبی بەلشەویك ئینتیخاب کراو تائێستا لەسەر ئەو شوغڵە بەرقەرارە.

ئیستالین دۆست و هاوکاری دائیمی وەفاداری لینین و هەر لەگەڵ ئەویش حیزبی بەلشەویکی دامەزراندو لە پاشان تەعلیماتی لینینی تەکمیل کرد. یەکێك لە کارە پڕ ئەهەمییەتەکانی کە ئیستالین ئەنجامی دا تەئسیس و تەشکیلی جەمهوورییەکانی میللی و دامەزراندنی ئەوان لە بنەماڵەی یەکگرتووی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەویی سۆسیالیستی و تەئلیفی قانوونی ئەساسیی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەویی سوسیالیستییە.

لە سایەی ڕەهبەریی ئیستالین ئابووری (اقتصاد)ی میللیی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەوی لەسەر پایەی سوسیالیستی دامەزراو نوێ کرایەوەو ڕێخەران و زەحمەتکێشانی شووڕەوی لەژێر فەرمانی ئیستالیندا مەمالیکی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەوییان بە مەملەکەتێکی پایەدارو گەورەی صەنعەتی موبەددەل کردو هێزێکی دیفاعیی شکست ناپەذیریان بەوجوود هێنا.

میللەتی شووڕەوی ئیستالین بە ئەووەڵین نومایندەی شووڕای عالیی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەویی ئستالینی هەڵبژاردو لە شەشەمی مانگی مەی ۱۹٤۱ بە ڕیاسەی شووڕای میللیی ئیتیحادی شووڕەوی تەعین کرا. وەختێکی لە ساڵی ۱۹٤۱ ئاڵمانی فاشیست پەلاماری بۆ ڕووسیا برد، ئیستالین فەرماندەری کوللی نیرەوەکانی شووڕەوی عوهدەدار بوو، تەواوی نەتەوەکانی شووڕەویی بۆ بەسەردازاڵبوون بەسەر ئاڵمانی فاشیست هیدایەت کردو تەواوی گێتیی لە خەطەری نابوودی نەجات دا.

لە نەتیجەی ئەنجامی وەظیفەو خەدەماتی بێمانەندی ئیستالین بە وەرگرتنی دوو نیشانەی "پیرۆزی" نیشانی دەرەجە ئەووەڵ "مەعرووف"و چەند نیشان و میداڵی جەنگی و لەقەبی (قارەمانی کاری سۆسیالیستی)و (قارەمانی ئیتیحادی شۆورەوی) موفتەخەر بوو و لە سایەی کارزانی و بەکارییدا بە ئاخرین دەرەجەی نیظامی (ژانڕالیسمۆس) گەیشت.

## سەمەند سیامەندۆف ڕۆڵەی ڕەشیدی میللەتی کورد*

سەمەند سیامەندۆف ڕۆڵەی ئازای میللەتی کورد کە یەکێك لە نوماینەدەکانی شووڕای عالیی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەویی سۆسیالیستی ئەرمەنستانە؛ چوار ساڵ پێش ڕەوانەی جەبهەی شەڕ بوو. لە ڕۆژانی هەووەڵی شەڕدا ڕەوشتی بەرزو بڵندی سەربازیی خۆی کە یەکێك لە ئاکاری بێباکیو شەڕکەریی سەربازانی ئیتیحادی شووڕەوییە لە مەیدانی شەڕدا، نواندی.

سەرهەنگی ٢ سیامەندۆف لە پاراستنی مۆسکۆدا شیرکەتی کرد. ئەم قارەمانە ئەیزانی کە دیفاع لە مۆسکۆ دیفاع لە قەلبی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەوییەو، خاترجەم بوو کە ئەم پاراستنە ژیانی سەختو گرانی چادرنشینیو کۆچەریی کورد؛ کە لە سایەی وەکاربەستنی سیاسەتی عاقڵانەی لەنینو ئاستالین بە ژیانێکی شارستانێتی گۆڕدراوەتەوە، دەپارێزێ، وە بەم جۆرە بۆ پاراستنی ژیانی بەختیاریی میللەتی کورد مەردانە شەڕی دەکرد.

ساڵی ١٩٤٤ نوێ بۆوە، فاشیستە خوێنخۆرەکان لە مەنطیقەی مینسكو بابروسك بە سەرسەختییەکی بەتین بەربەرەکانییان دەکرد. سەربازانی سوور قەڵاو سەنگەرە قایمەکانی ئاڵمانیان تێك شکاندو دەستیان بە پێشڕەوی کرد. لە بەینی ئەم شەڕە بەترسەدا فەرماندەیی شووڕەوی بە سیامەندۆف دەستووری دا: کە هێزی دوژمن دەورە بداو نابوودیان بکا.

سیامەندۆف ئەم مەئمووریيەتەی زۆر بە ئازایی ئەنجام داو ٤٤٧ ئەفسەرو سەربازی دوژمنی بە دیل گرت. لە مەئمووریيەتێکی دیکەی جەنگیدا لەگەڵ سەربازەکانی، ١١ پەلاماری دوژمنی ڕەد کردەوەو لە یەکێك لەو شەڕانەدا تەنیا خۆی ١٣ ئەفسەرو سەربازی ئەڵمانی لەناو برد.

ڕۆژێك لەو ڕۆژانە قیسمەتێکی لەژێر فەرماندەیی سیامەندۆفدا بوو؛ ئەبوایە پاش دامەزراندنی تۆپخانە، لە چۆمی ناریف بپەڕێتەوە. هێزی دوژمنیش ئەیەویست لەو چۆمە بپەڕێتەوە. فەرماندەیی دوژمن لەشکرێکی تانکی هێنابوە مەیدانی شەڕ، بەتەواوی هێزی خۆی ئەیەویست بەرهەڵستیی پەلاماری نەیرووی شووڕەوی بکا. شەڕێکی سەخت دەستی پێ کرا، سیامەندۆف بۆ تەشویقی سەربازەکانی بە

* "کوردستان"، ژ٦٣، ساڵ ١، دووشەمموو ١ی ڕێبەندانی ١٣٢٤(٢١ی ژانوویەی ١٩٤٦)، ل ١، ٤.

دەنگێکی بڵند هاواری کرد: بەتایبەتی نابێ هەنگاوێك بکشێنەوە. تەنیا بە پێش، بە پەلامار، بۆ پاراستنی نیشتمان و بۆ ئاستالین بە پێش!

سەربازەکانی سیامەندۆف وەغیرەت کەوتن؛ پاش ڕەتکردنەوەی پەلاماری دوژمن و گەیشتنی نەیرووی یاریکاری، پەلاماریان بردو لە نەتیجەدا ١٠ تانك و ٧٠٠ سەربازو ئەفسەری ئەڵمانیان لەناوبرد.

لە نەتیجەی بێباکی و ئازاییی سەربازەکانی سیامەندۆف، بۆ سەربازەکانی تری شووڕەویش ڕێگا کراوەو توانییان لە چۆمی ناریف بپەڕنەوە. نیشتمانی شووڕەوی، لە ڕەشادەتی سیامەندۆف قەدردانیی کردو لە بەرامبەر ئەم شەجاعەت و لەسەر فەرمانی هەیئەی ڕەئیسەی شووڕای عالیی ئیتیحادی شووڕەویی سوسیالیستی بە لەقەبی پڕ ئیفتیخاری قارەمانی ئیتیحادی جەماهیریی شووڕەویی سوسیالیستی سەربڵند بوو.

لە نامەیەکدا کە "لینثان ژانراڵ گوسۆف"و "ماژۆر ژانراڵ ئیسیۆمین" بۆ باوکی سیامەندۆفیان نارد، بەم جۆرەیان نووسیبوو: ((کوڕی تۆ سەرهەنگی ٢ سیامەندۆف، لە شەڕی ئیشغالگەرانی ئەڵمانیدا بە ئەفسەرێکی ڕەشیدو گیانفیدای نیشتمانی شووڕەوی ناسراوە. کوڕی تۆ بێوەی کە دەربەندی گیان و زیندەگیی بێت، وەظایفی جەنگیی خۆی ئەنجام دا، وە بێئەوەی کەمێکی بەزەیی بە دوژمنی خوێنخۆردا بێت، سەربازانی ئەوانی لەناوبرد، سەرهەنگ سیامەندۆف لە سەختترو بەتینتر لەحەظاتی شەڕدا شەخصەن قیسمەتە تیرئەندازی و گوردانەکانی جەنگی ئیدارە دەکرد. وە بەهۆی عەمەلییاتی جەنگیی خۆیەوە تەلەفاتێکی قورسی بە دوژمن داو هێزی میکانیزی ئەوانی لەناو بردو پیرۆزیی سەربازەکانی ئێمەی فەراهەم کرد.

ئەتۆ "ڕەفیق سیامەندۆف" کە باوکی ڕۆڵەیەکی وا ئازاو ڕەشیدی، وە ئەوت وەك قارەمانێکی ئیتیحادی شووڕەوی گەیاندووتێ، ئێمە سوپاست ئەکەین. وە لە کانگای دڵەوە سەلامەتی و سەرکەوتنت لە یەزدان داوا ئەکەین)).

سەمەند سیامەندۆف کوڕی عەلی سیامەندۆف لە ساڵی ١٩٠٩ لە ئەیالەتی کارکاس لە بنەماڵەی شوانێك لەدایك بوو. بنەماڵەی سیامەندۆف لە شەڕی هەووەڵدا بۆ تەفلیس کۆچیان کردو تا ساڵی ١٩٢٦ لەوێ بوون.

باوکی سەمەند سیامەندۆف کارگەرێکی باربەری زیاتر نەبوو. لە ساڵی {؟} ئەو خانەوادەیە هاتە ناحیەی ئایباران. لە ساڵی ١٩٢٤ سەمەند سیامەندۆف بوو بە

عوضوی سازمانی ئیتیفاقی لاوانی کومۆنیستو له ساڵی ١٩٣١ به عوضوییەتی حیزبی کومۆنیستی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەویی سوسیالیستی قەبووڵ کرا.

سەمەند سیامەندۆف لەپێشدا تەحصیلاتی خۆی له دانشتگەدەی ڕۆژهەلاتی ئیتیحادی شووڕەویی لەنینگراد تەواو کرد، لەپاشان بوو به دەبیری ئەووەڵی حیزبی کومۆنیستی ناحیەی ئەرمەنستان.

له ساڵی ١٩٣٨ سەمەند سیامەندۆف به نومایەندەگیی شووڕای عالیی (حەوزەی ئالاگز) هەڵبژێردراو پێش شەڕی ئەخیر له کلاسه تایبەتەکانی حیزبی کومۆنیستی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەوی به سەمتی گوێڕاگری ئازاد شیرکەتی کرد.

(له "دوست ایران" وەرگیراوه)

## به ١٠ ڕۆژ ڕێگای شەش ساڵ*

له ژمارەی ١٠ی ئەو ڕۆژنامه خۆشەویسته ئاغای فەتاحیو له ژماره ١٤دا ئاغای ئۆطەمیشی لەخصووص گۆڕینی ئەلفباء دووابوون، منیش ئەمەوێ نەظەری خۆم به عەرضی خوێنەره خۆشەویستەکان بگەیەنم:

لەولایەنەوه؛ نەك تەنیا من، بەڵکوو هەر کوردێکی زیندووبوونەوەو سەرکەوتنی فەرهەنگی کوردی مەنظوور بێت، ڕای ئاغای فەتاحی پەسەند دەکا. گۆڕینی ئەلفباء نێزیکترین ڕێگایەکه بۆ پێشکەوتنی زانستو زۆربوونی خوێندەواران، به جۆرێکی وەها که له ماوەیەکی کەمدا تەنانەت یەك نەفەر بێسەواد لەناو کوردەواریدا نابیندرێ.

لەوەی پێش که خوێندنو نووسینی زمانی کوردی ئازاد نەبوو، ئەبوایه منداڵانی کورد دەستی کەم ٦ ساڵ عومری خۆیان بەفیڕۆ بدەن، هەروەها لەو وڵاتانه که به زمانی کوردیش دەخوێنرا کۆڵه سەودایەك چەند ساڵ خوێندنی لازم بوو. بەڵام ئەگەر ئەلفبای هاسان بێته ڕووی کار، هەموو کەس له ماوەی ١٠ ڕۆژدا دەتوانێ به میزانی ٦ ساڵی پێشوو له زانستو ئەدەبیاتی کوردی سوود وەرگرێ. منداڵانو نەخوێندەوارانی کورد به مەحضی فێربوونی ئەلفبائی هاسان له تەواوی ڕمووزی خوێندنو نووسینی زمانەکەی خۆیان دەگەن.

---

* "کوردستان"، ژ٢١، ساڵ ١، شەممو ١١ی ڕەشەمەی ١٣٢٤ (٢ی مارسی ١٩٤٦)، ل٣.

بەڵام هەڵبژاردنی ئەلفباء بۆ زمانی کوردی؛ لەو جێگایانەدا کە لەوەی پێش خوێندنو نووسینی کوردی ئازاد بووە، جەلبی نەظەری زانایانی کوردی کردووەو ئیختیلافی عەقیدەش زۆرە! جەنابی تۆفیق وەهبی لە ضمنی نووسینەوەی دەستووری زمانی کوردی ڕای خۆی نووسیوەتەوە، بەڵام چەندان پەسەند نییە.

کوردانی سووریەش بە لەونێکی تر ئەلفبایان دەکار کردووەو چەند ساڵە گۆڤارو ڕۆژنامەی پێ دەردەکەنو لە نوقاطی تری کوردستانیش تا ئەندازەیەك پەیڕەوی ئەوان دەکەن. وە بە عەقیدەی من چاکتر ئەلفباییێکی کە تائێستا بۆ زمانی کوردی پێشنیهاد وەیا دەکار کراوە، ئەو ئەلفبایەیە. ئیتر بەستەیە بە نەظەری هەیئەتی فەرهەنگی کە موطالەعاتی لازمی تێدا بکا.

### وتاری محەمەدی شاپەسەندی*

لە (جێژنی سەربەخۆیی و ناساندنی سەرۆك جەمهووریی بەرزی کوردستان لە چاپخانەو ئیدارەی ڕۆژنامەو گۆڤاری "کوردستان")دا کە ڕۆژی ١٣٢٤/١١/٥ بەڕێوە چوو:

بە ناوی کارگەرانی چاپخانەی کوردستان، ئەو ڕۆژە بە پێشگاهی حەضرەتی پێشەوای کوردستانو تەواوی نەتەوەی کورد پیرۆزە عەرض ئەکەم. وە هیوادارم تا ئەبەد ڕۆژتان پیرۆزو گەلی کورد لەژێر سێبەری وجوودی حەضرەتی پێشەوای کوردستاندا سەربڵندو ئازاد بێت.

لەو وەختەدا کە میللەتی کورد زنجیری دیلی و یەخسیریی، بە لیباسی سوورو سپی و کەسکی ئازادی گۆڕیوەتەوە؛ ئێمە لەهەموولایەکەوە لە باوەشی سەعادەتداین. وە لەعەینی حاڵدا، لە سێ لاوە خۆشبەختی و سەربڵندی ڕووی تێکردووین؛ هەووەڵ خۆشبەختیمان سەربەخۆیی کوردە کە لە سایەی فیداکاریی پێشەوای بەرز (جللەکەی؟) عەمەلی کردو هاتە بەر. دووەم سەعادەتمان ڕوونبوونەوەی چاومانە بە قودوومی موبارەکی پێشەوای گەورە، سێیەم سەربڵندیمان ئیفتیخاری کارگەریی هەووەڵ موئەسسەسەیەکی میللیی کوردە کە بە ڕاستی یەکێك لە بەرجەستەترین ئیفتیخاراتی ژیانمانە.

---

* سەرچاوە: کوردستان، ژ١٧، چوارشەموو ١ی ڕەشەمەی ١٣٢٤ (٢٠ی فوریەی ١٩٤٦)، ل١" ژمارە ٢١، شەموو ١١ی ڕەشەمەی ١٣٤، (٢ی مارسی ١٩٤٦)، ل١، ٢.

ئێمە بۆ شوکرانەی ئەو هەموو نیعمەتە غەیرەز فیداکردن و لەبەر پێداڕژتنی چەند تنۆکە خوێنی گەرم کالاێیکی قابیل شك نابەین و موسەللەمە لە موقابیل بەخشش و جاهو جەلالی سلێمانی دادیاری مێرووله تەنیا باڵە کوللەیەکە. بەوبۆنەیەوە هیوادارین پێشەوای بەڕێز بۆ نیساری ئەم چەند تنۆکە خوێنە ئیجازە بفەرموون، بەڵکی خوا مووەفەقمان بکا بە سێ ئاواتی تر کە تائێستا هۆی خرتەی دڵمان بووە، بگەین؛ هەووەڵ بۆ شەهیدان و فیدائیانی ڕێگای سەربەستیی کورد کە لەژێر خاکیشیان چاوەنواڕی ئەو ڕۆژەن مزگێنی بەرین کە ئەوا ڕۆژی ئازادیی کوردە، ئەودەم گێتی بزانێ کە کورد هەمیشە لەپێناو ئازادیدا نرخێك بۆ گیان و خوێنی قابیل نەبوە. سێیەم بتوانین هەزاران یەکی ئەم شوکرانە گەورەیە بژمێرین و تا ئاخرین هەناسە فیداکاری لەو ڕێیەدا بەرنامەی ژینمانەو ئیفتیخاری ئەو پێشگیرە چڵکنەی کە بە خۆمانەوە گرتووە بە تاج و تەختێکی بێگانە ناگۆڕینەوە. لە ئەنجامدا بە ئیحساساتێکی پاك هاوار ئەکەم! بژی بە ژیانێکی ئەبەد پێشەوای کوردستان، بژی کوردو کوردستانی گەورە، بژی پێشمەرگان و فیدائیانی ڕەشیدی کورد، بژی پێشەوای کارگەران و زەحمەتکێشانی گێتی.

## هۆردووی پێشکەوتن*

(لە "وطن یولندا" وەرگیراوە)

ئەوڕۆ (٢٣ی فووریە) ٢٨ ساڵەی بەناوبانگی هێزی موسەللەحی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەوی تەواو دەبێت. هۆردووی سوور کە دامەزراوو هەڵبژێردراوی گەورە هەڵکەوتوەکانی بەشەر: لینین و ستالینە، ڕەشیدی و نەبەزیی خۆی لەناو ئاگرو بڵێسەی شەڕی نیشتماندا نواند.

ئەو وەختە کە بێگانەکان و بەرهەڵستانی خۆیی ئینقیلابی داخیلی؛ بۆ لەناوبردن و خنکاندنی دەوڵەتی نوێبونیادو ساوای ئیتیحادی شووڕەوی کۆششیان دەکرد؛ هۆردووی سوور لە کێشکی نیشتمانی سۆوێتدا قایم ڕاوەستا. ئازایی و ڕەشیدییەکی بێ‌مانەندی نیشان دا، پاش ئەوە لە ساڵانی ئاسوودەییدا ئیتیحادو یەکەتیی شووڕەویی زیادو قایمتر کرد.

---

* "کوردستان"، ژ٢٣، ساڵ ١، چوارشەممو ١٥ی ڕەشەمەی ١٣٢٤ (٦ی مارسی ١٩٤٦)، ل٢، ٤.

هۆردووی سوور کاتی شەڕ لەگەڵ دەستەی (فین ئاغ غوارد)، وە لە ڕۆژهەڵاتی دوور؛ لە پاماڵکردنی ژاپۆنیە غەصبکارەکان کە ئەیانەویست ئەمنییەتی سنووری موقەددەسمان تێك بشکێنن؛ دووەم ئیمتیحانی لە خۆی دا.

هۆردووی سووری هەڵکەوتوو و ناودار، ئازادیخواه، بەحورمەتو خۆشڕوو و عاملاو، لە کێشکی ئازادیو ئیستیقلالی نیشتمانو صولحو ئەمنییەتی نەتەوەکان، وە شەڕ لەگەڵ ئاڵمانی فاشیست؛ مەردانەگیو نەبەزیی خۆی ثابت کرد. ئەم سێیەمین ئیمتیحانەی کە هۆردوەکەمان دای، تائێستا لە مێژووی گێتیدا مانەندی نەبینراوە.

بە کانگای هێزو ئازاو سەرکەوتوو ناسراوی هۆردووی سوور، سیاسەتی ڕاستەقینەی فیرقەی کومۆنیست، پێشڕەفتی کۆمەڵایەتی؛ هەموو نەتیجەی سیاسەتو ڕەهبەریو کارامەییی بەناوبانگی ستالینە. هۆردووی سوور تەنیا هۆردووێکە کە لەڕێی عەدالەتو ئازاییدا کۆششکارو لە ئاڵای موقەددەسیان ڕێوشوێنی سەربەخۆییو خۆشبەختی بۆ نەتەوەکان نووسراوەتەوە.

گەورەی هەڵبژێردراوو هەڵکەوتووی گێتی ستالین، ئیفتیخارو هومێدی میللەتی شووڕەویو گەورە پێشەوای هۆردووی ڕەشیدی سوورە. ئێمە، پێش هەموو شتێك لە فیرقەی کومۆنیستو پێشەوای گەورەمان ستالین لەبەر ئەوەی منەتدارین کە هۆردووی سووریان بە ئەسلەحەی چەرخی تازە، سەرکردەکانی کاردیتوو و بەتەجرەبە، ئامادە کردو کردیانە هەووەل هۆردووی گێتی.

ستالین لە زانستی شەڕو پێشکەوتندا کارزانێکی گەورەیە، سەرکردەییو کارامەییی ستالین، ئێمەی لە بەسەرهاتێکی تاڵو گرینگ نەجات دا.

ئاشکرایە کە بەتینیو بێئامانیی شەڕی دووەم لە مێژووی گێتیدا هاوتای نەهاتۆتە بەرچاو. لە شەڕێکی وا گەورە دەگەڵ دوژمنێکی وا بەهێز، سەراپا غەرقی ئەسلەحە، بە خوێنی بەشەر تینوو، نە لێقەومانو نە تەنیا دەفعکردنی، بەڵکوو پاماڵکردنو لەناوبردنی، کارێکی ئاسان نەبوو.

لە شەڕی دوژمندا بۆ تەئمینی غەلەبەو سەرکەوتن، لەپێشدا بۆ بەربەرەکانی ئامادەبوونی پێ دەوێ. لەو کارەدا ستالین سەرکردەیەکی دووربینو کارامە وەدەر کەوت.

بە دەردی ستالین دەڵێ: لە بە ئازاو ڕەشید خۆنیشاندان، قازانجی پێشکەوتن دەس ناکەوێ. لەگەڵ دوژمنێکی بەهێزو پڕچەکو ئەفسەرانی تەعلیم دیتوو، تەنیا ئازایی بەکار نایەت. بۆ ڕاوەستان لەپێش پەلاماری دوژمنێکی وا بێئامانو

دەفعکردنی، وە لەسەر ئەوەشڕا پامالکردنی، جگە لە نەبەزیو ڕەشیدیی هۆردوەکەمان، تەجهیزاتێکی لەسەر ڕێوشوێنی چەرخی حاضرو تەشکیلاتێکی ڕاستو چاکی پێ دەوێ.

بەهۆی هێزی نیشتمانو زاناییو شارەزایی لە بەربەرەکانیدا، ستالین ڕۆڵی نەقشەیەکی ٥ ساڵەی بازی کرد. میللەتی قارەمانی شووڕەوی جێژنی تاریخیی هۆردووی سوور، پاش پامالبوونی ئالمانی فاشیستو ژاپۆنی سەربزێو، بە ئاسوودەییو خاترجەمی، بە جاهو جەلالێکی بێمانەند دەگرێ. وە لە هۆردووی سووری خاوەن شەرەفو لەسەر وەظیفە پابەرجا، نەبەزو ئازا، وە سەرکردەی هەڵکەوتوومان ژانڕالیسمۆس ستالین لە گیانو دڵ سوپاسو شادباش دەکا. وە لە هەموو لایەکەوە بەناوی بەهادوری ناوداری نیشتمانەکەمان ئەو هاوارە بڵیند دەبێ:

بژی هۆردووی سـووری سـەرکەوتووی میللەتی شـووڕەوی

شادیو عەشق بێ، بۆ پێشەوای گەورەی گێتی ستالینی بەناو!

## م. ئی. کالینین*

میخائیل ئیوانۆیچ کالنین ڕەئیسی هەیئەتی ڕەئیسەی شووڕای عالیی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەویی سوسیالیستیو ئەندامی هەیئەتی سیاسیی کومیتەی ناوەندیی حزبی کومۆنیست (بەلشەویك)ی ئیتیحادی شووڕەوی؛ یەکێك لە بەلشەویکە کۆنەکانو هاوکاری وەفاداری لینینو ئیستالینی پیاوێکی ماقووڵی ئیتیحادی شووڕەوییە.

کالنین لە٢٠ی نوامبری ساڵی ١٨٧٥ لە ئەیالەتی تور (کالنینی ئێستا) لەدایك بوو، لە تەمەنی ١٤ ساڵییەوە بۆ دۆزینەوەی کار ڕۆیشتە پوطرزبورگ. لە ساڵی ١٨٩٣ لە کارخانەی (زرادخانەی پێشوو) بە شاگردی دەستی بەکار کرد. وە ضمنەن لە قوتابخانەی شەوانە خەریکی فێربوونی زانست بوو. لە ساڵی ١٨٩٦ لە کارخانەی (پوتلیف) مەشغووڵی کار وە بوو بە یەکێك لە ئەندامەکانی گەورەی یەکێتیی بەربەرەکانی لەپێناو ئازادیی طەبەقەی (کارگەر)ەوە کە لەلایەن لینینەوە دامەزرابوو. لە ساڵی ١٨٩٨ هاتە ناو حزبی کارگەری سوسیال دێموکراتی ڕووسیو چەند جار تووشی زیندانو تەبعید بوو.

---

* "کوردستان"، ژ٢٤، ساڵ ١، چوارشەممەو ٢٢ی ڕەشەمەی ١٣٢٤ (١٣ی مارسی ١٩٤٦)، ل١، ٨.

ساڵی ١٩٠٤ بۆ ئەیالەتی ئەلونتس تەبعید کرا. وە لە ساڵی ١٩٠٥ گەڕاوە پوطرزبورگ‌و دیسان لە کارخانەی پولتیف چووە سەر کار. وە ئەندامەتیی کومیتەی حیزبی بەلشەویکی ناحیەی نارواشی بەدەستەوە بوو. وە لە پێکهێنانی ئینقیلابی ڕووسیە بێ‌وچان شیرکەتی کرد. لە بەینی ساڵانی ١٩٠٨و ١٩١٠ لە حیزبی بەلشەویکی ناحیەی مسکۆ بەدزیەوە کارو کۆششی دەکردو لە ساڵی ١٩١١ تا ١٩١٧ پێشکەوتن‌و کۆششی ئینقیلابی کارگەرانی پوطرزبورگی هەڵدەسووڕاند.

کالینین، یەکێك لە ئەندامانی هەیئەتی نووسەرانی ڕۆژنامەی بەلشەویکی "پراودا" بوو و لەگەڵ لنین‌و ئاستالین موکاتەبەو نێوانی هەبوو.

کالنین، لە ڕۆژانی ئینقیلابی گەورەی ئۆکتۆبری سۆسیالیستی، یەکێك لە سەردەستە ماقووڵەکانی قیامی موسەللەحانە بوو. وە لە هەشتەمین کۆنگرەی حیزبی کومۆنیستی ڕووسیە کە لە ساڵی ١٩١٩ دامەزراو بە ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندی دیاری کرا. هەر لەوساڵەدا پاش سوردلف‌و لەسەر ناساندنی لینین بە سەرۆکێتیی کومیتەی ناوەندی‌و وەکارخستنی ئیجرائیییەی تەواوی ڕووسیە هەڵبژێردرا. وە لە ماوەی ڕابردووی شەڕانی داخلی؛ کالنین زۆر جاران چۆتە جەبهەی شەڕو هۆردووی سووری تەشویق دەکرد. بەوبۆنەوە لە بەرامبەر خەدەماتی چاکی جەنگ بە وەرگرتنی دوو قەطعە نیشانی (ئاڵای سوور) سەرفراز بوو. کالینین لە ساڵی ١٩٢٦ پاش چواردەمین کۆنگرەی حیزبی کومۆنیست بە ئەندامی هەیئەتی سیاسیی کومیتەی ناوەندی ئینتیخاب کرا.

کالینین لە ساڵی ١٩١٩ لە ڕەئسی دەسگای قەضای عالیی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەویدا بوو، وە لەپێناو بەهێزکردنی بناغەی شووڕەوی‌و بۆ وەکاربەستنی سیاسەتی میللیی لینین‌و ئاستالین بەربەرەکانی‌و کۆششێکی زۆری کرد.

ساڵی ١٩٣٥ لە بەرامبەر خەدەماتی چاکی خۆی لە ڕێگای دامەزراندن‌و قیامکردنی هەووەڵ دەوڵەتی سوسیالیستیی کارگەران‌و جوتێران لە گێتی، بە وەرگرتنی یەك پارچە نیشان (لینین) سەربڵند کراوە.

بەبۆنەی ٢٥ ساڵ کۆششی بێ‌وچان، کالینین بە ڕیاسەتی دەسگای عالیی دەوڵەتی شووڕەوی وە لە پاداشتی ئەو هەموو کۆششەدا، لە ٣٠ی مارسی ١٩٤٤ لەلایەن هەیئەتی ڕەئیسەی شووڕای عالیی ئیتیحادی جەماهیری شوورەویی سوسیالیستی، بە ناوبانگی (قارەمانی کاری سوسیالیستی) سەربەرز بوو.

کالینین لە ڕۆژانی شەڕی نیشتمانیدا تەواوی کۆشش‌و بیرەوەریی خۆی لە ڕێگای سەرکەوتن‌و پیرۆزیی نەتەوەکانی شووڕەوی بەسەر فاشیستەکاندا وەکار کرد. وە بە کارزانییەکی تەواو میللەتی شووڕەویی بۆ بەربەرەکانیی ئابووری (اقتصاد)و نیظامی بانگ دەهێشت. کالینین لە ڕۆژی ١٩ی نوامبری ١٩٤٥ بە بۆنەی ڕۆژی حەفتامین سالّی لەدایکبوونی‌و لە موقابیل خەدەماتی بەناوبانگی بە وەرگرتنی یەك پارچە نیشانی (لینین) سەرفراز کرا.

## ئێمە ڕۆڵەی کوردین*

ئێمە ڕۆڵەی کوردین، کوردستانی مەزن نیشتمانی ئێمەیە. سەرنویشتی ئەو نیشتمانە خۆشەویستە لە دواڕۆژدا دەکەوێتە بەر دەستی ئێمە. بۆ دواڕۆژ مەسئوولییەتی پارێزگاریی‌و ڕاگرتنی سەربەرزیی‌و ئازادیی کوردستان لە ئەستۆی ئێمەیە. ئازادیی ئەوڕۆی کوردستان کە مایەی خۆشبەختیی ئێمەیەو نەتەوەکەمانە، بە خوێنی گەنجان‌و لاوانی کوردو کۆشش‌و فیداکاریی پیاوانی ڕەشید هاتۆتە بەرهەم‌و بە ئێمە دەسپێردرێ کە هەمیشە بەرزو بڵیندی ڕابگرین.

ئەگەر بێتوو بە چاکی نەتوانین ئەو گەوهەرە گرانبەهایە پارێزگاری بکەین، لەبەرانبەر خودا، نیشتمان‌و گیانی شەهیدانی ڕێی ئازادی ڕووزەردو سەربەرەژێر دەبین. جا خۆ ئێمە بە خۆمان دەڵێین ڕۆڵەی کورد، ڕۆڵەی کوردیش ژیانی بۆ سەربەرزیی نیشتمان‌و مردنی لە ڕێگەی ئازادی‌و خۆشبەختیی کوردستان بووە. ئێمەش ڕۆڵەی ئەو پیاوە ڕەشیدانەین، کە لەپێناو ئازادیی کورد هەڵاوەسراون‌و مردنیان لە ژیانی دیلی‌و چارەڕەشی پێ چاتر بووە. ئێمەش هەرگیز ڕاضی نابین ناوی پاکی کورد بە ئێمەوە پەڵەدار بێت. ئێمەش وەك باب‌و باپیرانمان بۆ کوردو کوردستان دەژین‌و لەڕێی بەرزێتیی کوردستانیشدا سەر دەنێینەوە.

بۆ ئەوەی بەو ئامانجە پاکە بگەین، هەر لەئێستەوە خۆمان بە زانست‌و هونەر ئامادە دەکەین. تا هێزی نیشتمانپەروەریی‌و گیانبازیمان قەویترو بەهۆی زانست‌و فیداکاری بتوانین لە دواڕۆژدا بەسەر وەظیفەی موقەددەسی خۆماندا زاڵ بین.

---

* "گروگاڵی منداڵانی کورد" (گۆڤار)، مەهاباد، ژ٣، ساڵ ١، پووشپەڕی ١٣٢٥، ل٨-٩.

سەرچاوە: د. هیمدادی حوسێن، گۆڤاری گروگاڵی منداڵانی کوردو سەرەتای ڕۆژنامەنووسیی پەروەردەیی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە- هەولێر، ٢٠٠٢ (زنجیرەی بڵاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی (٧)).

## چەند تێبینییەك لەبارەی
## "حکومەتی کوردستان، کورد لە گەمەی سۆڤیێتیدا"*

بە پێداچوونەوەی ناوی دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی (ژ. ك) کە نموونەی وشیاریو باسەوادیو ڕۆشنبیریی کۆمەڵی کوردەواریی ئەوسا بوون، وەبیرمان دێتەوە کە هیچ کامیان سیاسی یا تەحسیلکەردەی دانیشگاهی نەبوون.

پاش شەهریوەری ١٣٢٠ کۆمەڵی کوردەواری لە کوردستانی ئێران، بەتایبەتی ڕۆشنبیرەکان لەگەڵ ڕووداوێك ڕووبەڕوو بوونەوە کە لەپێشدا خۆیان بۆ ئامادە نەکردبوو، بەڵکوو لە خەویشدا ئەمەیان بە بیردا نەدەهات کە ڕژێمی دیکتاتۆری ڕەزا شا بە چاولێك نانێك بڕووخێو ئەو خەڵکە لە زیندانی گەورەی ڕژێم ڕزگار بن!

بۆیە زۆربەی ڕووداوەکانی ئەوسا بۆنی کاڵیو ساکاریی لێ دەهاتو نەدەگەیشتە ئەو پوختەیەی کە بۆ ئەو هەلومەرجە دەبوو. ئەوپەڕی ئامانجی کۆمەڵە، ڕزگاریو ئازادیو دیموکراسی بوو. (ژ. ك)و بەشی زۆری کوردەواری سۆڤیێتیان بە ڕزگارکەر ئەژماردو دەیانەویست خۆیان لەگەڵ هەلومەرجی ئەوساو شیعارە پێشکەوتووخوازەکان جۆر بکەن. بۆیە سەیر نییە کە "نیشتمان"و چاپەمەنیەکانی تر سڵاوتیان لە دیداری ستالین لێ دەداو بیۆگرافیی سەرانی سۆڤیێتیان بە کوردی بڵاو دەکردەوە.

دوای گۆڕینی ناوی (ژ. ك) بە (حیزبی دیموکراتی کوردستان)، هەوڵی باش درا کە کورد لە کاروانی پێشکەوتندا لە ئازەربێجان دوا نەکەوێ. بەڵام زۆر زوو دەرکەوت کە جیاوازێکی زۆر هەیە لەبەینی ئەو هەلومەرجانە کە بۆ کوردستانو ئازەربێجان ڕەخساون. کورد لە هەر چوار لاوە دراوسێیەکانی دوژمنی بوونو سۆڤیێتی (ڕزگارکەر)یش ماوەی نەدا کە وەك میللەتێك یا نەتەوەیەکی جیاواز سەر بەرز بکاتەوەو دەیەویست بەزۆری بیلکێنێ بە ئازەربێجانەوەو بە پارچەیەك لە ئازەربێجان لە قەڵەمی بدا. پارچە شیعرێکی فارسی هەیە کە چۆنێتیی بەسەرهاتی کورد لەو سەردەمەدا پیشان دەدا، کورتیەکەی ئەمەیە، دەڵێ: ((جارێکیان قەسابێك لە دەرەوەی شار مەڕێکی بەستەزمان لەدەس گورگێك ڕزگار دەکاو دەیهێنێتەوە بۆ شارو لەوێ سووكو هاسان سەری دەبڕێو ئەنجا سەری مەڕەکە بە زمانی حاڵ ڕوو دەکاتە قەسابەکەو دەڵێ: ڕاستە تۆ منت لەدەس گورگ نەجات دا، بەڵام لە ئەنجاما تۆ بۆ من بووی بە گورگ!

---

* "کوردستانی نوێ" (ڕۆژنامە)، هەولێر، ژ٦٩٠، ٢٠/٥/١٩٩٤، ل٣.

زۆر باشم لەبیرە پاش ڕێککەوتنەکەی قازی- پێشەوەری فشاریان خستە سەر حکوومەتی کوردستان تا تەنانەت دروشمی حیزب و حکوومەت لەسەر دەرگای ماشێنە حکوومەتیەکانیش بسترێنەوە. بە پێچەوانە، ئازەربێجان ڕابردووی بزووتنەوەی سیاسیی باشی وەك هی زەمانی مەشرووتییەت و باقرخان و ستارخان و شێخ محەمەدی خەیابانی ... تاد هەبوو. جگە لەوەش، سۆڤێت و حیزبی توودە بە هەموو توانایانەوە یارمەتییان دەدا. ئەمەیە کورتەی مێژووی ئەوسا، بۆیە ڕەوا نییە ئەو مێژووە ساکارە بخرێتە چوارچێوەی ئایدیۆلۆژیاتی نوێ و یا تەنیا ئەو بەشانەی لێ وەرگیرێ کە دەگەڵ بیروباوەڕی دونیای ئەمڕۆ دەگونجێ.

پاش دەرچوونی کتێبی (چل ساڵ خەبات لەپێناوی ئازادیدا)، لە ١٩٨٦/٢/١ نامەیەکی دوورودرێژم بۆ شەهیدی نەمر دوکتۆر قاسملۆ نووسی و تێبینیەکانم لەگەڵ سیاسەتی کوردیی سۆڤێتیی ئەوسا بۆ شی کردۆتەوە کە سیاسەتێکی دۆستانە نەبوو، بگرە سیاسەتێکی دژی کورد بوو.

ئەو کتێبانەی تائێستا لەسەر مێژووی (ژ. ك) و حکوومەتی کوردستان نووسراونەتەوە، کەموکوڕی و تێکەڵاوییان یەجگار زۆرەو بە ناتەواویش ماونەوە. لێرەدا کتێبەکەی مامۆستا نەوشیروان لەم لایەنەوە کەلێنێکی باشی پڕ کردۆتەوە. گرنگی و پوختەیی ئەم کتێبە لەمەدایە کە بەشی هەرە زۆری سەرچاوەکان لە بڵاوکراوەکانی (ژ. ك) و (ح. د. ك)ن، بگرە دەقی ئەم سەرچاوانە بە هەمان زمان و زاراوەی موکریان نووسراوەتەوە.

### چەند تێبینییەك

### دامەزرێنەرانی (ژ. ك):

من لەنزیکەوە میرحاجی ڕەحمەتی و شەهید مستەفا خۆشناوم دەناسی و ئاگام لە دەوریان هەبوو. زۆر ئێواران ئەم دوانەو زەبیحی و من دەچووین بۆ سەر گەڕاوەکانی لای پردی سووری سابڵاخ و تا دیروەخت دەماینەوەو بە باسی تەجروبەی کوردایەتی لە کوردستانی عیراق و سیاسەتی ڕۆژو قسەی خۆش ڕامان ئەبوارد. جگە لەوەش، من لە ماوەی چل ساڵی برادەریی خۆم لەگەڵ عەبدوڕەحمان زەبیحی قەت لێم نەبیستووە کە میرحاج لە دامەزرێنەرانی (ژ. ك) بێ.

**(ژ. ك)و سۆڤییەت:**

لەوکاتانەدا کە من بۆ کاری بازرگانی لە تەوریز بوومو یارمەتیی زەبیحیم ئەدا لە لەچاپدانی "نیشتمان"و قاسم ئاغای ئیلخانی زادەش لە تەوریز بوو لە (گراند هتل)و دەوری ڕاوێژکاری دەبینی، زەبیحی پێوەندیی باشی هەبوو لەگەڵ کۆنسلگەریی سۆڤیێت، بەتایبەتی لەگەڵ حەسەنئۆف کۆنسولی سۆڤیێتو دەستی کەم ئاگام لە دوو یاداشت هەیە کە زەبیحی لە کوردییەوە دەیکرد بە ئازەریو دەدرا بە حەسەنئۆف. ئەمە جگە لەو پەیوەندیانەیە کە لە سابڵاخو میاندواو و جێگای تر دەکرا.

**گیرانی زەبیحیو هاوڕێکانی:**

زەبیحیو قاسم قادری لە گەڕانەوە لە پەیمانی سێ سنووردا گیران، بەڵام لەبیرم نییە کە دڵشادیان لەگەڵ بوو یان نا، نازانم بۆ سەرلەشکر زەنگنە بەو بارەدا گۆڕیویێتی؟!

**چۆنێتیی دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان:**

دوای بڵاوبوونەوەی ژمارە (٧و ٨و ٩)ی "نیشتمان"، مەکینەیەکی بچووکی چاپو هێندێك حەرفمان پەیدا کرد. قەرار بوو ئیتر "نیشتمان" لە سابلاغ چاپ بکەین. وابوو زەبیحی بەسەردا گیراو من بە دەرفەتم زانی گۆڤارێك بە ناوی "ئاوات" چاپو بلاو بکەمەوە. هەر لەو گۆڤارەدا پارچەیەکی ڕەمزی بە ناوی (برای دوورم) سەبارەت بە گیرانی زەبیحی نووسراوەو ژنێکی نیقابدار (تەرجومە)، موحاکەمەی هیتلەر لە جەهەننەم، چەند پارچە شیعر ... باقی ناوەڕۆکی "ئاوات" بوو. پاش بڵاوبوونەوەی "ئاوات"، محەمەدی یاهوو وەلامی بۆ هێنام کە لیژنەی ناوەندیی (ژ. ك)و زیاتر لە هەموان حاجی مصطەفا داودی لێم ناڕزین، چونکوو دەبوو بۆ دەرکردنی "ئاوات" ئیمتیاز وەربگرمو پرسیان پێ بکەم. وەلامم دایەوە من ئەو ئیشەم بۆ هاتنەوەی زەبیحی دانابوو، بەڵام دەمەویست توانای خۆم بۆ ئەم ئیشە تاقی بکەمەوە. پاش یەکدوو هەفتە بەشوێنیاندا ناردمو پێیان ڕاگەیاندم پێویستە واز لە دەرکردنی "ئاوات" بێنم، چونکوو چاپخانەی گەورەمان بۆ هاتووەو دەبێ کادری پێویست ئامادە بکرێ. لە خۆم زیاتر کەس نەبوو حرووفچینی بزانێ، ناچار چەند کەسم پەیدا کردو لە ماوەیەکی کەمدا فێری ئیشەکەم کردن. صەدیق ناوێکیش کە لەعیراقەوە هاتبوو، لەسەر مەکینەکەی چاپ لای سەیید حوزنی ئیشی کردبوو،

خستمانه سەر مەکینەکەو ئا بەم جۆرە چاپخانەی کوردستان کەوتە ئیشکردن. لام وایە نەخشەی کاری چاپخانە گۆڤاری "کوردستان" بوو. زۆر جار ناچار دەبووین کە شەوو ڕۆژ تێك بکەینەوە، بۆ ئەوەی ڕۆژنامە یا گۆڤار دوا نەکەوێ. هەروەها لە کرێکارانی چاپخانە تیپێکی سروود خوێندنەوەمان پێك هێنابوو و زۆر لە سروودە کوردیەکانمان لەبەر کردبوو. بۆ هەووەڵ جار لە جەژنی ڕێبەنداندا لە چوار چرا سروودی (نیشتمان ڕەنگینە، بەهەشتی ڕووی زەمینە، خاکم وەکوو ئالاکەم، ڕەنگ سوورو سپی و شینە) لەلایەن کرێکارانی چاپخانەوە خوێندرایەوە.

**بڕوانامە:**

کاتی ڕووداوەکانی ورمێ، زەبیحی لە سابلاغ نەبوو، ئەسنادو کەلوپەلی سکرتاریەت لای مـن دانرابـوو. شـەوێکیان صـەدیقی حەیـدەری هاتـە لامو وتـی سـەیید عەبـدوڵلا ئەفەنـدیی شـەمزینی دەیـەوێ لە ورمـێ چاوی بە نوماینـدەی سۆڤێت بکـەوێ، پێویستە بۆی ئامادە بکەین. وابوو بە زمانی فارسی بۆمان نووسی و حەیدەری بۆی برد.

### ژمارەیەکی تری "نیشتمان"

لـە بـەهاری ١٩٤٨ مـن و غـەنی بلووریـان گەیـشتینە عـیراق، لـە دێـی (سـیتەك)ی شاربازێڕ لەگەڵ عەبدوڕەحمان زەبیحی یەکترمان گرتەوە. لە سیتەك قەرار درا درێژە بە دەرکردنی "نیشتمان" بدەین. بۆ ئەو کارە دروستکردنی چاپخانەیەکی بچووکی دەستی بە مـن ئەسپێردراو پەیداکردنی حرووف بـە زەبیحـی. مـن بـە یارمـەتیی شـێخ حسێنی ئاسنگەر لە سلێمانی مەکینەکەم دروست کردو توانیمان لە ماوەیەکی کەمدا ژمارەیەکی تری گۆڤاری "نیشتمان" چاپ بکەین و بینێرین بۆ کوردستانی ئێران. ناوەڕۆکەکەیم لەبیر نەماوە. زەبیحی نووسینەکانی بە ئیمزای (ع. بیژەن) و غەنی بلووریان نووسینێکی هەبوو بـە نـاوێکی تـر (لـەبیرم نـەماوە). منـیش لەوێـدا نووسـینێکم هـەبوو بـە نـاوی "ئـازاد"، ئەگەرچی ناوی نهێنیم لە (ژ. ك)دا (ئاذەر) یا (م. ش. ئاذەر) بوو.

**ناوی نهێنیی قازی محەمەد:**

قـازی محەمـەد کـە هاتـە ڕیـزی (ژ. ك)، لەپێـشدا نـاوی "یـەزدی"ی بـۆ خـۆی هەڵبـژاردبوو، بـەڵام پاش بـەینێك نـە خـۆی نـە برادەران ئـەم ناوەیان پـێ باش نـەبوو، وابوو گۆڕیی بە "بینایی".

## سۆڤییێتو ئامۆژگاییێکی خراپ:

مامۆستا نەوشیروان هەرچی لەم بارەوە نووسیویێتی ڕاستە، بەڵام دیسان دوو عامیلی زۆر گەورە ببوون بە هۆی ئەم سیاسەتە ناحەزەی سۆڤێت، ئەوانیش حیزبی توودەو ئەوی تریان باقرۆف. حیزبی توودە کە جڵەوی بەدەس باقرۆفەوە بوو، نەیتوانیبوو لە کوردستانی ئێراندا جێیەك بۆ خۆی بدۆزێتەوەو بە پێچەوانە لە ئازەربێجاندا دەستێکی باڵای هەبوو، ببوو بە کۆسپ لە ڕێگای گەشەکردنی حکوومەتی میللیی کوردستان.

باقرۆف، ئەگەر ڕاستی گوتبایە، دەیتوانی ماوە بدا بە کورد کە دەزگایەکی وەك دەزگای حکوومەتی ئازەربێجان بۆ خۆی دامەزرێنێ، بێ ئەوەی زیان بگەیەنێ بە سیاسەتی دەرەوەی سۆڤێت؛ بەڵام نەیکرد، چونکوو بیری لە شتێکی گەورەتر دەکردەوە، ئەویش تێکخستنەوەی دوو ئازەربێجانی سۆڤێتو ئێران بوو، هەر لەزووەوە باسی ئازەربێجانی شیماڵیو جنووبی خستبوە سەر زمانان. لەبەر ئەوە نەیدەویست کوردستان حکوومەتی جیای هەبێو لە ئازەربێجان جیا بێتەوە. باقرۆف زۆر باش دەیزانی ڕووس بچنە ناو هەر وڵاتێك بە هاسانی چۆڵی ناکەن. ئەمەش ببوو بە هۆی ئەوە لە جێبەجێکردنی پیلانەکەی خۆیدا سوورتر بێ.

ئیرەجی ئەسکەندەریی سکرتێری پێشووی حیزبی توودەی ئێران لە لێدوانێکی تۆمارکراودا کە گۆڤاری (فصل در گل مرخ، جڵدی ۲، پاییزی ۱۹٦٥، چاپی پاریس) بڵاوی کردۆتەوە، دەڵێ: ((درۆیە باقرۆف لەسەر ئەوە موحاکەمە نەکرا کە عامیلی ئیمپریالیزم بوو، بەڵکوو موحاکەمەکەی لەسەر ئەوە بوو کە هاوفیکری "بێریا"ی وەزیری ناوخۆی سۆڤییێتو ڕەئیسی سازمانی ئەمنییەتی زەمانی ستالین بوو. ئەو دوانە بۆیە ئیعدام کران موتتەهەم بوون کە بە جیاواز لە سیاسەتو بڕیارەکانی حیزب، پەیڕەویان لە سیاسەتی ناسیۆنالیستی کردووە!)).

## گفتوگۆیەک لەگەڵ

## سەربازی نەناسراو محمدی شاه پەسەندی*

ئامادەکردنی:

**محەمەد فەریق حەسەن، کەژاڵ ئەحمەد**

خێرەومەندێك ڕێگای دۆزینەوەی سەربازێکی ونی پێنیشان داین‌و بە "ئاڵای ئازادی"ی ناساند. ئەم ڕۆژنامە ئێسك سووکەش بەوپەڕی شانازی‌و ڕێزەوە چاوپێکەوتنێکی دووروودرێژی لەگەڵ مامۆستای نەناسراودا تۆمار کردو دەیەوێت بیکات بە سەربازێکی ناسراو لەلای خوێنەرانی.

* مامۆستا گیان ناوی تەواوی خۆت‌و پلەی خوێندنت؟

- ناوم محەمەدی شاپەسەندییە کوڕی (محەمەدساڵح)م لە خێزانێکی مام ناوەندی لە سابلاغ لە ساڵی (١٣٠٢ی شەمسی)دا لەدایك بووم؛ ئەوکاتە لە سابلاغ دوو قوتابخانەی سەرەتاییی (سەعادەت‌و پەهلەوی) هەبوون. من تا پۆلی شەشم لە (سەعادەت) تەواو کردووە، بەڵام خەڵکی بۆ خوێندن دەچوونە ورمێ‌و دووسێ ساڵ دەیانخوێندو دەگەڕانەوە بۆ سابلاغ بۆ مامۆستایی.

* چۆن تێکەڵ بە سیاسەت بوویت‌و سیاسەت تێکەڵت بوو؟

- لە ساڵی (١٣٢٠ی شەمسی)دا بەشێك لە کوردستان لەلایەن سۆڤێتەوە ئازاد کراو کۆمەڵەی (ژ. ك) واتە (ژیانەوەی کورد) دامەزرا، خەڵکەکە ڕوویان تێکردو منیش یەکێك بووم لەوانە. پاش شەش مانگ هەوڵ‌و تەقەلا "دڵشادی ڕەسووڵی"و "محەمەدی یوونسی" کارێکی وایان کرد من‌و باوکم وەك ئەندامێکی ئاسایی بە ڕۆژێك وەربگیرێین‌و ببینە ئەندامێکی کۆمەڵە.

* تەدارەکی سوێندخواردنی ئەندامانی (ژ. ك) چۆن بوو؟

- قورئانێك‌و ئاڵایەکی کوردستان‌و خەنجەرێکیان دادەناو ئەندامەکەش بەمجۆرە سوێندەکەی دەست پێدەکرد: سوێند دەخۆم بەو قورئانەو بە ئاڵای کوردستان خیانەت لە کورد ناکەم‌و بەبێ ئاگاداریی کۆمەڵە ناچمە ناو حیزبێکی دیکەوە، من هێندەم لەبیرە، بەڵام سوێندەکە درێژتر بوو. باوکم بەر لە من سوێندی خواردو منیش بەدوای ئەودا. پاش سوێندخواردنەکەم باوکم باوەشی پێدا کردم‌و پێی وتم (تائێستا باوك‌و کوڕ بووین، وا ئێستا بووین بە برا). ئەمە زۆر بوو بۆ من، چونکە بە تەمەن

---

* "ئاڵای ئازادی" (ڕۆژنامە)، هەولێر، بەشی یەکەم، ژ٢٤، ١٩٩٢/٥/١٤؛ بەشی دووەم، ژ٢٥، ١٩٩٢/٥/٣١.

بچووکترین ئەندامی کۆمەڵەی (ژ. ك) بووم. سوێندەکەمان لەبەردەم (دڵشادی ڕەسووڵیو عەلی ڕیحانیو صەدیق حەیدەری)و پێنج کەسی تردا خوارد، واتە هەشت کەس لە سەرانی کۆمەڵە. ئەمەش لە ماڵی (عەلی ڕیحانی) بوو کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی (ژ. ك)، کەچی بەداخەوە تائێستا باس نەکراوە.

* چەندێك دوای دامەزراندنی کۆمەڵە پەیوەندیتان بە (ژ. ك)ەوە کرد؟

– خۆی کۆمەڵە لە ساڵی (١٣٢١)دا دامەزرا، واتە (١٩٤٢/٩/١٦). منو باوکم دوای شەش مانگ لە دامەزراندنی پەیوەندیمان پێوە کرد.

* دەوری "عەبدوڕەحمان زەبیحی" لە کۆمەڵەی (ژ. ك)دا؟

– عەبدوڕەحمان زەبیحی کە ناوی نهێنی (بێژەن) بوو؛ کەسی دووەم بوو دوای حسێن فرووهەر لە کۆمەڵەدا. زەبیحی داوای لێ کردم فێری پیت چنین ببم. دواییش هەر خۆی فێری کردم بۆ ئەوەی لە ڕۆژنامەی "نیشتمان"دا کار بکەمو ئەم ڕۆژنامەیە یەکێك بوو لەو هۆیانەی هانی دام بچمە (ژ. ك)ـەوە. چاپەکە بەدزیەوە لەلای ئەرمەنییەك دەکرا لە تەورێز؛ لەگەڵ زەبیحیدا هەموو جارێ پێکەوە دەچووین، کە من دەستم دایە پێنج شەش ژمارەی لێ چاپ کرابوو.

* خۆت بە نووسین بەشداریت دەکرد؟

– چەند مەقالێکم تێدا بڵاو کردەوە، وەك بەبیرم بێت یەکێکیان لەسەر (خۆشبەختی) دەدوا. بێگومان وەك هەموو نووسەرەکانی تر بە ناوی نهێنییەوە دەمنووسی، ناوی نهێنیم (ئازەر) بوو.

* چالاکترین نووسەری "نیشتمان" کێ بوو؟

– دەتوانم بڵێم زەبیحی بوو، ئەوانەی تر کە بە بەرهەم بەشدارییان دەکردین، ئەمانە بوون: هەژارو هێمن ... مەنافی کەریمی (بە وتار)و دڵشادی ڕەسووڵیش.

* چەند ژمارەی لێ چاپ کرا؟

– (١٢–١٥) ژمارەی لێ چاپ کرا، دوا ژمارەش دوای ئەوەی پێشەوا قازی شەهید کرا بە ساڵو نیوێك لەسەر دەستی (غەنی بلووریانو زەبیحیو من) لە (سیتەکی شاربازێڕ) بەچاپ گەیەنرا.

* دوا ژمارەی "نیشتمان"تان چۆن چاپ کرد؟

– مانگێك بووم بە شاگردی شێخ حسێنی ئاسنگەر، خۆم چاپخانەیەکی دەستیی بچووکم دروست کرد کە دوو لاپەڕەی بچووکی پێ چاپ دەکرا... کاك "شێخ لەتیف"

پیتەکانی بۆ پەیدا کردین. لەم ژمارەیدا بە ناوی "ئازاد"ەوە بەرهەمی خۆم دابەزاندووە. دوای ئەم ژمارەیە ئیتر بڵاوەمان لێ کرد، من بەرەو بەغدا ڕۆیشتمو غەنی گەڕایەوەو لەوێ گیرا.

* بەر لەوەی دەربارەی گۆڕانی (ژ. ک) بە حیزبی دیموکرات پرسیارت لێ بکەم، چی ماوە شایەنی وتن بێت؟

– ئەوەی ماوە بیڵێین دەرکردنی ژمارەی (١٠-١٢)ی "نیشتمان"ە. لەوکاتەدا چاپخانەیەکی بچووکی پیت ڕێکخستنمان پەیدا کردو هێنامانەوە بۆ سابلاغ، تا لەوێ لای خۆمان چاپی بکەین. ئەوەبوو "زەبیحی" لەکاتی گەڕانەوەیدا لە ورمێ بەسەردا گیرا. سوودم لەم چاپخانەیە وەرگرتو بە تەنیا گۆڤارێکم دەرکرد بە ناوی "ئاوات"ە، ئێستا کچێکم ناو ناوە "ئاوات" بە یادی ئەو ڕۆژنامەیەوە کە تەنیا یەك ژمارەی لێ دەرچوو. شایانی باسە هەموو نووسینەکانی هی خۆم بوون، بێجگە لە چەند پارچە شیعرێك، نووسینەکانیش هێندەی لەیادم بێت ئەمانە بوون.ـ موحاکەمەی هیتلەرـ سواری ڕەشپۆش (لە فارسییەوە وەرم گێڕابوو)، شتێك دەربارەی ئەدەبی ڕەمزیو بە یادی (دۆستی دوورم) نزیکەی (٣٠ لاپەڕە) دەبوو. هەر دوای بڵاوبوونەوەی، (ژ. ک) بەهۆی "محەمەد یاهوو" کە یەکێ بوو لە دامەزرێنەرانی (ژ. ک)، جوابیان بۆ ناردم کە نەدەبوایە بەبێ پرسی ئەوان "ئاوات" بڵاو بکرایەتەوە، هێندەی پێ نەچوو بانگیان کردم بۆ ناوەندی (ژ. ک) وتیان چاپخانەی کوردستان گەیشتووەو داوایان لێ کردم– دەست لە هەموو شتێ هەڵبگرمو خۆم تەرخان بکەم بۆ چاپخانەی کوردستان کە لە سۆڤێتەوە بۆمان هاتووە. لەم کاتەدا هێشتا حیزبی دیموکرات دانەمەزرابوو.

* بەڕێوەبەری چاپخانەکە کێ بوو؟

– "مەلا قادری مودەڕریسی" بوو، کاتی خۆی ماموٚستام بووەو لە دامەزرێنەرانی (ژ. ک)ەو ئەندامی ناوەندی بوو. من لە چاپخانەی (کوردستان) بەڕێوەبەری هونەری بوومو پیتەکانم دەچنیو خەڵکی دیکەم فێر دەکرد. ڕۆژنامەی (کوردستان) بە دوو ڕۆژ جارێ دەردەچوو، ژمارەی لاپەڕەکانی بەپێی تواناو ئەو بەرهەمانە بوو کە بەدەستمان دەگەیشت. ئەم ڕۆژنامەیە لەناو خەڵکدا زۆر بەڕێز بوو، بە ئاشکراش بڵاو دەبوەوە، لێی دەنووسرا ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستان.

* لە ساتەکانی شکانی (کۆماری مەهاباد)دا ئێوە لەکوێ بوون؟

– دوای هەرەس بە ساڵێکیش من هەر لە مەهاباد بووم‌و... لە نەورۆزی ١٩٤٨دا هەستم بە مەترسی کردو لەگەڵ غەنی بلووریان گەیشتینە (خەلان)، سەربازەکانی دەوڵەت بە شێنەیی دەکەوتنە گیانی خەڵکی.

* ئەو ڕۆژە چۆن ڕۆژێك بوو؟

– ڕۆژێکی تاڵ بوو، ئازەربایجان پشتی شکاندین، دەنا کۆمارەکەمان خۆی ئامادە کردبوو بۆ بەرگری. لەپڕ هەواڵ هات (ئازەربایجان) خۆی داوە بەدەستەوە، خەڵکەکە ورەیان بەر داو بەبێ هیچ بەرگرییەك تەسلیم بوون. لە ئازەربایجان نزیکەی پانزە هەزار کەس کوژرابوون بەهۆی (حەربی ئەهلی)یەوە، ئەوان کەمێك بەرگرییان دژی هێرشی ئەرتەش کردبوو، بەتایبەتی کاتی کشانەوەیان بەرەو سۆڤێت (خوسرەوی ڕۆزبێ) بەرگرییەکی باشی کردبوو، بێگومان خیانەتیش لەنێو هەندێ لە لێپرسراوەکاندا هەبوو. ئەوە بوو لە ڕادیۆی ئازەربایجانەوە داوایان لە خەڵکی کرد خۆیان بدەن بەدەستەوە. ناڵەباریی وەزعەکە وای لە قازی کرد بچێت بەپیر سوپاکەوە، لەسەر داوای ئەوانەی وا سەر بە دەوڵەت بوون پێشەوا هەتا (میاندواو) چوو، لەگەڵ سوپادا ڕێك کەوتن لەسەر بەدەستەوەدانی کۆماری مەهابادو ئەمجا گەڕایەوە بۆ مەهاباد. ئەمەیش لەبەر پاراستنی ژیانی خەڵکی کرد، بۆ ئەوەی زیانی بەشەری کەم کاتەوە. تەنانەت لە تارانەوە پەیمانی ئەوەیان پێدابوو ژیانی بپارێزن، بەڵام وەك هەموو داگیرکەرێك بێ قەول‌و درۆزن بوون. ئەوە بوو بە تاقی تەنیا چوو بەپیریانەوە. ئەوکاتە پ. م بڵاوەیان لێکردبوو. قازی نەیدەویست مەهابادیش وەك ئازەربایجانی لێ بێت. سەیارەی قونسوڵی سۆڤێتی لە ورمێ هاتە سابڵاغ‌و بەر دەرگای ماڵی قازی تا ڕزگاری بکات‌و بیبات بۆ سۆڤیەت، ئەم بەتوندی ڕەفزی کردەوەو وتی ((ژیانم لەگەڵ ژیانی خەڵکی سابڵاخدایە)). دەیزانی شەهید دەکرێت، بەڵام دەیویست بە ڕۆیشتنی ئەم خەڵکەکە هێندەی تر ورە بەر نەدەن، پێنج شەش مانگ سوپا لە سابڵاغدا بوو ئەوجا پێشەوایان هەڵواسی، چونکە محاکەمەکەی درێژەی کێشا. محاکەمەکەشی لە شاری سابڵاغ بوو، محاکەمەیەکی سەربازیش بوو.

* ئەی سوپای سۆڤیەت لەکاتی هێرشی سوپادا چیی بۆ کورد کرد؟

– هەر زوو بەر لەوەی دەوڵەت شاڵاو بهێنێت، ئەوان ئازەربایجان‌و کوردستانیان چۆڵ کرد (ئەرتەشی سورخ)یان پێ دەوتن لە نەغەدەو میاندواو هەبوون، بەڵام لە سابڵاغ نەبوون.

* وەك دەڵێن لە بارەگاكانی حیزبی دیموكراتدا وێنەی لینین‌و ستالین هەڵدەواسران؟

– خۆی وەك ڕزگاركەرێك سەیری سوپای سووری سۆڤێتی دەكرا، وەك ئێستا چۆن خەڵكی دەڕواننە ئەمەریكاو (بۆش). بۆ هەڵواسینی وێنەی ئەو دووانە لە بارەگاكاندا، نازانم، بەڵام بێ‌گومانم لەو ڕاستییەی كە وێنەی پێشەوا قازی محەمەد لە بارەگاكاندا هەڵدەواسرا.

* ئێوە دەڵێن ڕووخانی كۆماری مەهاباد بێجگە لە وەزعی ئازەربایجان هۆكاری تری لەپشت بوو؟

– كۆماری مهاباد كە سازبوو– ئاڵا هەڵكرا، لە خۆیدا تەحەددایەك بوو بۆ سۆڤیەت‌و جەمهووریەتی ئازەربایجان. لەسەر ئەوە سۆڤیەت تەحقیقی لەگەڵ قازی‌دا كرد، گوایە كێ ئیجازەی داوەتێ ئاڵا هەڵبكات. كۆمەڵەی (ژ. ك) قەومی بوون بە دەلیلی طەرحكردنی فیكرەی ئاڵاو پەیمانی سێ قۆڵی كوردی عیراق‌و توركیاو ئێران. كە لقی هەبوو لە سلێمانی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمد لێپرسراوی (ژ. ك) بوو لە (شار). ستراتیژییەتی سۆڤیەت وەها بوو كە خۆی لە چاڵە نەوتەكان‌و ئاوی كەنداو نزیك بكاتەوە، بەبێ ئەوەی كێشەی كورد بوروژێنێ. جا بۆیە لە سەرەتاوە تەوصییەی سۆڤیەت ئەوە بوو كە كوردستان خودموختاریی لە چوارچێوەی ئازەربایجان‌دا بدرێتێ‌و هەردوولایان خودموختارن.

باقرۆف سەرۆكی كۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەتی بەرەو ڕووی قازی‌و وەفدی كوردی وتوویەتی: دەبێ كورد بەوە ڕازی بێت ئەوڕۆ لە چوارچێوەی ئازەربایجاندا ئازادییەكی دەست بكەوێ، وە دەبێ چاوەڕوان بێ تاكوو میللەتانی توركیاو عیراق خۆیان لەژێر دەستی ئیمپریالیزمدا دەردەكەن، ئەوسا دەتوانین قسە لەسەر كێشەی كورد بكەین. لەبەر ئەوەیش بوو ئیحایان دایە قازی كە (ژ. ك) وەلا بنێ‌و حیزبێكی دیكەی وەك فیرقەی دیموكراتی ئازەربایجانی دروست بكات. قازی لە بەرامبەر كوردستانی ئێراندا ڕۆحی سوشیالیزمی نەبوو. قاسملۆ دەیویست لە قاڵبێكی پێشكەوتوانەی بدات.

* یادگاریتان هەیە لەگەڵ پێشەوا قازی محەمەددا؟

– جارێكیان لەگەڵ قازی‌دا لە تەورێزەوە هاتووین بۆ سابلاغ، "مەنافی كەریمی"یشمان لەگەڵ بوو. مەناف وەزیر بوو. لەو سەفەرەی كە چاپخانەی كوردستانمان لە تەورێزەوە هێنا بۆ سابلاغ، لە ڕێگا ئۆتۆمۆبیلەكەمان وەرگەڕا، بەڵام بێ‌زیان بووین.

* قازی چۆن پیاوێك بوو؟

– مووزەردێکی باڵا مامناوەندی بوو، ڕەنگیشی تاڕادەیەك زەرد بوو. قسەخۆش، ڕەزین، هێمن و ئارام ... زمانی ڕووسی و فارسی و عەرەبی و فەڕەنسی و ئینگلیزیشی دەزانی، بێجگە لە کوردی. بەر لەوەی ببێت بە سەرۆك، بەڕێوەبەری پەروەردەی مەهاباد (مدیر معارف) بوو. ئەوکاتە من لە پۆلی دووەم بووم، لەپاشدا بەڕەسمی بوو بە قازی شاری مەهاباد.

* یادگارییەکانت لەگەڵ بارزانیی نەمردا؟

– لە چاپخانەی کوردستان هات بۆ لامان و زۆر تەشجیعی کردین. جارێکی دیش لەگەڵ زەبیحیدا چووین بۆ لای لە کۆیە، بەر لە دووبەرەکییەکەی پارتی لە کۆیە دانیشتبوو، هەژاری شاعیریشی لەلا بوو، شۆڕشی ئەیلوول دەستی پێکردبوو. زەبیحی لێپرسراوی کەرکووك بوو، منیش خەریکی چاپکردن بووم لە (چاپخانەی خەبات).

* یادگاریتان هەیە لەگەڵ "هێمن"دا؟

– یادگارییەکم هەیە نموونەیەکە بۆ پاکی (هێمن). لە حەفتاکاندا توودە دەیویست بۆ لای خۆی ڕایکێشێت. ئەمانە دەستیان دەڕۆیشت. هێمن موحتاج بوو، من ئاگادار بووم داوایان لێ کرد بێتە لایان و چی دەوێ دەیدەنێ، بەڵام قوبووڵی نەکرد.

* ئەی شەهیدی بەتوانا سەعیدی یەزدان پەنا؟

– لە بەگزادەکانی بۆکان بوو، سکرتێری گشتیی یەکێتیی شۆڕشگێڕانی گەلی کوردستانی ئێران بوو. کوڕێکم وەختی خۆی کەوتە لایان. ڕۆژێك کاك سەعید هات، وتی نیگەران مەبە کوڕەکەت لەلامانە... زۆر پیاوێکی زیرەك بوو. ئینگلیزیی و فارسی و کوردیی دەزانی، هەر بە گەنجی شەهید کرا.

* یادگاریتان لەگەڵ سەرنووسەری ڕۆژنامەی "ئازادی" نافع یوونسدا؟

– پیاوێکی قسەخۆش بوو، بەڕاستی شۆڕشگێڕ و بەجورئەت بوو، هەموو سەروتارەکانی "ئازادی" ئەو دەینووسین، دوای ئەو محەمەدی مەلا کەریم بەشی زۆری دەبرد بەڕێوە. نافع باڵابەرزێك بوو، ڕەنگ و ڕوویەکی جوانی هەبوو. ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٦٣دا لەسێدارە درا.

* یادگاریتان لەگەڵ ڕۆژنامەی "خەبات"دا؟

– حیلمی عەلی شەریف سەرپەرشتیی ئەم ڕۆژنامەیەی دەکرد و سەری لە چاپخانە دەدا. لەوێ لە ڕۆژنامەکەدا عەمودێکی هەبوو. ئیفتیتاحیەکەی مامۆستا ئیبراهیم

دەینووسی، مام جەلالیش بەناوی "پیرۆت"ەوە بەرهەمی بڵاو دەکردەوە. کە شۆڕشی ئەیلوول دەستی پێکرد، "خەبات" وەستا. پارتی داوای لێ کردم چاپخانەیەك پەیدا بکەم تاکوو بە نهێنی "خەبات" چاپ بکەم. حورووفم کڕی، بەڵام چاپخانەکە بە شێوەیەکی زۆر سەرەتایی بوو. پرۆڤەر هەیە دەبێ هەڵەکانی پێ چاپ بکرێ. بەو پرۆڤەرە جار هەبوو بە سێ ڕەنگ بەشێ لە ڕۆژنامەکەم چاپ دەکرد. ئەو خەباتەیانم لە سلێمانی دەردەکرد. شایەنی باسە، بەتەنیا بووم لە ژێرخانێکدا، لەوێ "نووری ئەحمەد طەها) هامشۆی دەکردم، وتاری دەهێنا، لە گەڕەکی سەرگۆل بووم.

* چۆنە نەگیراویت؟

- من سیاسەتی تایبەتی خۆمم هەبوو. بە شەو کارم دەکردو بە ڕۆژ هەر فرسەت ببوایە لەگەڵ ئەمنەکاندا یاریی تاوڵەم دەکرد، بۆیە گومانیان لێ نەدەکردم. دوای ماوەیەك حزب داوای لێ کردم بچمە دەرێ. چاپخانەکەمان لەگەڵ حرووف نارد بۆ ئەشکەوتێکی یەکجار گەورە لە شاخی گردە ڕەشی نزیك ژاژڵە. ئەو شاخەمان دابەش کردبوو بۆ چاپخانەو ڕادیۆو مەکتەبی سیاسی. ماوەیەك لەوێ بووم. لەو ئەشکەوتەدا صاڵح حەیدەریو سامی عەبدولڕەحمانم بینی، ڕۆژنامەنووسێکی عەرەبیان لەگەڵ بوو، میوانی پارتی بوو... ڕۆژانی هەینی دەچووینە گەڕان بۆ دێکان. لەوێ بەیاننامەکانی (پ. د. ك)، ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی دەهاتن شتمان بۆ چاپ دەکردن. دوای کۆنفرانسی ماوەت ناکۆکیەکەی نێوان بارزانیو مەکتەبی سیاسی دروست بوو. هێزی بارزانی لێمان نزیك بۆوە، ئاوارە بووین بۆ دیوی ئێران. لەوێ نزیکەی ٢٠ شەو لە (بێتووش) بووین. دوایی هاتینەوە (سورکێو)، گەڕاینەوە، مام جەلالو "عەلی عەسکەری"مان لەگەڵ بوو. برادەرێکمان هەبوو ئەندامی ناوەندیی پارتی بوو، فەیلی بوو، بەر لە دووبەرەکیەکە لێرە داوای لێکردبوومو هەڕەشەی لێ کردبووم کە دەبێ لەولا لای بارزانی خەبات دەربکەم، بەڵام من گەیشتمە بەغدا. لەوێ لەگەڵ زەبیحیدا دوو گیانو ڕووحێك بووین. دیسان چاپخانەیەکی دیکەمان سازکردو هێنامە ماڵی خۆمان، چونکە ناچار بووم بچمە بەغدا بەماڵەوە لەوێ بەیاننامەمان دەردەکرد. کە مام جلال گەڕایەوە، دەستمان بە دەرکردنی "خەبات" کردەوە بە نهێنی.

* ڕۆژنامەکەتان چۆن دابەش دەکرد؟

- ئەندامەکانی حزب دابەشیان دەکرد، دەیانهێنایەوە بۆ کوردستان. چاپخانەکە لە ماڵی ئێمە بوو، نهێنیو بە سەرپەرشتی زەبیحی بوو. شەهید عومەر مستەفا دەهاتە

ماڵمان بۆ گواستنەوەی چاپەمەنی تا (١١ی ئادار دەوامی کرد). (م. س)ی مام جەلالیش هاتە بەغدا. لە ئاداری ١٩٧٠دا کارێکی دیکەم پێ سپێررا، لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی ئێران واتە لەگەڵ (ژەنەراڵ تەیموری بەختیار) هاوکاری بکەم. لە موخابەراتی ئێران کەسی دووەم بوو، دوایی لەگەڵ شا تێك چوو، هەڵات بۆ (بەیرووت). دوایی لێرە دەیویست بەرگری بکات. حیزب لەگەڵی ڕێکەوت. ئەمە سەروبەندی بەیانی ١١ی ئادار... مام جەلال- داوای لێ کرد هەڵوێستی بەرامبەر گەلانی ئێران ساغ بکاتەوە. ئەویش قەولی دا ئەگەر گەیشتە حوکم، قانوونی ئەساسی جێبەجێ بکات، منیان مەئموور کرد هاوکاریی لەگەڵدا بکەم، لێرە چەکداری بۆ پەیدا بکەم.

* بزووتنەوەی پەناهیان بە چی گەیی؟

- ڕادیۆیەکیان ساز کردبوو بەناوی (سەدای ئێرانی ئازاد)، لەو ڕادیۆیە کارم لێپرسراوی (ئەرشیف) بوو. یەکێ لەوانە واتە یەکێ لەوانەی سەر بەو بزووتنەوەیە بوو د. موراد بوو. من لەو ڕادیۆیە مەقالاتم وەردەگێڕایە سەر زمانی کوردی، چونکە وەرگێڕی تورکیو عەرەبی هەبوو. ئەوە بوو مەقالاتمان لە فارسییەوە بۆ تورکیو عەرەبیو کوردی وەردەگێڕا. ئەمە لە ساڵی ١٩٧١دا بوو. دوای ئەوە هەر بۆ ئەوان ڕۆژنامەیەکمان دەرکرد (ناوەکەیم لەیاد نەماوە) لە چاپخانەکانی بەغداد بە تورکیو کوردیو فارسی بەرهەمی تێدا بڵاو دەکرایەوەو هەفتانە بوو. بە نهێنی دەماننارد بۆ ئێران، ئەمان تێکەڵێك بوون لە گەلانی ئێران. دیموکراتی کوردستانیشیان لەگەڵ بوو. ئەودەمە "هێمن" لەلای ئەوان بوو، دەهاتە لامان لە ماڵی زەبیحی یەکترمان دەبینی. زەبیحی دەستی نەبوو لە دیموکراتی ئێراندا لە بەغداد. زەبیحی لەگەڵ د. مورادو پەناهیان کە بەناوی جەبهەوە کاریان دەکرد، تووڕە بوو؛ چووە بەیرووت، کە گەڕایەوە گیرا. منیش وازم لەوان هێنا تا ساڵی (١٩٧٥)ی خایاند. لەوساوە وازم لە کاری سیاسیو چاپخانە هێناوە. لە ساڵی (١٩٧٦) بەدواوە ئیتر دەستم بە کاسبی کرد.

* ئەو ڕۆژنامانەی کارت تێدا کردوون، بێجگە لە "نیشتمان"و "کوردستان"و "خەبات"و "ئاوات"؟

- بێجگە لەوانە لە ڕۆژنامەی "گڕوگاڵی منداڵان"، لە "هاواری کورد"و "هاواری نیشتمان" کارم کردووە. ئەمانەش هەمووی چاپخانەی کوردستان دەری دەکردن. دوای ئەمانە لە چاپخانەی (الشعب، الامة، الأخبار، الإستقلال)، زۆربەی ئەو ڕۆژنامانەی لە بەغدا دەردەچوون لە سەردەمی حوکمی پاشایەتیدا. لە ساڵی ١٩٥٧دا

هاتمه کەرکووك بۆ چاپخانەی (تاج) کە ڕۆژنامەی "الآفاق"یان دەردەکرد. لەوێ پێت ڕێکخەرێکیان دەویست تورکی و عەرەبی و کوردی بزانێت. کاغەزێکم بۆ نووسین و وەرگێرام. لەوێ بووم کە برادەرێکم هات پێی گوتم: حیزبی دیموکرات چاپخانەیەکی بۆ دێت، ئایا دەتوانیت بۆمانی هەڵسوڕێنیت. بەڵام چاپخانەکە لە سووریاوە هاتبوو لەلایەن دەوڵەتی عیراقییەوە گیرابوو. دوای ئەوە ڕۆژنامەی "شەفەق" لە کەرکووك دەردەچوو، "محەمەدی مەلا کەریم" کاری تێدا دەکردو "شێخ قادری بەرزنجی" خاوەنی بوو. محەمەد کوڕێکی ناو نام "نەهرۆ". چواردەی تەمووزی بەسەردا هات، ڕۆژنامەیەکی عەرەبی- تورکمانی کە ناوی "بەشیر" بوو دەرمانکرد، ڕۆژنامەیەکی سیاسی بوو، هەفتەی جارێك یان دوو جار دەردەچوو، هی برا تورکمانەکان بوو. پاش ئەوە لە ڕۆژنامەی "ئازادی"دا کارم کردووە. لەپاشاندا داوایان لێ کردم بچمەوە بەغدا، ماڵەکەم برد. لەوێ لە چاپخانەی (وفاء) کارم دەکرد. ڕۆژنامەیەکی هەفتانە بوو، لەوێ شەهید "نافع یوونس"م ناسی و زۆر زۆر یەکترمان خۆش ویست. ئەوە بوو کە "ئازادی" داخرا، ئەوسا "خەبات" بە ئاشکرا چاپ دەکرا لە بەغدا لە (بەتاوێن)، چوومە ئەوێ و بووم بە دەرهێنەری ڕۆژنامەی "خەبات"، هەروەها لە بەشە کوردیەکەی "ڕووناکی- النور"دا کارم کردووە.

* لەکۆتاییدا حەز دەکەن چی بڵێن؟

- حەز دەکەم هەندێ هەڵە ڕاست بکەمەوە، چونکە مێژوو هەڵە قبووڵ ناکات. لە کتێبی (تاریخچەی مهاباد)ی (سید محمد صمدی)دا هەڵەیەکی گەورە کراوە، ئەویش ئەوەیە: محەمەد شاه پەسەندی نووسراوە لەنێو دامەزرێنەرانی (ژ. ك)دا، ئەمە ڕاست نییە. وەك باسم کرد دوای شەش مانگ لە دروست بوونی حیزب چوومە ڕیزییەوە ... بەڵام "عەلی ڕیحانی" لەبیر چووە کە لە ڕیزی دامەزرێنەراندایە.

## محەمەدی شاپەسەندی
## شۆڕەسواری بواری چاپخانەو ڕۆژنامەگەری*

**محەمەد فەریق حەسەن ئامادەی کردووە**

محەمەدی شاپەسەندی، ساڵی ١٣٠٢ شەمسی لە گەڕەکی (حاجی حەسەن)ی مەهاباد لەدایك بووە. ١٣٢١ چۆتە ڕیزی کۆمەڵەی (ژ. ك)ەوە. بەتەمەنترین کرێکاری چاپو ڕۆژنامەنووسیی کوردە کە تاکو نهۆ لە ژیاندا مابێ. سەرچاوەیەکی ڕوونی زانیارییە. زمانی فارسی، تورکی و عەرەبی بە چاکی دەزانێ. سەیر ئەوەیە زمانی عەرەبیی نەخوێندووەو تەنیا بە سەلیقەی خۆی فێری بووە. ئاوا دەرگای گفتوگۆمان والا کرد:

* چۆن تێکەڵی سیاسەت بوون؟

– دڵشادی ڕەسولی برادەرم بوو. ئەو بۆ (ژ. ك) تەزکییەی کردم. بە ئامادەبوونی دوو ئەندامی دامەزرێنەر: عەلی ڕیحانی و عەبدولڕحمان زەبیحی، لە دانیشتنێکی پڕ لە میهرو سۆزدا، لەگەڵ باوکم پێکەوە لە طقووسێکی تایبەتدا، کە ئاڵای کوردستان و خەنجەرو قورئانی پیرۆز لەکایەدا بوون، سوێندمان خوارد. دوای سوێندخواردن باوکم بە دڵی پڕەوە باوەشی پێدا کردم و گوتی: ((تاکو ئێستا باوك و کوڕ بووین، ئەوا بووشین بە برا)).

* چ کارێکیان پێ سپاردی؟

– لەگەڵ زەبیحی‌دا لە تەورێز دەستمان بە چاپکردنی "نیشتمان" کرد. جگە لەوەی کرێکاری چاپخانە بووم، بەشداریم لە نووسیندا دەکرد. پاشان لە چاپکردنی: هاواری نیشتمان، گڕوگاڵی منداڵان و ڕۆژنامەی کوردستان‌دا کارم کردووە. یەکێکم لەوانەی (چاپخانەی کوردستان)م دامەزراند کە هی (ژ. ك) بوو، پاشان دیموکرات بوو بە خاوەنی.

* ئەی دوای هەرەسهێنانی کۆمار؟

– هەڵاتم بە دیوی کوردستانی عیراق‌دا. لە (سیتەك) لای "شێخ لەتیف" گیرسامەوە. لەوێ چاپێکی دەستیم دروست کرد (ئێستاش دەزانم لەکوێم شاردۆتەوە). لەگەڵ غەنی بلووریان و زەبیحی‌دا، دوا ژمارەی "نیشتمان"مان لە سیتەك بەو چاپە دەستییە چاپ کرد.

دوای گەڕانەوەی "غەنی" بۆ سابلاخ و زیندانی کردنی، ئیتر ڕووم لە بەغدا کرد.

* چالاکیتان لە دیوی عیراق؟

– لە کەرکووك لە شەفەق، ئافاق (تورکی و عەرەبی)، ئازادی، بەشیر (تورکی و عەرەبی) کارم کرد. کە "ئازادی" گوێزرایەوە بەغدا لەگەڵی چووم و لەگەڵ "نافع یوونس" هەتا داخرا کارم تێدا کرد، ئەمجا لە "خەبات"و بەشە کوردییەکەی "نور". ئەوسا هەمووی چنین بوو.

---

* "کوردستانی نوێ" (ڕۆژنامە)، هەولێر، ژ٤٨٤، ساڵی دووەم، هەینی ١٩٩٣/٩/١٠، دوا لاپەڕە.

* ئێستا بە چییەوە خەریکن؟

- ئەگەر بتوانم بۆ بژێوی خۆمو خێزانەکەم خەریکی بەرگ دوورینم.

* چ داوایەکتان لە حکوومەتی کوردستان هەیە؟

- سەرکەوتن بۆ میللەتەکەم ... دەزگاکان بژارو پاکسازییان دەوێ ... ڕاستگۆیی لەگەڵ میللەت ... پیرێك لە دواڕۆژ بکەنەوە ... چاپخانەی نوێ بۆ کوردستان ... دامەزراندنی یەکێتیی ڕۆژنامەنووسان، یەکێتییەك بۆ کرێکارانی چاپخانە.

جێی باسە، ئێستا لە گەڕەکێکی شاری سلێمانی نیشتەجێیەو داوای تەمەن درێژیی بۆ دەکەین.

## مامۆستا محەمەدی شاپەسەندی

## پیتچنو نووسەری ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی سەردەمی کۆماری کوردستان*

**هانا**

باسکردن لە چاپەمەنیی کوردیی سەردەمی کۆماری کوردستان لە سەدساڵەی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، بەبێ ڕێزنان لە زەحمەتو شەونخوونیەکانی ئەوکاتی مامۆستا محەمەدی شاپەسەندی، ئەوپەڕی بێئەمەگیو پێنەزانینە. چونکە ئەو هەم وەك پیتچنو کرێکاری فەننیو هەم وەك نووسەرو وەرگێڕ لە یەکەم گۆڤاری کوردیی کوردستانی ئێران "نیشتمان"داو لە زۆربەی گۆڤارو بڵاوکراوەکانی دیکەی سەردەمی کۆماری کوردستاندا خزمەتی زۆر بەنرخی کردووە. مامۆستا شاپەسەندی دوای ڕووخانی کۆماری کوردستانیش کۆڵی نەداوەو جاری وابووە بە تاقی تەنیا نەیهێشتووە ئەو ئاگردانەی تامەزرۆیانی وشەی کوردی هومێدیان پێ بەستووە، دابمرکێو بێڕووناکی بمێنێتەوە. ئەو لە ساڵانی دواتریشدا چەند دەیە لە تەمەنی خۆی بۆ خزمەت لە سەنگەری ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا تەرخان کرد.

محەمەدی شاپەسەندی ساڵی ١٣٠٢ی هەتاوی لە مانگی جۆزەردان (یان وەك خۆی دەڵێ جەوزا) لە گەڕەکی حاجی حەسەن لە مەهاباد لەدایك بووە. پۆلی یەکەمی سەرەتایی لە قوتابخانەیەکی گەڕەکی ڕزگەیی‌یانو پۆلی ٦ی سەرەتایی لە قوتابخانەی "سەعادەت" تەواو کردووە. دواتر نەیتوانیوە درێژە بە خوێندن بدا.

---

* "کوردستان" (بڵاوکراوەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران)، کۆیە، ژمارە ٢٥٧، ٢ی بانەمەڕی ١٣٧٧(٢٢ی ئاوریلی ١٩٩٨) ، ل٨-٩.

دوای تەواوکردنی قوتابخانەی سەرەتایی، باوکی لای تاجرێکی تەورێزی لە سابلاغ (مەهاباد) دایناوە کە فێری مونشیگەریو ڕێوشوێنی بازرگانی بێ. ساڵانی ١٣١٩-١٣١٦ وەکیلی شەریکەی قوماش (پارچە) بووە لە سابلاغ. ساڵی ١٣٢٠ بەهۆی دەست ڕاگەیشتن بە نوسخەیەکی دەسخەتی دیوانی وەفایی دەبێتە ئۆگری شیعری کوردیو بە زەحمەتێکی زۆر دیوانی شاعیران نالیو خانیو بێکەسو قانیع پەیدا دەکا، هەستی نیشتمانپەرستیی دەجووڵێو بە مەسەلەی نەتەوەیی ئاشنا دەبێو هەر لە تەمەنی مێرمنداڵیدا بۆ لای سیاسەت دەکشێ.

ساڵی ١٣٢١ بەهۆی تێکەڵاویی بنەماڵەییو ئاشنایەتی لەگەڵ بنەماڵەی حەمەدەمینی ڕەسوولی (بنەماڵەی دڵشادی ڕەسوولی) سەرنجی بۆ لای کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد (ژ. ك) ڕادەکێشرێ، لەگەڵ باوکی لە یەك ڕۆژداو لە یەك ڕێورەسمدا دەبن بە ئەندامی کۆمەڵە.

مامۆستا شاپەسەندی هاتنی خۆی بۆ نێو کاری چاپو چاپەمەنی بەم جۆرە باس دەکا:

((ئەوسا ساڵی ١٩٤٢ لە تەورێز بووم، "زەبیحی"ش لەوێ بوو، هەروەها خەلیلی ساوجبلاغچی (ئەو سێیەمان بووین). لەوێ زانیم زەبیحی [دەیەوێ] "نیشتمان" چاپ بکا. زەبیحی حرووفچینی پێ دەکردم. لەوێ جێگای تایبەتیمان هەبوو. ئەوسا بە شێوەی کۆن حرووفچینی دەکرا. ژمارەیەکی "نیشتمان"مان حرووفچینی کرد. لەوێ دەمانبرد بۆ چاپخانەی کابرایەکی ئەرمەنی، ئەویش بۆی چاپ دەکردین. بە دووسێ ڕۆژ پێنج شەش سەفحەمان ساز دەکرد، تێکمان دەکردەوەو دەمانبردەوە بۆ سابلاغ. لە زۆر جێگادا بە نهێنی، کاری مەتبەعە (چاپخانە)ی ژێ کافمان کرد. لەپشت میوانخانەی خورشید، لەوێ یەکدوو هۆدەمان دەست کەوت، چاپخانەمان دانا تا گۆڕانکارییەکی تەواو لە ژێ کافدا هاتە دی [بوو بە حیزبی دێموکرات] "نیشتمان"مان چاپ دەکرد. هەرچۆنێکی بوو من گەڕامەوە مەهاباد بە مەتبەعەیەکی دەستی کە سەفحەیەکی تەقریبەن نیو فولسکاپی چاپ دەکرد، لە تەورێز هێنامەوە سابلاغ. زەبیحیو ... چووبوون بۆ سازکردنی پەیمانی سێ لایی (کوردستانی عیراق، تورکیەو ئێران)، ئەوان گیران. من تەنیا مامەوە، لە فکری ئەوەدا بووم گۆڤارێك ساز بکەم. ئەو سەردەمە حکوومەت زۆر دەسەڵاتی نەبوو. هێنام بە ناوی "ئاوات" گۆڤارێکم ساز کرد، نزیکەی مانگێك کارم تێدا کردو بڵاوم کردەوە... دوو هەفتەی پێ

نەچوو [بەرپرسانی ژ. ك] ناردیان بە شوێنماو پێیان گوتم ئەتۆ دەبوایە پرسێك بكەی [بۆ دەركردنی ئەو گۆڤارە]. نێوەڕۆكی نووسراوەكانی بریتی بوو لە "بە یادی دۆستی دوورم". یەك لاپەڕم بۆ باسی دەوری زەبیحیو ئیشەكانی ئەو تەرخان كردبوو، بەناوی ڕەمزی دەمنووسی. مەوزووعێكی دیكەی تێدابوو لە فارسییەوە وەرگێڕابوو "ژنێكی نیقابدار"، هەروەها "موحاكەمەی هیتلێر"، "خواندنیها" شتی كەم دەنووسی، بەلام باسی هەموو جەریدەكانی (ئێرانو دەرەوە)ی تێدابوو.

كە بە شوێنیاندا ناردم، پێیان گوتم ئێمە مەسەلەیەكمان لەبەر دەستدایە دەمانهەوێ چاپخانەیەكی باش بۆ حیزبی دێموكراتی كوردستان ساز بكەینو لە تۆ زیاتر ئێمە كادرمان نییە. ئەتۆ دەبێ خەریكی ئەو ئیشە بی. لە بەرامبەر كاروانسەرای سەید عەلی (كاروانسەرایەكی دیكە هەبوو ... تێلگرافخانە بوو) خەریكی سازكردنی مەتبەعە بووم. ئەوجار وەك دەورە دەورەیەكم كردەوە بۆ ئەو لاوانەی كە دەیانهەویست فێری حرووفچینی بن. پێنج شەش كەسم هێنا، لەوانە یۆسف ئەورامی، سەدیقەسوور، ڕزگەیی شۆرەتێك... ئەوانەم فێری حرووفچینی كرد. هەووەڵ ژمارەی "كوردستان"مان دەركرد. هاتین گۆڤاری دیكەشمان ساز كردن، تەقریبەن پێنج شەش گۆڤارمان هەبوون. ئێمە كرێكارەكانی چاپخانە تەقریبەن هەمووی ١٠ كەس دەبووین. جاری وابوو شەو درەنگی دەكرد، نەدەچووینەوە ماڵێ، ئیشمان دەكرد، بەیانی زوو دەچووینە حەمامێو هەر بەیانیش دەهاتینەوە سەر ئیشەكانمان.

جگە لە [كاری پیتچنینو ...] تەرجەمەم بۆ ڕۆژنامە زۆر دەكرد. ناوی نەهێنیم هەبوو. ئەوسا مەلا سەید محەممەدی حەمیدی وەك مودیری نووسین وابوو، مەلا قادری مودەڕریسی مەسئوولی چاپخانەكە بوو. بەلام هەموو بەیەكەوە ئیشمان دەكرد. كاری من سەفحەبەندیو پێڕاگەیشتن بە كاری چاپ بوو.

... كە پێشەوایان ئیعدام كرد، من لە چوار چرا ٢ سەعاتان ڕاوەستام. من دەمگوت ئێمە چینو ئەوان كێن؟ خەڵك خۆی بۆ ڕانەدەگیرا. ئەوسا نزیكەی ٢ سەعات ڕاوەستام بۆ ئەوەی [ئەو دیمەنەم] قەت لەبیر نەچێتەوە. ساڵێك بەسەر ئەوەدا ڕابرد. زۆر جار لەگەڵ عەلی مەولەوی فكری ئەوەمان دەكرد شتێك ساز بكەین، زۆر هەوڵمان دا، بەعزە شتێكمان خستە سەر كاغەز بۆ ئەوەی شتێك بكەینو بلاوی بكەینەوە. بەلام خەڵكەكە ناڕەحەت دەبوو. هەوڵمان دا "نیشتمان" دەربكەین، ناوەكەیمان بە

پیتی لاتینی‌و بە کوردی لەسەر مقەبا (مقوا) نووسی‌و [کلیشەمان ساز کرد]و "نیشتمان"مان دەرکرد. بەلام نازانم چەند ژمارەی لێ دەرچوو. دوایە لەگەڵ غەنی (بلوریان) ڕۆیشتین [بۆ کوردستانی عیراق لە سیتەك لای شێخ لەتیف گیرساینەوە]. دوایە غەنی گوتی دەڕۆمەوە. ئەو ڕۆیشتەوەو گیرا. منیش تاقەتم نەبوو. چوومە بەغدا بێ ئەوەی یەك کەلیمە عەرەبی بزانم. کوردێکی سابلاغی هەبوو لەوێ، گوتی شوێنێك هەیە بۆ کارکردن بە نانەزگی کە لەوێش بخۆم‌و بخەوم. نزیکەی دووسێ مانگ لەوێ ئیشم کرد. دوایە نزیکەی دە ساڵ لە دیوانییە بووم. لەوێ ڕۆژێك چاوم بە جەریدەیەك کەوت [چاپخانەیەك لە کەرکووك] داوای یەکێکی کردبوو کوردی، عەرەبی‌و تورکی بزانێ. نامەیەکم بۆ نووسین. جوابیان بۆ ناردمەوە بۆ تەفاهوم. لەوێ کەوتینە سەر ئەوەی ئەوان یەك جەریدەی تورکییان هەبوو کە هەفتانە دەردەچوو. لەسەر ئەوە ئیتیفاقمان کرد کە ڕۆژی ٢ دینارم دەنێ (مەجەللەی ئافاق).

لە کەرکووك لە شەفەق، ئافاق (تورکی‌و عەرەبی)، ئازادی، بەشیر (تورکی‌و عەرەبی) کارم کرد. کە "ئازادی" گوێزرایەوە بەغدا لەگەڵی چووم‌و لەگەڵ "نافع یوونس" هەتا داخرا کارم کرد. جەریدەی ئەهلی کەم مابوو ئەمن ئیشم تێدا نەکردبێ.

دوایە [لەبەر کاری پارتی] هاتمەوە سلێمانی، بڕیار بوو مەتبەعە ساز بکەن. دەمێك بوو لە بەغدا مشووری ئەوانم خواردبوو. دەستم بە کار کرد بە شێوەیەکی زۆر سەهل‌و سادە جەریدەی "خەبات"م دەرکرد کە خەڵك وایان دەزانی مەتبەعەکەی زۆر پێشکەوتووە. ئەووەڵ ژمارەی "خەبات"م چاپ کردو ناردم بۆ سەرکردایەتیی ئەوسا کە لە مالوومە بوو. دوایە چووم بۆ (مالوومە)، لەوێڕا ناردیانین بۆ ... لە (گردە ڕەش) ئەشکەوتێکی گەورەی تێدایە، لەو ئەشکەوتەدا تەقریبەن دە دوازدە پرۆڤەمان کرد. من لەوێ مەتبەعەی خۆم ساز کرد.))

شایانی باسە مامۆستا شاپەسەندی ئێستا لە شاری سلێمانی دەژی، سەرەڕای پیرەسەری‌و ئەو هەموو خزمەتەی بە ڕۆژنامەنووسیی کوردی کردووە، وەك لە وتووێژ لەگەڵ چیرۆکنووس "محەمەد فەریق حەسەن"دا گوتوویە، خەریکی بەرگدروونە تا بژیوی خۆی‌و خێزانەکەی پەیدا بکا!!

ئێمە لە جێژنی سەدساڵەی ڕۆژنامەنووسیی کوردی‌دا، بە ڕێزو پێزانینەوە یادی خزمەتەکانی مامۆستا شاپەسندی دەکەینەوە. خۆشحاڵین کە ئەو بەختیارییەی بە

نسیب بوو جێژنی سەدساڵەی ڕۆژنامەنووسیی کوردی بە چاوی خۆی ببینێ. هیوادارین زۆر ساڵی دیکەش ئەو یادگارە بەنرخەی سەردەمی کۆماری کوردستان بە سلامەتیو سەربەرزی لەنێو خۆماندا ببینین. بە ئاواتی وەدیهاتنی ئاواتو داواکانی کاک محەممەد کە بریتین لە:

((سەرکەوتن بۆ میللەتەکەم ... دەزگاکان بژارو پاکسازییان دەوێ ... ڕاستگۆیی لەگەڵ میللەت ... بیرێك لە دوارۆژ بکەنەوە ... چاپخانەی نوێ بۆ کوردستان ... دامەزراندنی یەکێتیی ڕۆژنامەنووسان. یەکێتییەك بۆ کرێکارانی چاپخانە)).

سەرچاوەکان:

١- وتووێژێکی تایبەتی لەگەڵ کاک محەممەدی شاپەسەندی لەسەر کاسێتی ویدئۆ (ساڵی ١٩٩٦).

٢- محەممەدی شاپەسندی شۆڕەسواری بواری چاپخانەو ڕۆژنامەگەری، محەمەد فەریق حەسەن ئامادەی کردووە، کوردستانی نوێ، ژمارە ١٤٨٤، ١٩٩٣/٩/١، دوالاپەڕە.

لەگەڵ سوپاسی زۆر بۆ بەڕێز کاك جەلیل گادانی کە ئەو کاسێتەی پێ داینو هەروەها بۆ کاك شاهۆ حەسەنپوور کە زەحمەتی دابەزاندنی قسەکانی کاك محەممەدی شاپەسندیی وەئەستۆ گرت.

تێبینی: لەبەر ئەوەی لە سەر کاسێتەکە قسەکان بە باشی تۆمار نەکراون، بەداخەوە لە زۆر جێ وشەکان تەواو ڕوون نین. هەر بۆیە لەم نووسراوەیەدا لەنێو کەوانە [ ] هەوڵ دراوە مەبەستەکان ڕوونتر بکرێن.

## محەمەد شاپەسەندی*

((کە پێشەوایان ئیعدام کرد، من لە چوارچرا دوو سەعاتان ڕاوەستام، بۆ ئەوەی ئەو دیمەنەم قەت لەبیر نەچێتەوە))

**جووتیار تۆفیق**

محەمەد شاپەسەندی لە پایزی ١٩٢٠دا لە شاری مەهاباد لەدایك بووە. باوکی، ناوی حەمەساڵح کوڕی سەعیدو بە "شاپەسەندی" ناسراوە. محەمەد شاپەسەندی بە منداڵی خراوەتە بەر خوێندنو لە قوتابخانەی (سەعادەت) لە مەهاباد خوێندوویەتی.

---

* ماڵپەڕی www.peshewa.com

هێشتا مێردمندالّ بووه كه بووهته هاورێو هاوبیری كۆمهڵه لاوێكی هۆشیارو كوردپهروهری وهك: عهبدولڕهحمان زهبیحی، حوسێن فرووههر، محهمهد نانهوازاده، هێمن، محهمهدئهمین موعینی، سهدیق حهیدهریو گهلێكی دیكه. شهوانه بهدزیی ئهمنییهكانی حكوومهتی ڕهزا شای پههلهوییهوه، بهناوی یاریكردنهوه ههر جارهی له مالّی یهكێكیان، یان لهناو باخو گویّ چهمی سابلاغ كۆبوونهتهوهو باسی زمانو مێژوو و ئهدهبی كوردییان كردووهو زانیارییان ئالۆگۆڕ كردووه. دواتر ههندێك لهم لاوانه لهگهلّ چهند كهسی بهتهمهنتر له خۆیان (حیزبی ئازادیخوازی كوردستان)یان دامهزراندووه.

له مانگی ئۆگۆستی ١٩٤١دا دهولّهته هاوپهیمانهكان (یهكێتیی سۆڤیهتو بهریتانیاو ئهمهریكا) دهست دهگرن بهسهر ئێرانداو ڕهزا شای پههلهوی له حوكمڕانی دهخهنو به ڕوالّهت محهمهد ڕهزای كوڕی دهكهنه شای ئێران.

لهودهمهدا ههلومهرجێكی تاڕادهیهك ئازاد بۆ سهرجهم خهلّكی ئێران دهخولّقێتو جموجوولّی سیاسیو ڕۆشنبیری پهره دهستێنێت. ڕووناكبیرانو تێكۆشهرانی كورد له شارهكانی ڕۆژههلاّتی كوردستان سوود لهو دهرفهته وهردهگرنو چالاكیی سیاسی دهست پیّدهكهن. هاوكات هاتوچۆی باشووری كوردستان ئاسان دهبێتو پهیوهندیی سیاسیو ڕۆشنبیری لهنێوان ههردوولادا له جاران زیاتر بههێز دهبێت. پاشان به هاوكاریو ڕێنوێنیی حیزبی (هیوا) له ڕۆژی یهكشهممهی ڕێكهوتی ١٩٤٢/٨/١٦ بهرامبهر به (٢٥ی گهلاوێژی ١٣٢١ی ههتاوی) كۆمهڵهی ژ. ك (كۆمهڵهی ژیانهوهی كوردستان) له شاری مههاباد دادهمهزرێنرێت.

محهمهد شاپهسهندی، دوای نزیكی سالّێك له دامهزراندنی كۆمهڵه، چووهته نێو ڕیزی كۆمهڵهو بووهته ئهندام. خۆی لهم بارهیهوه له نامهی ڕۆژی (٢٠٠٣/١١/٢٨)یدا نووسیویهتی: ((منو باوكم له یهك كاتو شوێندا بووینه ئهندامی كۆمهڵهی ژ. ك. باوكم پێش من سوێندی ئهندامێتیی خوارد. ژمارهی ئهندامێتیی باوكم ٨٢٠و ناوی نهێنیی "بازرگان" بوو. ژمارهی ئهندامێتیی خۆشم ٨٢١و ناوی نهێنیم "م. ش. ئازهر" بوو.[1]

---

[1] له گهلێك وتارو لێكۆلّینهوهو بیرهوهریدا ناوی محهمهد شاپهسهندی له ڕیزی ناوی دامهزرێنهرهكانی (كۆمهڵهی ژ. ك)دا نووسراوه. محهمهد شاپهسهندی چهندین جار لهنزیكهوه ئهوهی

محەمەد شاپەسەندی بەهۆی دڵسۆزیو وریایی‌یەوە لەنێو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا، زوو جێی خۆی کردوەتەوە. ئەگەرچی لەچاو ئەندامەکانی دیکەی کۆمەڵەدا کەم تەمەنتر بووە، بەڵام چالاكو لەخۆبوردوو و دڵسۆز بووەو ئامادەی هەر كارێك بووە كە بۆی دیاری کرابێت.

لە مانگی دیسێمبەری ساڵی ١٩٤٣دا سەرکردایەتیی کۆمەڵە بە محەمەد شاپەسەندی ڕادەگەیەنێت کە بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش‌وکاری گۆڤاری "نیشتمان" بچێتە شاری تەورێزو هاوکاریی عەبدولڕەحمانی زەبیحی بکات. ئەویش بە ئەوپەڕی لەخۆبوردووییەوە ئەو ئەرکە جێبەجێ دەکات. ئەودەم تەنها چوار ژمارە لە گۆڤاری "نیشتمان" دەر کرابوو.[٢] ئیدی چەند هەفتە لە ماڵی قاسمی ئێلخانی زادە لە تەوێز لەگەڵ عەبدولڕەحمانی زەبیحی خەریکی ئامادەکردنی ژمارە پێنجی گۆڤاری "نیشتمان" دەبن‌و پاشان وەك ژمارەکانی پێشووتر بابەتە ئامادەکراوەکان دەبەن بۆ چاپخانەی خەڵیفەگەری ئەرامینەو هەتاکوو تەواوبوونی چاپی گۆڤارەکە لەوێدا هەڵدەسووڕێن. پاشتریش دەست دەکەن بە چاپکردنی ژمارە (٧، ٨، ٩)ی "نیشتمان"، کە لە یەك بەرگدا (واتە هەرسێکیان بەسەریەکەوە) چاپ کراون. لەوەوە سەرەتایەك لە ئیش‌وکاری چاپ فێر دەبێت‌و بە کارێکی خۆش‌و بەنرخی دەزانێت.

پاشان کۆمەڵەی ژ. ك ئامێرێکی چاپی بچکۆلانە دەکڕێت‌و دەیباتەوە مەهاباد. لەوکاتەدا عەبدولڕەحمانی زەبیحی‌و دڵشاد ڕەسووڵی‌و قاسم قازی بۆ جێبەجێکردنی کارێکی گرنگی کۆمەڵە بەرەو ورمێ دەچن. لە ڕێگا لەلایەن دەستەیەك سەربازی حکوومەتی ئێرانەوە دەستگیر دەکرێن‌و بەرەو تارانیان دەبەن‌و دەیانخەنە زیندانەوە. بە گیرانی عەبدولڕەحمانی زەبیحی گۆڤاری "نیشتمان" دەوەستێت.

---

بۆ باس کردووم کە خۆی‌و باوکی پاش نزیکی ساڵێك لە دامەزراندنی کۆمەڵە پەیوەندییان کردووەو بوونەتە ئەندام. هەروەها لەو نامانەدا کە بۆی نووسیوم‌و لە ئەرشیڤی خۆمدا پاراستوومن، چەند جارێك ئەو ڕاستییەی بۆ دووپات کردوومەتەوە.

[٢] گۆڤاری نیشتمان: ئۆرگانی کۆمەڵەی ژ. ك بووە، بە زمانی کوردی دەرچووە. یەکەم ژمارەی لە ڕۆژی پێنجشەممە ٣٠ی پووشپەڕی ١٣٢٢ (١٩٤٣/٧/٢٢) دەر کراوە. ئەم گۆڤارە بەنهێنی لە تەورێز لە چاپخانەی خەڵیفەگەریی ئەرامینە، بە سەرپەرشتیی عەبدولڕەحمان زەبیحی‌و هاوکاریی محەمەد شاپەسەندی‌و مەحموود وەلی زادەو چەند ئەندامێکی دیکەی کۆمەڵەی ژ. ك دەر کراوە. سەرجەم (نۆ) ژمارەی لێ دەر کراوە. ژمارە (٧و ٨و ٩)ی لە یەك بەرگدا لەچاپ دراوە. هەموو ژمارەکانی دەست خراون‌و گەلێك لێکۆڵینەوەی دەربارە نووسراوە.

به مەبەستی ئەوەی کە جێی گۆڤاری "نیشتمان" (ئۆرگانی کۆمەڵەی ژ. ك) خاڵی نەبێت، بە تەنیا لە مانگی ئۆگۆستی ١٩٤٤دا گۆڤارێك بە ناوی "ئاوات"ەوە دەردەکات. لەو گۆڤارەدا شاپەسەندی پەخشانێك بەناوی (بە یادی دۆستی دوورم) بە نازناوی "ئازاد" وەك وەفاو ڕێزلێنان لە عەدولڕەحمان زەبیحی دەنووسێت‌و باسی ڕۆڵی ئەو لەنێو کۆمەڵەی ژ. ك دا دەکات. هەروەها شیعرێکی هێمن‌و شیعرێکی هەژارو چەند شیعرو بابەتی دیکە کە نیاز بووە لە ژمارەی نوێی گۆڤاری "نیشتمان"دا چاپی بکەن، لەو گۆڤارەدا بڵاو دەکاتەوە. پاش بڵاوبوونەوەی ئەو ژمارەیەی "ئاوات"، چەند کەس لە بەرپرسانی کۆمەڵە بانگیان کردووەو ڕەخنەیان لێ گرتووە کە چۆن بەبێ ڕەزامەندیی ڕابەرانی کۆمەڵە گۆڤارێکی بەو ئامێرو کەرەستانەی کۆمەڵە دەر کردووە! ئەویش مەبەستەکەی خۆی بۆ باس کردوون‌و ڕەخنەکەیانی قبووڵ کردووە. ئیدی نەیتوانیوە لەسەری بەردەوام بێت‌و ژمارەی دیکەی لێ دەربکات.

هێندەی نەخایاندووە لەسەر بنەماکانی کۆمەڵەی ژ. ك (حیزبی دیموکراتی کوردستان) دامەزراوە. محەمەد شاپەسەندی وەك زۆربەی ئەندامانی دیکەی کۆمەڵە، لەنێو ئەو حیزبەدا چالاکی‌و تێکۆشانی خۆی درێژە پێداوە. لەوەدەمەدا حیزبی دیموکراتی کوردستان ئامێرێکی چاپی گەورەترو باشتر لەوەی پێشووی بۆ دێت‌و چاپخانەیەکی خنجیلانە دادەمەزرێنرێت. شاپەسەندی لە یەکەم هەنگاوەوە دڵسۆزانە دەکەوێتە کارکردن‌و ئەرکی چەند کەس ئەنجام دەدات. کاتێك کۆماری کوردستان دادەمەزرێنرێت، چاپخانەکە گەورەتر دەکرێت‌و ژمارەی کارمەندەکانی زیاد دەکرێت. شاپەسەندی وێڕای کاری نێو چاپخانە، بەردەوام وتار دەنووسێت‌و لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئەودەمەدا بڵاویان دەکاتەوە. ناوبەناویش بابەتی جۆراوجۆر لە زمانی فارسییەوە دەکات بە کوردی‌و بڵاویان دەکاتەوە.

پاش ڕووخانی کۆماری کوردستان، ماوەیەك خۆی دەشارێتەوەو هەوڵ دەدات نەکەوێتە بەر دەست‌و نەگیرێت. دواتر لەگەڵ دەستە لاوێکی هاوڕێیدا دێنە سەر ئەو باوەڕەی کە هەوڵی زیندووکردنەوەی حیزبی دیموکراتی کوردستان بدەن‌و نەهێڵن دوژمن سوود لەو بۆشاییە سیاسییە وەربگرێت کە لەوەدەمەدا دەرکی پێ دەکرا. پاش چەند کۆبوونەوەو هاتوچۆی ئەملاو ئەولا، ئەرەنجام بڕیار دەدەن بەرەو باشووری

کوردستان بڕۆن و لەگەڵ کەسە تێکۆشەرو بەئەزموونەکانی ئەوێ وتووێژ بکەن و بیروڕایان وەربگرن. ئیدی ڕۆژی ٢١ی مارتی ١٩٤٨ لەگەڵ غەنی بلووریان بەرەو باشووری کوردستان دەڕۆن و پاش چەند ڕۆژ لە گوندی (سیتەك)[٣] لە ساو سێبەری شێخ لەتیفی حەفیددا دەگیرسێنەوە.[٤]

لە سیتەك لەگەڵ عەبدولڕەحمانی زەبیحی یەك دەگرنەوەو ئاڵوگۆڕی بیروڕا دەکەن و دەگەنە ئەوەی کە کۆمەڵەی ژ. ك زیندوو بکەنەوەو وەك یەکەم هەنگاو دەست بە دەرکردنەوەی گۆڤارە "نیشتمان" بکەنەوە. سەرەتا بیر لەوە دەکەنەوە کە ئامێرێکی چاپی خنجیلانە دروست بکەن. شێخ لەتیفی حەفید ئاسنگەرێکی زیرەکیان بۆ دەدۆزێتەوە بە ناوی شێخ حسێنی ئاسنگەر، کە وەستایەکی ناسراوی نێو ئاسنگەرەکانی شاری سلێمانی بووە.[٥] بڕیار دەدەن شاپەسەندی بچێت بیرۆکەی ئامێرەکە بدات بەو وەستایەو لەگەڵ ئەودا پێکەوە دروستی بکەن. شاپەسەندی خۆی لەوبارەیەوە نووسیویەتی: ((مانگێکی ڕەبەق لە دووکانی شێخ حسێن خەریك بووین، تا توانیم چاپەکە تەواو بکەم. دوایی پێویستمان بە حرووف و هێندێك کەرەسەی تر هەبوو، ئەوانیش بەهۆی زەبیحی و شێخ لە تیف ئامادە کران)). دواتر شێخ لەتیفی حەفید چەند کەسی وریای خۆی دەنێرێت و ئامێرەکە دەگەیەننە گوندی سیتەك. سەرەتا بەو ئامێرە دەسکردە چەند بەیاننامەیەك دەردەکەن و مژدەی سەرهەڵدانەوەو بووژاندنەوەی خەباتی ڕزگاریخوازی لە کوردستان لەدژی حکوومەتی حەمە ڕەزا شا، بە خەڵکی کوردستان ڕادەگەیەنن. پاشان دەست دەکەن بە چاپکردنەوەی گۆڤاری "نیشتمان".

لەبەر ئەوەی کاتی خۆی گۆڤاری "نیشتمان" لەدوای ژمارە (٧، ٨، ٩) وەستاو نەتوانرا ژمارەی دیکەی لێ دەربکرێت، ئەمان هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە گۆڤارەکە بە

---

[٣] گوندی سیتەك: نزیکەی ١٥ کیلۆمەتر لە شاری سلێمانییەوە دوورەو کەوتوەتە لای باکووریەوە.

[٤] شێخ لەتیفی حەفید کوڕی شێخ مەحموودی حەفیدە، ساڵی ١٩١٧ لەدایك بووە. لە ١٢/٥/١٩٧٢دا لە بەغداد کۆچی دوایی کردووە. شێخ لەتیف ڕۆڵی دیاری لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەکەماندا هەبوە، لەو ڕێەشدا گەلێك جار خراوەتە زیندانەوەو دوور خراوەتەوە یان دەستبەسەر کراوە. شیعرو وتاری جۆراوجۆرو بەشێك لە بیرەوریەکانی لەم ساڵانەی دواییدا چاپ کرا.

[٥] شێخ حسێنی ئاسنگەر (١٩٠٠-١٩٩٤)، لەبنەچەدا خەڵکی گوندی (حاجی مامەند) بووە. یەکێك بووە لە ئاسنگەرو چەخماخسازەکانی سلێمانی و لە گوزەری ئاسنگەرەکاندا دووکانی هەبوە.

ژمارەی (١٠) بدەنە قەڵەم.[٦] شاپەسەندی لە نامەی ٢٠٠٢/٨/٢١دا بۆی نووسیوم: ((ژمارە ١٠ی "نیشتمان" لە ٥٠٠ نوسخەدا لە ناوەڕاستی مانگی حەوتدا تەواو بوو تەوزیع کرا. ١٠٠ دانەیەکی مابوو، غەنی بلووریان لە سەرەتای مانگی هەشت (ئابی ١٩٤٨) لەگەڵ خۆی بردیەوە بۆ مەهاباد)).

پاش بڵاوبوونەوەی ئەو گۆڤارە، حکوومەتی ئێران دەکەوێتە گرتنی ئەو کەسانەی کە بچووکترین گومانیان لێ دەکات. هاوکات داوا لە حکوومەتی عیراق دەکات کە ڕێگا بە شێخ لەتیفی حەفید نەدات کوردە هەڵاتووەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بگرێتە خۆ. حکوومەتی عیراق فشار دەخاتە سەر شێخ لەتیفی حەفیدو ئەویش هەریەکەیان بەپێی ویستی خۆی بۆ ئەو جێیە کە خۆیان دەخوازن بەڕێ دەکات. شاپەسەندی دڵی بڕوایی نادات بچێتەوە ژێر سایەی حکوومەتی ئێران، بۆیە بڕیار دەدات بەرەو بەغداد بڕوات.

لە شاری بەغداد، بەهۆی وریایی خۆیو هاوکاریی چەند کەسی دڵسۆزەوە، لە چاپخانەیەکدا کاری دەستگیر دەبێتو چەند ساڵ بە ناوێکی دیکەوە خۆی دەژیەنێت. ساڵی ١٩٥٥ لە شاری دیوانییەی عیراق لەگەڵ کچە کوردێکدا زەماوەند دەکات. بەرهەمی ئەو هاوسەرییە چوار کوڕو پێنج کچە.

پاش ڕووخانی حکوومەتی مەلیکیو هاتنە سەر کاری حکوومەتی عەبدولکەریم قاسم، حیزبی شیوعیی عیراق بە ئاشکرا دەکەوێتە تێکۆشانو ڕۆژنامەی "ئازادی"و چەند گۆڤارو ڕۆژنامەی دیکە دەردەکات. محەمەد شاپەسەندی لە ڕوانگەی ئەوەوە کە

---

[٦] گۆڤاری نیشتمان (ژمارە ١٠) لە مانگی جولای ساڵی ١٩٤٨دا لەلایەن عەبدولڕەحمان زەبیحیو محەمەد شاپەسەندییەوە لە گوندی سیتەك، بە هاوکاریی شێخ لەتیفی حەفید، دەر کراوە. لەژێر ناوی گۆڤارەکەدا نووسیویانە: ((ئۆرگانی نەهزەتی موقاوەمەتی کۆمەڵەی ژ. ك)). وەکوو من لێکم داوەتەوە، ئەم ژمارەیەی نیشتمان هیچ پەیوەندییەکی بابەتیانەی بە گۆڤاری "نیشتمان"ی (ئۆرگانی کۆمەڵەی ژ. ك)ەوە نییە. بەم ژمارەیەی نیشتمان نە کۆمەڵەی ژ. ك زیندوو بوەتەوەو نە توانراویشە درێژە بە دەرکردنەوەی گۆڤاری نیشتمان بدرێتەوە. جێی سەرنجە کە لەم گۆڤارەدا هێرش کراوەتە سەر پارتی دیموکراتی کورد. لەسەر ئەوە هەمزە عەبدوڵڵا سکرتێری ئەودەمی پارتی دیموکراتی کورد لە گۆڤاری (مرۆڤ، ژمارە ٢، ساڵی یەکەم، کانوونی یەکەمی ١٩٤٨)دا وتارێکی توندی لەدژی ئەم (ژمارە ١٠ی گۆڤاری نیشتمان)ـە نووسیوەو تیایدا گوتوویەتی: ((گۆڤاری نیشتمان لە دەورەی دووهەمیدا بووەتە زمانی حاڵی دەستەیەك ئاژاوەچی)).

کوردستان یەك وڵاتەو ڕووناکبیران و تێکۆشەرانی کورد لە هەرکوێی ئەو وڵاتە بن دەتوانن تێکۆشانی خۆیان درێژە پێ بدەن، لە شاری کەرکووك چالاکانە بەشداری لە چاپکردنی ڕۆژنامەی "ئازادی" و گۆڤاری "شەفەق" و گۆڤارو ڕۆژنامەکانی دیکەدا دەکات. پاشان ڕۆژنامەی "ئازادی" دەگوێزرێتەوە بۆ بەغدادو ئەویش لەگەڵ "نافیع یوونس"دا بەرەو بەغداد دەچێت و هەتاکوو کۆتایی ساڵی ١٩٦٠ لەگەڵ ئەو ڕۆژنامەیەدا خەریك دەبێت.

کاتێك لە مانگی سێپتێمبەری ١٩٦١دا حکوومەتی عەبدولکەریم قاسم شەڕ لەدژی گەلی کورد ڕادەگەیەنێت، پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق بڕیار دەدات ڕێگای خەباتی چەکدارانە بگرێتە بەرو هێزی پێشمەرگە ساز دەدات. هاوکات کۆمەڵێك لە ڕووناکبیران و نووسەرانی کورد دەچنە شاخ و شان بەشانی هێزی پێشمەرگە خەبات دەکەن. محەمەد شاپەسسەندی بێدوودڵی ماڵ و منداڵی خۆی جێ دەهێڵێت و بەرەو چیا سەختەکانی کوردستان دەڕوات و بە هاوکاریی چەند کەسی ڕووناکبیر بناغەی یەکەمین چاپخانەی شۆڕش دادەمەزرێنن و دەست بە دەرکردنەوەی ڕۆژنامەی "خەبات" دەکەنەوە. پاشان چاپخانەکە پەرە پێدەدەن و دەتوانن وێڕای ڕۆژنامەی "خەبات"، چەند گۆڤارو ڕۆژنامەی دیکە دەر بکەن.

ساڵی ١٩٦٤ کێشە لەنێو سەرکردایەتیی پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراقدا سەر هەڵدەدات و سەرەنجام پارتەکە دەبێتە دووکەرتەوە. محەمەد شاپەسەندی لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیدا درێژە بە تێکۆشانی خۆی دەدات و دڵسۆزانە ئەرکەکانی سەر شانی ئەنجام دەدات. پاشان شەڕی براکوژی لەنێوان ئەو دوو باڵەدا سەرهەڵدەدات و هەلومەرجەکە وای لێ دێت کە هەندێك بەرەو ئێران و ئەوانی دیکە بەرەو ناو شارەکان بچن. شاپەسەندی و کۆمەڵێك لە هاوڕێکانی بە نهێنی دەچنە شاری سلێمانی و ئینجا خۆ دەگەیەنێتەوە لای ماڵ و منالی لە بەغداد. پاش ساڵێك باڵی مەکتەبی سیاسی بە شێوەی نیمچە نهێنی دەست بە چالاکیی سیاسی دەکەنەوەو ڕۆژنامەی "خەباتی کوردستان" و چەندین بڵاوکراوەی جۆراوجۆر دەردەکەن. شاپەشەندی لەو دەمەشدا لێهاتوویی و وریایی دەنوێنێت و بێماندووبوون بەردەوام کار دەکات.

بەدرێژاییی ساڵانی حەفتا هەتا ڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١ ژیانێکی زۆر سادەو ساکار دەژی و هەمیشە هەست و نەستی لەگەڵ شۆڕشی نەتەوەکەیدا بووەو بە هەر

ڕێگەیەك بۆی کرابێت لە خزمەت بەو شۆڕشە دریغیی نەکردووە. بەڵام بەهۆی پیرییەوە نەیتوانیوە لە کۆڕی خەباتدا بێت.

لەدوای ڕاپەڕینی ئازاری ۱۹۹۱و ڕامالینی دامودەزگا سەرکوتگەرەکانی ڕژێمی بەعس، شاپەسەندی پاش ساڵەها ژیانی نهێنی دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخسا خۆی ئاشکرا بکاتو لای دۆستانو ڕووناکبیران بڵێت: ((من محەمەد شاپەسەندیمو لاوێکی نێو کۆمەڵەی ژ. ك بوومو دواتر بوومە ئەندامی حیزبی دیموکراتی کوردستانو لە چاپخانەی کۆماردا بەشداریی چاپکردنی گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئەودەمەم کردووەو جار جار وتارو بابەتی ئەدەبیم بڵاو کردوەتەوەو پاشان ئاوارەی باشووری کوردستان بوومو ناوی خۆم گۆڕی، تائێستا بە ناوی "حاجی عەبدوڵڵا" خۆمم بە خەڵك ناساندووەو نەمتوانیوە ڕاستیی خۆم لای هەموو کەس بڵێم)).

"محەمەد فەریق حەسەن"ی چیرۆکنووسو "کەژاڵ ئەحمەد"ی شاعیرو ڕۆژنامەنووس بەر لە هەر کەسێکی دیکە بەرەو پیری شاپەسەندی چوونو بەسەریان کردوەتەوەو وتووێژیان لەگەڵ ساز کردووە.[٧] پاشتریش چەند دەستە لە ڕووناکبیرانو تێکۆشەرانی نێو لایەنە سیاسیەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان سەردانیان کردووەو هەریەك بە جۆرێك ڕێزیان لێ ناوەو وتووێژیان لەگەڵدا کردووە.

دواتر خۆی چەند بەشێك لە بیرەوەریەکانیی لە ڕۆژنامەی "کوردستانی نوێ"و "ئالای ئازادی"و چەند گۆڤارو ڕۆژنامەیەکی دیکەدا بڵاو کردەوە. لەم دواییانەشدا، بە هاوکاریی نووسەری چالاكو دڵسۆز "سدیق ساڵح"، بەشی زۆری بیرەوەریەکانی خۆی نووسیوەتەوە.

ئەوەی لێرەدا شایانی ئاماژەبۆکردنە، ئەوەیە کە محەمەد شاپەسەندی نرخی وێنەو بەڵگەنامەی مێژوویی دەزانێتو ئەوەندەی لەتوانایدا بووە کۆمەڵێك وێنەو بەڵگەنامەی لای خۆی پاراستووە، کە لە نووسینەوەو ساغکردنەوەی مێژووی نەتەوەکەماندا زۆر بەسوودن. هەروەها کۆمەڵێك گۆڤارو ڕۆژنامەی کۆنی لای خۆی

---

[٧] بڕوانە: گفتوگۆیەك لەگەڵ سەربازی نەناسراو محەمەد شاپەسەندی، ئامادەکردنی محەمەد فەریق حەسەنو کەژاڵ ئەحمەد، ڕۆژنامەی "ئالای ئازادی"، خولی دووەم، ژمارە ٢٤، ١٩٩٢/٥/١٤و ژمارە ٢٥، ١٩٩٢/٥/٣١.

هەروەها بڕوانە: محەمەد فەریق حەسەن، محەمەد شاپەسەندی شۆڕەسواری بواری چاپخانەو ڕۆژنامەگەری، ڕۆژنامەی "کوردستانی نوێ"، ژمارە ٤٨٤، ١٩٩٣/٩/١٠.

پاراستبوون، کە لەم ساڵانەی دواییدا بەبێ هیچ بەرامبەرێك ناردنی بۆ یەکێك لە کتێبخانەکانی کوردستان.

ئێستا محەمەد شاپەسەندی تەمەنی هەشتاو پێنج ساڵەو لە شاری سلێمانی لەگەڵ هاوسەرەکەی‌و کوڕو کچەکانیدا ژیانێکی یەکجار ساکار بەسەر دەبات. بەڵام ئەو زیاتر لە هەر کەسێك دڵی بەم ئازادییەی کوردستان خۆشەو خۆی بە بەختەوەر دەزانێت کە بە چاوی خۆی بەری ڕەنجی خەباتی نەتەوەکەی لە پارچەیەکی کوردستان بینی‌و ئاواتەخوازە هەرچی زووتر پارچەکانی دیکەی کوردستان ئازاد بن‌و ئاواتی لەمێژینەی نەتەوەی کورد لە سەربەخۆیی‌و ئازادیی کوردستان وەدی بێت.[8]

ساڵی ١٩٩٦ جەلیل گادانی لێپرسراوی یەکەمی (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران- ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ) بە ئاگاداریی نووسەری ئەم وتارە، وەك ڕێزلێنان‌و بەسەرکردنەوە، چەند ئەندامێکی حیزبەکەی بە کامێرایەکی ڤیدیۆییەوە بۆ ماڵی محەمەد شاپەسەندی نارد، هەتاکوو بەشێك لە بیرەوەریەکانی لە زمانی خۆیەوە تۆمار بکەن. ئەودەم شاپەسەندی لەگەڵ خێزانەکەی لە خانوویەکی کرێدا لە شاری سلێمانی، لە گەڕەکی ئیبراهیم پاشا دەژیان. ئەگەرچی تەمەنی (٧٥) ساڵ بوو، بەڵام سەربەرزانە لەنێو ماڵەکەی خۆیدا لەگەڵ کوڕەکانیدا بە کاری بەرگدوورینەوە خەریك بوون‌و بەو جۆرە بژێوی ژیانیان دابین دەکرد. ساڵی ١٩٩٨ "شاهۆ حەسەنپوور" بەشی زۆری ئەو بیرەوەرییەی خستوەتە سەر کاغەزو نووسەرێك بە نازناوی "هانا" ئامادەی کردووەو لە ژمارە (٢٥٧)ی ڕۆژنامەی "کوردستان"، ١٩٩٨/٤/٢٢[9]دا لەژێر ناوی (محەمەد شاپەسەندی پیتچن‌و نووسەری ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی سەردەمی کۆماری کوردستان)دا بڵاو کراوەتەوە.

---

[8] بۆ ئەم کورتەی ژیاننامەیە سوودم لە زۆربەی ئەو نامانە وەرگرتووە کە محەمەد شاپەسەندی چەند ساڵ لەمەوپێش بۆی ناردووم. هەروەها ڕۆژی شەممە ٢٩/١/٢٠٠٥ کاتژمێر ٤ی پاشنیوەڕۆ بە کاتی سوید لە ستۆکهۆڵمەوە تەلەفۆنم بۆ سلێمانی کردو لەگەڵیدا قسەم کردو بۆ دڵنیایی زیاتر سەبارەت بە هەندێك لایەنی ژیانی پرسیارم لێ کرد.

[9] مامۆستا محەمەد شاپەسندی پیتچن‌و نووسەری ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی سەردەمی کۆماری کوردستان، ڕۆژنامەی کوردستان، (ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)، ژمارە ٢٥٧، ١٩٩٨/٤/٢٢، ل٨-٩. (ئەم ژمارەیەی ڕۆژنامەی کوردستان تایبەتە بە جەژنی سەد ساڵە ڕۆژنامەنووسیی کوردی). لە نووسینی ئەو وتارەدا سوودم لەو بیرەوەریەش وەرگرتووە).

شاپەسەندی لە بەشێك لەو بیرەوەریدا گوتوویەتی: ((کە پێشەوایان ئیعدام کرد، من لە چوارچرا دوو سەعاتان ڕاوەستام. من دەمگوت ئێمە چینو ئەوانە کێن؟ خەڵك خۆی بۆ ڕانەدەگیرا. ئەوسا نزیکەی دوو سەعات ڕاوەستام بۆ ئەوەی ئەو دیمەنەم قەت لەبیر نەچێتەوە!)).

چەند وتارو بەرهەمی بڵاوکراوەی محەمەد شاپەسەندی:

١- خۆشبەختی چییە؟، گۆڤاری "نیشتمان"، ژ٦، ڕەشەمەی ١٣٢٢، ل٧.

٢- هاوار!، گۆڤاری "نیشتمان"، ژ٧و ٨و ٩، بەهاری ١٣٢٣، ل٨.

٣- سەمەند سیامەندۆف، ڕۆژنامەی "کوردستان"، ژ٦، ١٩٤٦/١/٢١، ل١و ٤.

٤- لەنینی دانشجوو، گۆڤاری "هاواری نیشتمان"، ژ١، ١٩٤٦/٣/٢١، ل٢٣، ٢٨.

٥- فیلد مارشاڵ کوتوزۆف، گۆڤاری "کوردستان"، ژ٣، مارتی ١٩٤٦، ل٩، ١٣.

٦- وتاری محەمەد شاپەسەندی بەبۆنەی جێژنی سەربەخۆیی، ڕۆژنامەی "کوردستان"، ژ٢١، ١٩٤٦/٣/٢، ل١، ٢.

٧- مامۆستا عولەماو بەیعەت، هەفتەنامەی "ئاڵای ئازادی"، ژ٥٦٩، دووشەممە ٢٠٠٤/٦/٢١، ل٤.

٨- لە پەراوێزی ژیانو بەسەرهاتی زەبیحی (مامۆستا عولەما)، گۆڤاری "هاوار، ژ١٢، بانەمەڕی ٢٠٠٢، ل٣٦، ٣٩.

٩- لە پەراوێزی ژیانو بەسەرهاتی زەبیحی: نهێنییەکانی چاپی ژمارە (١٠)ی "نیشتمان"، گۆڤاری "ڕۆژنامەنووسان"، ژ١، بەهاری ٢٠٠٢، ل١٢١–١٢٥.

١٠–دەربارەی حکومەتی کوردستان– کورد لە گەمەی سۆڤیێتیدا، ڕۆژنامەی "کوردستانی نوێ"، یەکشەممە ١٩٩٤/٤/٢٤.

ستۆکهۆڵم

٢٠٠٥/٦/٢٥

## گوتوبێژ لەگەڵ نەمر
## "محەمەد شاپەسەندی"
## یادگارێکی دیکەی کۆماری کوردستان*

ئامادەکردنی: کاکشار ئۆرەمار

* ڕێزدار محەمەد شاپەسەندی، یادگارێکی دیکەی کۆماری کوردستان کە لەکاتی کۆماردا ئەندامێکی چالاك بووی هەتا پێش پێکهاتنی کۆماریش لەنێو (کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد)یشدا. باشە ئەتوانم بپرسم محەمەد شاپەسەندی کێیە؟

– من محەمەدی شاپەسەندی کوڕی محەمەدساڵحی شاپەسەندی خەڵکی مەهاباد لە ساڵی ١٩٢٠ لەدایك بووم. ساڵی مەلا خەلیل لە کلاسی تەهییەی دەبستانی پەهلەوی خوێندوومە، تا کلاسی شەشەم لە دەبستانی سەعادەتدا تەواوم کردووە. دوایی لە مەدرەسە نەمخوێندووەو هەر لە موتالای خۆم فێری شت بوومە.

لە ساڵی ١٣١٣ی هەتاوی تا ١٣١٤ گەواهینامەی کلاسی شەشی ئیبتیدایی (سەرەتایی)م وەرگرتووە. لەوەی بەولاوە لای تاجرەکی تەورێزی شاگرد بووم بۆ ئەوەی ئوسووڵی بازرگانی فێر بم. چەند ساڵێك لای ئەو بووم، دوایی تا لە ١٣١٩ی هەتاوی ژنم هێناوەو لە ١٣٢٠–٢١ی هەتاویدا کاتێ ئێران لەلایەن دەوڵەتانی ڕوسیاو ئینگلیسەوە داگیر کرا، کوردستان کەوتە ژێر کۆنترۆڵی ڕووسەکان.

* کوردستان چۆن کەوتە ژێر کۆنترۆڵی ڕووسەکان؟

– لە ساڵی ١٣٢٠ی شەمسیەوە کە سابلاخ بۆمباران کرا، سابلاخیش کەوتە ژێر دەستی کوردەکان کە لە ١٠ی شەهریوەری ساڵی ١٣٢٠ی شەمسیدا بوو. لەوساوە قازی محەمەد کە دوایی بوو بە پێشەوا ئیختیاری بەسەر هەموو سابلاخ‌و ناوچەی موکریاندا پەیدا کرد. ئەوسا ئێمە ترسمان هەبوو مە عەشایری دەوروبەری مەهاباد شەو بێن‌و کوشتار بکەن لە سابلاخ‌و سابلاخ تالان بکەن. قازی محەمەد هەموو ماڵێکی مەجبوور کرد کە ئەسلەحە (چەك) بکڕن‌و خۆیان حیفازەت لە ماڵی خۆیان

---

* تێبینی: ئەو وتووێژە ڕۆژی ٢٠٠٦/٢/١٥ چەند مانگ بەر لە کۆچی دوایی خوالێخۆشبوو "محەمەدی شاپەسەندی" ئەنجام دراوە. لێرەدا، جێی خۆیەتی سپاس‌و پێزانینی خۆم ئاڕاستەی ڕێزدار کاك "کاکشار ئۆرەمار" بکەم کە ئەو دەقەی دە ئیختیار (ماڵپەڕی گزینگ) ناوە. شیاوی گوتنیشە، ئەو دەقە ئاڕاستەکراوی وتووێژێکە کە بە ڕەنگ‌و دەنگ بۆ بەرنامەی (ناودارانی کورد)ی تەلەڤیزیۆنی ڕۆژ تیڤی (Roj TV) کە کاك کاکشار خۆی پێشکێشی دەکا، ئامادە کراوەو نیشان دراوە. س. چ. هێرش

بکەن‌و هەر ماڵێك هەفتەی یەك کەس بۆ شەو بدا بۆ حەراسەت. یانی هەر ماڵێك لە هەر محەلەیەك بەو شێوەیە پارێزرا. بەو جۆرە ئەو توانیی سابلاخێ لە تاڵان‌و وێرانکاری بپارێزێ. ئەوە لە نەتیجەی کۆششی قازی محەمەددا بوو.

* ئێوە چۆن دەستتان بە کارو چالاکیی سیاسی کرد؟

– لەوساوە من هاتوچۆی تەورێزم دەکرد،وردە وردە بۆ کووتاڵ کڕین بۆ بازرگانی‌و شتی وا. بابم ئەو ساڵە بەزاز بوو، یانی کووتاڵفرۆش بوو. من دەچووم کووتاڵم بۆی دەکڕی. لە تەورێز "عەبدوڕەحمان زەبیحی"م دیت. داوای لێ کردم فێری حرووفچینی (پیتچینی)ی چاپخانە ببم. لە ژمارە پێنجی گۆڤاری "نیشتمان" (ئۆرگانی فێرمی کۆمەڵەی ژ. ك من دەستم کرد بە حرووفچینی. ئەوسا بە نهێنی کارمان دەکرد. گۆڤارەکەمان حرووفچینی دەکردو پاشان دەمان دا بە مەتبەعەیەکی ئەرمەنیان‌و چاپی دەکرد. پاش بەینەك ڕووسەکان دەگەڵمان باش نەبوون. ئەوان دەیانویست ئێمە بەرنامەی ئەوان ئیمزا بکەین. ئێمە ڕازی نەدەبووین. قازی ڕازی نەدەبوو، زەبیحی ڕازی نەدەبوو. وردە وردە دەگەڵمان تێك چوون‌و ئیشارەیان دا بە چاپخانەکە کە ئیدی چاپی "نیشتمان" تەئخیر بکەن (وەپاش بێخن). بۆ ئەو مەسەلەیە ئێمە مەتبەعەیەکی بچووکمان پەیدا کردو بردمانەوە بۆ سابلاخ بۆ ئەوەی لەوە بەولاوە خۆمان "نیشتمان" چاپ بکەین. تا ئەوکاتەی کە من ئەو باسەت بۆ دەکەم ٩ ژمارەی "نیشتمان" دەرچووبوو.

* بەڵێ دیارە کە "نیشتمان" ئۆرگانی ژ. ك بووەو ئێوەش ئەندامەکی ئەو کۆمەڵە بوون. باشە تۆ چۆن بووی بە ئەندامی کۆمەڵەی ژ. ك؟

– پێم وایە لە ساڵی ١٩٤٣وە بوو. زۆرم هەوڵ دا ئەوسا زۆر گەنج بووم، زۆرم هەوڵ ئەدا بۆ ئەندامبوون. ڕێبەرانی کۆمەڵە قەبووڵیان نەدەکردم‌و دەیانگوت: تۆ هێشتا منداڵی. لە ئاخریدا "دڵشاد ڕەسووڵی" واسیتەی بۆ کردم‌و قەبووڵیان کردم. من‌و باوکم بە یەك ڕۆژ سوێندمان خوارد لە ماڵی "عەلی ڕیحانی". ئەوانەی کە حوزووریان هەبوو: "عەلی ڕەیحانی"، "دڵشاد ڕەسووڵی"، "عەبدوڕەحمان زەبیحی" بوون. ئەو سێیانە حوزووریان هەبوو کە ئێمە سوێندمان خوارد. لەوساوە من خەریکی گۆڤاری "نیشتمان" بووم لەگەڵ زەبیحی‌دا. من‌و ئەو وەك مامۆستاو شاگرد ئیشمان کرد، چل ساڵ، چل‌وپێنج ساڵ پێکەوە بووین.

* ناوی نهێنیتان چی بوو؟

- ناوی نهێنیم (م. ش. ئازەر) بوو، واتە محەمەد شاپەسەندی ئازەر.

* ناوی نهێنیی باوکتان؟

- نایێتە بیرم.

* مامۆستا ئێوە لە گۆڤاری "نیشتمان"یشدا هەر بەو ناوە شتتان ئەنووسی؟

- بەڵێ لە "نیشتمان"دا شتم هەیە هەر بەو ناوە نووسیومە. لە ژمارە ١٠ی "نیشتمان"دا نووسراوەم هەیە، نازانم ئەوەی ئێوە دیتووتانە لە کام ژمارەدایە.

* بەڵێ پێم وایە لە ژمارەی ٦دا نووسراوەیەکی ئێوەم لەژێر ناوی (م. ش. ئازەر) دیوە.

- بەڵێ منیش باش نایێتە بیرم. شتەکان لەبەر دەسنمدا نین.

* بۆ، سەبەب؟

- سەبەب ئەو ماڵوێرانییەیە کە بۆ کوردو کوردستان هەر بەدواماندا بوو. سێ چوار جاران ماڵیان لێ تالآن کردین.

* ناوەڕۆکی نووسینەکانت لەسەر چی بوون؟

- هەمووی باش نایێتە بیرم، بەڵام یەکەکیان ئەمە بوو: خۆشبەختی چییە. ئەوانەی دیکەم لەبیر نین.

* ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی کە حرووفچینیت ئەکردن،ئێستا هیچیانت لەلا ماون؟

- نە، هەتا ئێستا لە ئێرە لەکاتی ڕژێمی عیراق ٤-٥ جاران مەکتەبەکەیان پێ تێك داوم. هیچم لەلا نەماوە، بەداخەوە.

* باشە ئەو هەموو ساڵە لەگەڵ مامۆستا زەبیحی‌دا پێکەوە بوون. دیتنی ئێوە لەسەر کەسایەتیی نەمر زەبیحی چییە، پیاوەکی چۆن بوو؟

- زەبیحی بە تەواوی مانا کورد بوو. ئینسانەکی باش بوو، سەعیی زۆر کرد کە کۆمەڵە (واتە ژ. ك) ساز بوو. ئەو یەکێ بوو لە گەورە ئەندامانی دامەزرێنەری ژ. ك.

* ژ. ك کە ئەڵێن واتای چییە؟

- ژ. ك یانی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد. کە ئەڵێن کۆمەڵە ژیانی کورد ئیشتیباهە. هێندێك دەڵێن: کۆمەڵەی ژیاندەنەوەی کورد، ئەمەش ئیشتیباهە. هێندێکیش دەڵێن: کۆمەڵەی ژیاندنەوەی کوردستان، ئەمەش ئیشتیباهە، چونکە دەبێ ئەمە بزانین کە میللەت دەژییێتەوە، نەك وڵات. ئەوە قسەی مامۆستا "ئیبراهیم ئەحمەد"ە.

* ئەی دیتنی مامۆستا زەبیحی لەم بارەیەوە چی بوو، کام ناوی پێ دروست بوو؟

– کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد.

* زەبیحی مرۆڤەکی دووربین و زانا بووە.

– بەڵێ، ئینسانەکی بەتەواوی مانا باش بوو. کوڕی پیاوەکی تەقریبەن ئیسلامی بوو، بەڵام نەك ئیسلامی موتەتەریف. خۆشی خوێندبووی. ئەمن لە ساڵی ۱۳۰۷ یا ۱۳۰۸ی شەمسی دیومە کە لەلای "گیو موکریانی" دەرسی فەڕانسەیی دەخوێند. ئەمن ئەوسا زۆر منداڵ بووم، لە کلاسی تەهییە بووم.

* مامۆستا محەمەد ئێوە لەکاتی کۆماری کوردستاندا چەند وەزیفەتان هەبوو؟

– من لەکاتی کۆماری کوردستاندا کە چاپخانوە کوردستان هات (ڕووسەکان هێنابوویان) دوو مهەندیسی دەگەڵدا بوون. کۆمیتەی ناوەندیی ژ. ك منیان بانگ کردو گوتیان کە لە تۆ زیاتر کەس سنعەتی (تەکنیکی) چاپ نازانێ، تۆ بەرپرسی ئەو چاپخانەی. دەبێ کرێکاری تەواومان بۆ ڕابێنی. دەستم پێ کردو خۆم حازر کردو نیزیك بە ۲۰ر شەو مەتبەعەکەم ساز کرد. دەستمان پێ کرد. یەکەم نموونەتی کارمان گۆڤاری "کوردستان" ژمارەی یەك بوو. بۆ نموونە کە بزانین چاك کار دەکا، ناکا. ئەوە بوو کە لەو مەجەللەیەمانڕا دەست پێ کرد. دوایی ڕۆژنامەی کوردستان هات. ڕۆژنامەی کوردستان ڕۆژنامەیەکی ڕەسمی حکوومەتی میللی بوو کە بە دوو ڕۆژ جارێك دەردەچوو و زمانی حاڵی کۆماری کوردستان بوو.

* مامۆستا جگە لە هێمن و هەژار، ئەو کەسانەی کە دەهاتنە چاپخانە یان بابەتیان هەبوو، نویسەندە بوون، ناوی کێیانت دێتەوە بیر؟

– نویسەندەمان زۆر بوو: سەیید محەمەد حەمیدی کە سکرتێری مەسئوول بوو. دوایی گیراو ئاگام لێ نییە کە پاش تێکچوونی کۆمار چیی بەسەر هات. هەموو ئەوانەی کە دەهاتنە چاپخانەی کوردستان ئەندامی ژ. ك بوون. ناوی ئەوانەی دیکەم لەبیر نییە. هەموویان ئەدیب بوون.

* پێشەوا قازیش بۆ ئێوە بابەتی دەنووسی؟

– پێشەوا خۆی بابەتی نەونوسیوە، بەڵام فەرمایش و دەستوورەکانی لە ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردستاندا بڵاو ئەکرانەوە.

* بەڵێ، ئەو نمایشنامەیەی (دایکی نیشتمان) کێ نووسیویە؟

– نازانم نووسینی کێ بوو، بەڵام دایکی عەبدوڵڵا نەهری دەستی باڵای هەبوو لە ئامادەکردنی ئەو نمایشنامەیەدا.

* هێندێك كەس دەڵێن ناوگۆڕینی ژ. ك بەپێی داخوازیی ڕێبەرو پێكهێنەرانی ئەم ڕێكخراوە نەبوە. واتە ئەڵێن قازی محەمەد بەبێ پرسی كەسانی وەك زەبیحی كارەكەی كردووە. واتە ناكۆكییەك لەنێوان پێشەواو ئەودا هەبوە. ئێوە وەكوو شاهیدێكی مێژوویی بۆ ئەم مەسەلەیە جوابتان چییە؟

– من لە بیرەوەریەكانمدا ئەمەم نووسیوە: خەڵك مەسەلەكە گەورە دەكەنەوە، بەڵام وا نەبوە. ڕاستە زەبیحی و چەند كەسێك موخالیفی ئەوە بوون كە پێشەوا ببێ بە بەرپرسیاری كۆمەڵە، بەڵام ئەوە لەبەر ئەوە نەبوو كە پێشەوا لایقی ئەوە نەبێ، چونكە پێشەوا پێش ئەوەی ئێمە لەدایك ببین بەرپرسی سابلاخ بووە. مامی پێشەوا خۆی هەر لەسەر پاراستنی خەڵكی سابلاخ كوژراوە، یانی ڕووسان كوشتوویانە. ئەوانە هەر بە تایفە نفوزیان هەبوە لە سابلاخ. نفووزی قەزاوەتیان هەبوە، تفووزی كاروباری خەڵك دروستكردن. نا ئەوە ڕاست نییە.

* ئەی خودی زەبیحی لەم بارەیەوە چیی ئەگوت؟

– تۆ بڕۆ كتێبی (ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی) بخوێنەوە، تێ دەگەی. زەبیحی وەختێ كە كۆماری كوردستان كەوت، ڕایكرد بۆ ماڵە قازی. دوو سەعات و نیو هەوڵی داوە بەڵكە قازی ڕازی بكات كە سابلاخ بەجێ بێڵێ، قەبووڵی نەكرد. لە عیراق هەوڵ دراوە بە حوزووری نەمر مەلا مستەفا بارزانی كە ناوی قازی نەیێنن، هەژار قەبووڵی كردووە، بەڵام زەبیحی لێرە هەمیشە دیفاعی لێ كردووە. پاش ئەوەی كە كۆماریش نەماوە، ئەو هەر پێشەوای پاراستووە. ئینسان چۆن دیفاع لە یەكێك دەكات كە خۆشی نەوێ!! یا دوژمنایەتیی لەگەڵ هەبێ. هەمووی قسەی دوژمنانە.

* لەم بارەیەوە قسە زۆرە، ڕۆژی ڕاگەیاندنی كۆماری كوردستان لەبیرتانە؟

– بەڵێ باش لەبیرمە، هەموو شتێك وەكوو ئێستا لەبەر چاومن.

* باشە هێندێك باسی ئەو ڕۆژە پیرۆزەمان بۆ بكە، چی كرا چی نەكرا؟

– باش لەبیرمە، ئەوەی لەبیرمە، ڕۆژێ ئێمە هەموومان لە چاپخانە ئامادە بووین. ئێمە فیرقەیەكی نەشیدمان هەبوو. قەرار وابوو لەوێ ئامادە بین و سروود بخوێنینەوە. نەسیدەكەش ئەوە بوو: نیشـــتمانم ڕەنگینە بەهەشـــتی ســـەر زەمینە

خاكم وەكوو ئاڵاكەم ڕەنگ سوورو سپی و شینە

شیعری هەژارە. ئێمە لەو ڕۆژەدا ئامادە بووین بۆ ئەوەی كە وەختی مەراسیمەكە ئەو سرووده بخوێنینەوە. سروودەكەمان خوێندەوە. پاشان دەست پێ كرا: پێشەوا قازی

خۆی خەتابەیەکی داو قسەی کرد. دوایی ئەوانەی کە دەبوو خیتاب دەن زۆر بوون. یەك یەك هاتن و قسەیان کرد. سەیید عەزیزی شەمزینی ...

* زێرۆ بەگی هەرکی، سەیفی قازی ...

– زێرۆ بەگی هەرکی خیتابەکەی باش نەبوو، ڕووسان فێریان کردبوو بۆ ئەوەی ئەو مەجلیسە تێك بدەن. فێریان کردبوو کە خیتاب بدات دژی باوکی شەمزینی (حاجی عەبدوڵڵا ئەفەندی)، کە دژی ئەو خیتاب بدات و بڵێت ئەو پیاوی ئینگلیزەکانەو هاتوەتە ئێرە. بەڵام قازی زوو جێبەجێی کردو ئیتر نەیهێشت بێ بە هەڵڵا.

* بۆچی ڕووسەکان ئەیانویست ناکۆکی لەنێوان کوردەکاندا دروست بکەن؟

– بۆ ئەوەی ئەوان ڕازی نەبوون، دەیانویست کوردستان ببێ بە پارچەیەکی ئازەربایجانی قەفقاز. قازی محەمەد بەوە ڕازی نەبوو، کورد ئەوەی قەبووڵ نەدەکرد. لەبەر ئەوە ئەوان دەیانویست تێکی بدەن. بەڵام بۆیان نەکرا. ڕازیبوونیشیان بۆ ئەوەی کە کورد ئیعلانی ئیستیقلال بکات، واتە ئیعلانی جەمهووری بکات. هەر لەبەر خاتری ئەوە بوو دیتیان کورد ڕازی نابن، مەجبوور بوون.

* ئەی ئەو قەرارە چۆن درا، کێ قەراری دا کە کۆماری کوردستان ئیعلان بکرێت، ئەگەر ڕووسەکان موافیق نەبوون؟

– وەختێ کە ئەو مەراسیمە هەبوو، دوو کەس لە زابتە گەورەکانی شووڕەوی لەوێ دانیشتبوون و لە نیزیك و دوورەوە موراقەبەی ئەو مەجلیسەیان دەکرد. کوردەکان خۆشیان بڕیاردەر بوون و پێشەوا ئاگای لە پیلانەکان هەبوو، ئەیزانی چ بکات.

* ئەو گرووپە کە سروودتان خوێند چەند کەس بوون، ناوی کێتان لەبیرە؟

– ئەوان هەموویان کرێکارەکانی چاپخانەی چاپخی کۆمار بوون. هەموویان ئامادە بوون. ناویان جارێ لەبیرم نییە، دوایی بۆتان ئەڵێم کە بینووسن. لە بیرەوەریەکانمدا ناوی هەموویان نووسراوە.

* ناوەڕۆکی خیتابەکی پێشەوا لەسەر چی بوو؟

– هەر لەبارەی مێژووی کردستاندا بوو کە ئێمە ڕازی نابین بچینە ژێر ئەمری هیچ کەس. ئەو لە باکۆش هەر ئەو نوتقەی کردو گوتی: ئەگەر قەرار بێ ئێمە ژێردەستی خەڵکی دیکە بین، دەچین ژێردەستی فارسەکان بین. ژێردەستیی فارسەکان و ئێرانیەکان باشترە بۆ ئێمە لە ژێردەستیی ئازەربایجانیەکان.

* ئەو ڕۆژە ئاڵا هەڵکرا، چەند ئاڵاتان هەبوو؟

– یەك دانە ئاڵای گەورە هەڵکرا. لەو مەجلیسەدا کە ئاڵای کوردستان بە ڕەسمی هەڵکرا، دوو سێ ڕۆژ دوای ئەو حەفلەیە بوو. یانی ئاڵا بە شێوەیەکی ڕەسمی دووسێ ڕۆژ پاش ئیعلانکردنی مەراسیم هەڵکرا.

* بەڵام ئەو ئاڵایەی لە ڕۆژی ئیعلانکردنی کۆماردا هەیەو دەبینرێت، لەسەر ئەو مێزەیە کە پێشەوا لە پشتی ڕاوەستاوە.

– ئەوە وەك مەراسیمێك هەبوو، بەڵام ڕەسمی نەبوو. چەند ڕۆژێك پاش ئەوە بە ڕەسمی لە سەربانی دادگوستەری (مەحکەمە) ئاڵای کوردستان هەڵکرا. هەیئەتی دەوڵەت هەموو حازر بوون لەوێ، من خۆشم لەوێ بووم.

* ئەی کوردەکانی دیکە کە لەژێر دەسەڵاتداریی کۆماری کوردستاندا نەبوون، کوردەکانی ناوچەکانی دیکە، مەسەلەن هی کرماشان، سنەو ...

– لە کۆماردا هەموویان نوێنەرین هەبوو. نوێنەری دێیەکان، نوێنەری مامەش، دێبوکری، نوێنەری گەورك، مەنگوڕو قیسمەتێك لە ئاغاکان خۆیان حازر بوون لە مەراسیمەکەدا.

* مامۆستا شاپەسەندی، پێشەوا قازی محەمەد شەخسییەتێکی چۆنی هەبوو، مرۆڤێکی چۆن بوو، زۆر جار پێشەواتان بینیبوو

– ئەغڵەب دیتوومە، زۆر جارم دیتووە. ئینسانێکی ئارامو مولایمو وەك ئارچی ڕۆزڤێڵت دەڵێت: ڕەنگی مایل بە زەردی بوو، یانی ساخ نەبوو. تەقریبەن مەعیدەی ساخ نەبوو. ئینسانێکی زۆر ئارامو زۆر دێموکرات بوو. من لە مەدرەسەش دیمە. بەینێك مودیری مەعاریف بوو. خزمەتی زۆری بۆ خەڵك کرد. مەکتەبێکی کچانی دروست کردو زۆر کاری دیکەش.

* نەزەری لەبارەی ژناندا چ بوو؟

– دێموکراسیانە بوو، چونکە خۆی مرۆڤێکی دێموکراتخواز بوو. ئینسانێکی ئەسیل بوو، ئەسڵزادە بوو.

* ئەی براو کوڕە مامەکەی؟

– سەدری قازی نوێنەری پارلەمان بوو، مرۆڤێکی دیپلۆمات بوو. سەیفی قازی تەقریبەن ئینسانێکی ئاغا سیفەت بوو، مڵكو ماڵدارییان هەبوو. ئینسانێکی قەڵەوو جسمی گەورە بوو، بەخۆوە بوو. کەڵەگەتو هەیکەلدار بوو، هەموویان پیاوی خاس بوون.

* پێشەوا موقاوەمەی کردووە، هەمیشە دیفاعی لە مافی نەتەوەی کورد کردووە. موحاکەمەکەی هەیەو دەتوانم بتاندەمێ. ئەو هەمیشە دیفاعی لە میللەتی کورد کردووە. مەرد بوو، سەری بۆ عەجەم دانەنواندووە.

* ڕاستە کە دەڵێن لەکاتی موحاکەمەدا لە ئەفسەرێکی داوە؟

– نازانم، وەکوو دەڵێن ئەو موحەقیقە قسەیەکی تەوهینامێزی دەرهەق بە کورد کردووە. ئەویش کورسیەکەی هەڵگرتووەو ویستوویەتی لێی بدا. بەڵێ ئەوە ڕاستە.

* ئەمر سەدری قازی لە کۆماری کوردستاندا پیاوێکی ئاکتیڤ نەبوە، ئەی بۆچی ئیعدام کراوە؟

– وەڵاهی قەوامول سەڵتەنە دەزانێ لەپێش موحاکەمەکردنی ئەوانەدا ئەوامیر هەبوە کە دەبێ ئەوانە نەمێنن. ئەمما شا کە قسە دەکات، دەڵێ من نەمگوتووە ئەوانە بکوژن. قەوامول سەڵتەنەش وا دەڵێت. بەڵام پێش موحاکەمە، ئەوانە حوکمیان دراوە. ئەمما هەموویان درۆ دەکەن. عەجەم قەت لەگەڵمانا ڕاست نەبوون، هەتا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت.

* پێت وایە گەورەترین سەبەبی تێکچوونی کۆماری کوردستان چی بوو؟

– گەورەترین سەبەب گەڕانەوەی ڕووسەکان بوو. ڕووس گەڕانەوە، وازیان هێنا. ئازەربایجان تەسلیم بوو. پاش تەسلیم بوونی ئەوان، سی هەزار کەس لە ئازەربایجان کوژران، پاش ئەوەی کە پیشەوەری‌و هاوڕێیانی هەڵاتن. بەڵام وەزعی ئێمە وا نەبوو، ئێمە زۆر باش بووین.

* لە چ بوارێکدا وەزعتان باشتر بوو؟

– لە بواری تەلەفات‌و خەسارەی ماددی‌و جانی. لە کوردستان کەسی وا نەکوژرا، جگە لەوانەی کە ئیعدام کران.

* فەرقەکانی هەردوو کۆماری کوردستان‌و ئازەربایجان چی بوون؟

– کۆماری کوردستان بەری خەباتی میللەتی کورد بوو. میللەتی کورد خۆی دەیەویست خاوەن دەوڵەت بێ. ئەمما کۆماری ئازەربایجان بەرنامەیەکی ڕووسی بوو بۆ داگیرکردنی ئازەربایجان. فەرقە ئەساسیەکە ئەوەیە.

* ئەی شێوەی ئیدارەکردنی هەردوو کۆمارەکە لە چ بوارێکدا جودا بوو، یا کەسایەتیی پێشەواو پیشەوەری ...

– ئەوان ڕژێمێکی زۆر ئیستیبدادی بوون. ڕێبەرانی حکوومەتی ئازەربایجان ئیستیبدادی بوون، بەڵام لای ئێمە دێموکراسی هەبوو. تۆ دەتوانیت شکایەت بکەی

له کامه وەزیر که داوات بوو بچیه لای قازیو له مەحکەمەدا شکایەتی لێ بکەی. بەڵام له ئازەربایجان ئەوە نەکرا.

* مامۆستا ڕاسته که دەڵێن پێشەوا زۆر جار له ماڵێرا به پێیان دەهاته دەفتەری کاری خۆی؟

- بەڵێ، ئەوسا سابڵاخ بچووك بوو، ماشینی تێدا نەبوو. هەموو کەس مەجبوور بوو به پێیان بڕواته سەر کاری خۆی. تەنیا یەك ماشین له بەر دەرگای پێشەوادا هەبوو. ئەویش بۆ ڕێگای دوور بەکار دەهێنرا، بۆ ڕێگای نێو شارو سەر کاری خۆی بەپێیان دەهات.

* بەڵام زۆر کەسیش دەڵێن چوار هەتا حەوت ماشین له بەر دەرگای پێشەوادا هەمیشه ئاماده بوون.

- من ئەوە نازانم، نایێته بیرم.

* ئەی پێشەوا بەو حاڵه نەدەترسا وەکوو ڕەئیس جەمهوور گیانی له خەتەردا بێت؟

- نەخێر، چون ئەو ئینسانێکی باش بوو، خەڵکەکه زۆری خۆش دەویست. حاکمییەتی ئەو لەسەر دڵان بوو. دڵی ئینسانەکانی بۆ خۆی کڕیبوو، پیاوی وا نەبوو!

* باشه، پاشناو یان لەقەبی پێشەوا چۆن یا کەی درا به قازی محەمەد؟

- من ڕەسمەن ئاگام لێ نییه، بەڵام ئەو ناوه دەبێ هی هەژار بێت. کاتێ تەشریفاتی سەرۆك کۆماری جێبەجێ کرا، لەوساوه پێشەوا بوو. هەموو کەس ئەم پاشناوەی بەدڵ بوو، "زەبیحی"ش موخالیف نەبوو.

* ئەی چۆن بوو که لەکاتی کۆماردا کابینەی وەزیران هەر هەموویان خەڵکی سابڵاخێ بوون؟

- ئەغڵەبی ئەوانەو قیسمی زۆریان له دامەزرێنەرانی ژ. ك بوون. ئینجا تەبعەن دەبێ شیرکەتیان هەبێ له وەزارەتەکاندا.

* دیتنی ئێوه لەسەر هەردوو شاعیری میللیی کۆمار، واته هەژارو هێمن چییه، فەرقی وان چییه؟

- هەژار زۆر بەسەواد بوو، زۆریش شاعیر بوو. ئەمما مرۆڤێکی سیاسی نەبوو. هێمن ئینسانێکی باش بوو، ناوەکەی خۆی بەخۆیەوه بوو، بەسەوادیش بوو، بەڵام نەك

بەقەدەر هەژار. قووەی شیعری هەژار لی هی هێمن زیتر بوو. ئەمما شیعرەکانی "هێمن"یش هەمووی واتەدارن و ئەغلەب کراون بە گۆرانی و شتی وا.

* نیزیکەی ٦٠ ساڵە تۆ لە کاری کوردایەتیدای، هێندێك باسی سەرگوزەشتی خۆتان بکە پاش ئەوەی کۆماری کوردستان تێك چوو.

- پاش تێکچوونی کۆماری کوردستان دەگەڵ "غەنی بلووریان" هاتین بۆ ئێرە (باشووری کوردستان). لەوێ غەنی نەیگوت من سەر بە حیزبی توودەم. باسی ئەوەی لەگەڵ ئێمەدا نەکرد. ئێمە قەرارمان ئەوە بوو کە بۆ بووژاندنەوەی حیزبی دێموکراتی کوردستان کە ٩٠٪ی ئەندامەکانی گیرا بوون یا کوژرابوون کارێك بکەین. قەرار وا بوو ئێمە ئیش بکەین بۆ بووژاندنەوەی ئەو حیزبەو بێین بۆ عیراق. لەوێ ئێمە چەند دانیشتنێکمان کرد، بەلام ئەو لە (ئاڵەکۆك)دا دەڵێت: ئێمە یەکێکمان نارد بۆ لای "ئیحسان تەبەری" لە تاران... ئەوە ڕاست نییە. ئەمن خۆم لەوساوە بێزار بووم لە حیزبی توودە. ڕۆژی نەورۆزی ساڵی ١٩٤٨ ئێمە لە سنووری عیراق بووین. من بە تەنیا هاتم بۆ سلێمانی و چووین بۆ سەر قەبری قودسی و شەهیدەکانی دیکە. پاش ئەوەی دەگەڵ "عوسمان دانش" (ئەوسا ئەو تووشم بوو لای مزگەوتی گەورە لە سلێمانی)و پێکەوە چووین بۆ سەرقەبران. دوایی چووین بۆ گوندی سیتەك و لەوێ "زەبیحی"م دۆزیەوە. تێلگرافێکم کرد بۆ غەنی. غەنی ڕۆژی دوایی هات. هەموومان (من، غەنی بلووریان، زەبیحی و شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموودی بەرزنجی) قەرارمان دا بنکەیەکی چاپی دابنێین و خزمەتی کورد بکەین. دروستکردنی چاپخانەیەك بە من سپێردرا. غەنی هیچی نەدەزانی. هەرچەند زەبیحی پیشەی چاپخانە بەڵەد بوو و هەتا ڕادەیەك لێی دەزانی، بەلام لەو پلەیەدا نەبوو کە بتوانێ مەتبەعە (چاپخانە) دروست بکات. ئەوە من قەبووڵم کردو نیزیکەی مانگێك هاتوچۆی ئاسنگەرێکم کرد بە نێوی شێخ حوسێنی ئاسنگەر. لێرە، لە سلێمانی بوو کە چاپخانەکەم ساز کرد. من و غەنی و زەبیحی ژمارە ١٠ی "نیشتمان"مان پێ چاپ کرد. لەو ژمارە١٠یەی ئێمە نیزیکەی ٣٠٠ ژمارەمان لە سلێمانی و بەغدا بلاو کردەوە. باقیەکەمان بە سێ جار ناردەوە بۆمەهاباد. دوو جار بەهۆی قاچاخچییانداو جارێکیش غەنی خۆی گوتی ئەڕۆمەوەو ١٥٠ ژمارەی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ ئەودیوی کوردستان. غەنی کە دەگاتەوە سابلاخ تەبعەن لەگەڵ توودەییەکان ڕێك دەکەوێت و قیادەی حیزبی دێموکراتی کوردستان لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە دەگرنە دەست.

ئینجا ئەو لە (ئاڵەکۆك)دا داوا دەکاتو دەڵێ من لە ژمارە ١٠ی "نیشتمان"دا حازر نەبووم، بەڵکوو من مەجەللەی "ڕێگا"م چاپ کردووە. من لە بیرەوەریەکانمدا جوابم داوەتەوە هەمووی بە شهوودو ئیستیفادەم لە قسەکانی خۆی کردووەو سابیتم کردووە کە ڕاست ناڵێت. ڕێگا، مەجەللەیەکی کۆمۆنیستی بوو کە "ڕەحیم سوڵتانیان" ساحێبی بوو. یەکەم ژمارەی ڕەحیم سوڵتانیان لە تەورێز چاپی کردووە. دوێنێ لە ماڵێ وەبەر چاوم کەوت. ئەمما غەنی دەڵێت ئێمە لە سیتەك چاپمان کردووە، کە ڕاست نییە.

* گۆڤاری "نیشتمان" ئاخرین ژمارەی ١٠ بوو؟

– بەڵێ.

* پاشان قەت کارتان نەکرد کە دیسان چاپی بکەنەوە؟

– نە، لەو مەرحەلەیە مەرحەلەی "نیشتمان"و کۆمەڵە ڕۆیشتبوو، مەرحەلەیەکی دیکە هاتبوە گۆڕێ.

* ئەو مەرحەلەیە چی بوو؟

– ئەو مەرحەلەیە بوو کە زەبیحی هاوکاریی هەبوو لەگەڵ پارتی دێموکراتی کوردستان. لێرە ئەخباریان لێ داین کە شێخ لەتیف بەرزنجی کوردەکانی ئێرانی هێناوەو دایناون لە سیتەكو چالاکیی سیاسی دەکەن. پێش ئەوە خەبەریان دابوو بە ئێمە. پێش ئەوەی ئێمە بگرن، من پێش زەبیحی ڕامکرد بۆ بەغداو "زەبیحی"ش پاش من هات.

* لە بەغدا چیتان کرد؟

– زەبیحی ماوەیەك لای کابرایەك مایەوە بە نێوی عەبدوڵڵا کە خۆی خەڵکی ئێران بوو. ئەوە خاوەن کابارە بوو، ئینسانێکی باش بوو. زەبیحی دەگەڵ قزڵجی‌دا بوو. هەردوکیان بوون بە وەکیل. یانی هەردوو وەکیلی عەبدوڵڵا بوون. زەبیحی دەفتەری داراییەکەی دەکردو قزڵجیش پارەی ئەوی وەردەگرت لە جیاتی عەبدوڵڵا. یانی کابارەکە جێگایەکی عادی نەبوو، هەموو وەزیرەکانی عیراق هاتوچۆی ئەوێیان دەکردو کابارەکە تایبەتی بوو بۆ وەزیرەکان: نووری سەعیدو ...

* ئەی گۆڤاری "نیشتمان" ئاخرین ژمارەی چ بابەتێکی تێدا بوو؟

– لەبیرم نییە، ئەمما خۆم بابەتێکم هەیەو غەنیش بابەتێکی هەیە. من بە ناوی "ئازاد" ئیمزام کردووە. غەنی لەبیرم نییە چ بوو. غەنی ئینکاری ئەوە دەکات، بەڵام ڕاست ناکا.

* بابەتەکی تۆ ناوەڕۆکی لەسەر چی بوو؟

– چاك لەبیرم نییە.

* مامۆستا شاپەسەندی، تەمر زەبیحی قەدەرەکەی زۆر بە تاڵی دوایی هاتووە. ئەو مرۆڤە ئاکتیڤ و ڕۆشەنبیرو زانایە، زۆر کاری کردووە بۆ فەرهەنگی کوردی. چۆن بوو کە ئەو مرۆڤە بە ئاسانی ژیانی خۆی لەدەست دا؟

– هێندێك کەس تووشیان کرد. ئاخر شەرت نییە. پیاوێکی گەورە بوو. مەسەلەن پیاوێکی ئاقڵ یا پرۆفیسۆرێك دەبینی ئیشتیباه دەکات، بۆ ئیشێکی زۆر هاسان ئیشتیباه دەکات. ئیشتیباهێکی زۆر گەورە دەکات کە سەری تێدا ئەڕوات. ئەوانەی کە ڕەفیقی زەبیحی بوون، ئەوانە هەموو دەڵێن زەبیحی بۆ ئەو کارەی کە خۆی تووش کرد، نەدەبوو. ئەو لایقی کارهای گەورەتر بوو. زوڵمی لە خۆی کرد.

* چۆن بوو شەهید کرا، ئەسبابی شەهیدکردنی چی بوون؟

– ئەسبابی شەهیدبوونی، لێرە حکوومەتی عیراق دەیویست هاوکاریی ئۆپۆزسیۆنی ئێران بکات. بەهۆی زەبیحییەوە چەك و تەقەمەنی و ئەو جوورە شتانەی بۆ دەناردن. جاری ئەووەڵ ئەوانە دەهێنێت و دابەشیان دەکات. جاری دووهەم دەیهێنێت و بەشێك لەو هاوکاریانە دەدات بە پێشمەرگەکانی یەکێتی کە شەڕی هەیە دەگەڵ دەوڵەتی عیراق. ئەوە ئەخباری لێ دەکەن. ئەویش کە دەچێتەوە، هەر لە ڕێگا دەیگرن و دەیکوژن. لە نیسانی ساڵی ١٩٨٠دا زەبیحی کوژراوە.

* ئەو کتێبەی کە کاك "عەلی کەریمی" لەسەر زەبیحی نووسیویە، دیتووتە؟

– بەڵێ، خوێندوومەتەوە.

* نەزەرتان لەبارەی ئەم کتێبە چییە؟

– لەو کیتابەدا، عەلی کەریمی سەلاحییەتی ئەوەی نەبوو کە ئەو کارە بکات. عەلی کەریمی ئەو سەوادەی نییە کە بتوانێ ئەو کیتابە جێبەجێ بکات. مەسەلەن لەدژی قازی محەمەدی نووسیوە. بەڵام زەبیحی خۆ دژی قازی محەمەد نەبوە. لە ئاخردا زەبیحی زۆر هەوڵی دا کە لەگەڵی بڕوات بۆ عیراقێ یا بۆ باکۆ، بەڵام قازی ڕازی نەبوو و گوتی: ئەمن میللەتی خۆم بەجێ نایێڵم. کە ڕووسان زەبیحەیان وەلانا، قازی محەمەد گرتیەوە (پشتگیریی لێ کرد). قازی محەمەد کاری داێ، لە ماڵی خۆی کاری دەکرد، وەکوو موشاویر وابوو بەنێك. دە ئاخریشدا بوو بە موفەتیش. واتە دەچوو پێشمەرگەکانی تەفتیش دەکرد. ئیشوکاری پێشمەرگەی جێبەجێ دەکرد.

* کاتێ پێشەوا شەهید کرا، تۆ لەکوێ بووی، چۆن زانیت؟

– (ئاهێك هەڵدەکێشێ و جواب دەداتەوە) دەمانزانی شەهید دەکرێ. ئێمە شەوی پێش ئەوەی شەهید بکرێ خەبەریان داینێ. خەبەریان داینێ و من بەیانی زوو چوومە دەرێ. چووم دیتم هەڵواسرابوون لە چوار چرا. نیزیکی دوو سەعات من هەر ئەوها دانیشتم. گوتم بۆ ئەوەی ئەو دیمەنە چاك دەگەڵ خوێنم تێکەڵ ببێ، با بزانین دوژمنمان کێیە.

* گریای؟

– تەبعەن، ئەی چۆن نەگریام، کێ هەبوو کورد بێ و لەو ڕۆژەدا نەگری!

* خەڵکەکە ...

– خەڵك، هەموو کەس دەگریان، ژن دەگریان، پیاو دەگریان، منداڵ دەگریان، کەس نەبوو نەگری. ئەو دیمەنەی قازی محەمەد، ئەو قازییەی کە گوڵی سابلاخ بوو، ڕووحی سابلاخیان بوو، وای لێ هاتبوو. عەجەم ئەوهای بەسەر کورد هێنا.

* ئەی لەم حاڵەدا کە مینا خانم و وان هاتن، چییان کرد؟

– لەبیرم نییە، چونکە قەرەبالقچخی زۆر بوو، خەڵکیش نەیاندەوێرا زۆر ئیزدیحام بکەن. خەڵکەکە خۆشیان نەیاندەوێرا زۆر ڕاوەستن، عەسکەرەکانی ئێران چواردەوریان گرتبوو.

* ئیحتیمالی ئەوە نەدەدرا کە لەنێوان خەڵك و عەسکەرەکانی دەوڵەتدا شەڕ بکرێت؟

– دەوڵەت ئیحتیاتی خۆی کردبوو لە هەموو بوارێکدا، ئامادە بوو، سەربانەکان هەموو گیرابوون، جادەکان هەموویان داگیر کرابوون. ڕێگا نەمابوو کە نەگیرابێت.

* مامۆستا تا ئەو جێگایەی کە بێتە بیرتان جەنازەکان چەند سەعات بەسەر دارەوە مان؟من لەوێ بووم.

– تەقریبەن هەتا سەعات ١٠ یا ١٠,٥ی بەیانی ئەوانە بەسەر دارەوە مابوون. دوایی ئەمن ڕۆیشتم، نازانم ئیتر کەی لێ کراونەتەوە.

* هێندێك کەس دەڵێن کە دەوڵەت نیازی وابوو بۆ سێ ڕۆژان جەنازەکان بەسەر دارەوە هەڵواسراو بهێڵێتەوە. بەڵام خەڵکەکە نەیانهێشت.

– بەڵێ ڕاستە، دەوڵەت نیازێکی وای هەبوو. خەڵکیان نارد، ڕیشسپییان نارد بۆ لای قائیدی عەسکەریی مەهاباد؛ داوایان لێ کرد کارێکی وا نەکەن، چونکە ئیمکانی ئەوە هەبوو خەڵکەکە شۆڕش بکەن.

* پاش شەهیدکردنی پێشەوا قازی محەمەدو هاوڕێیانی، چەند کەسی دیکەش شەهید کرابوون، لەو شەهیدانە ناوی کێتان لەبیرە؟

– ئەو چوار کەسەی دیکە: "ڕەسووڵی نەغەدەییان" کە ڕەسمەکەیم دا بە ئێوە، "حامید مازووچی"، "عەبدوڵڵای ڕۆشنفکر"و "محەمەدی نازمی".

* مامۆستا چۆن بوو کاتێ پێشەواو هاوڕێکانی گیران، تۆ هەڵنەهاتی؟

– ئەمن ئەوسا بە ناوی کرێکارێك لە چاپخانەدا مەشغووڵی کار بووم، ئەوان بەدوای ئەو کەسانەدا چوون کە لە من موهیمتر بوون. دیارە لە وەزعێکی وادا بەدوای مندا ناکەون. ئەوان بەدوای گرتنی کەسایەتیە مەشهوورەکانەدا بوون. جارێ وەختی ئێمە مابوو کە بێن بەدواماندا. کە زانیمان وەختی گرتنمان هاتووە، منو چەند کەسی دیکە پێکەوە هاتینە ئەم دیوی کوردستان.

* چۆن بوو ئەو وەزیرانەی دیکەی کابینەی کۆمار نەگیران، مەسەلەن بۆ نەمر باباشێخ نەگیرا؟

– حاجی باباشێخ ئینسانێکی شێخو گەورە بوو، دینی بوو، لەنێو خەڵکی کوردستانی ئێران نفووزی هەبوو. لەگەڵ شاهی ئێران سابیقەی یەکتر ناسینیان هەبوو، شاه هەمیشە لێی پرسیوە (جا نازانم پارەی بۆ ناردووە، یان نا). لەبەر ئەوە دەستیان لێ نەدا. هێندێك کەس بۆ کاتێکی کەم گیرا، بەڵام بەردرا. مەلا خەلیلیش لە ساڵی ١٣٠٧دا عاسی بوو، گوتی پۆشینی جلوبەرگی پەهلەوی حەرامە، کڵاوی پەهلەوی حەرامە، ئەویش کە دوایی مەجبوور بوو تەسلیم بێ، پەهلەوی عەفووی کرد.

* لەکاتی موحاکەمەکردنی پێشەوادا، ئەوانەی کە لەدژی پێشەوا نامەیان ئیمزا کرد بۆ ئیعدامکردنی، ناوی کێتان لەبیر ماوە، چۆن بوو ئەوە کرا؟

– ئەوە ئەغڵەبی فشاری حکوومەت بوو. ئێمە کەم کەسمان هەبوو دوژمنی گیانی پێشەوا قازی محەمەد بێ.

* ئیمزاکردنی ئەو نامەیە تەئسیری بۆ ئیعدامکردنی پێشەواو هاوڕێیانی هەبوو؟

– نەخێر، ئەوە بۆ ئەوەی بڵێن میلەت خۆی داوای کردووە ئەوانە بکوژرێن، لەدار بدرێن. بۆ ئەوەیە کە جوابی ڕۆژاوا بدەنەوە، جوابی خەڵك بدەنەوە.

* پێتان وایە عەشایری کورد چەندە دەوری لە ڕووخاندنی کۆماردا هەبوو؟

– ئاغاو بەگەکان، یانی سەرۆك عەشیرەتەکان بەگشتی لەگەڵ قازیدا نەبوون. هەرچەند قیسمێکیان تیدا بوون، بەڵام لەگەڵ مەسەلەی کورددا نەبوون، دژی مەسەلەی کورد بوون.

* هێندێك دەڵێن پێشەوا قازی محەمەد چوو بۆ پێشوازیی ئەو سەرهەنگە کە قەرار بوو بێت مەهاباد بگرێتەوە. ئەو کارەی پێشەوا بە خۆتەسلیمکردن حیساب دەکەن، بۆچوونی ئێوە چییە؟

– ئەو کەسە سەر هەنگ نەبوو، گەورەتر بوو. من لە بیرەوەریەکانمدا هەموو شتێك‌و ناوەکانیانم نووسیوە. ئەوان داوایان لێ کردبوو بڕوا پێشوازییان لێ بکات، مەجبوور بوو کارێکی وا بکات.

* بۆچی؟

– چونکە خۆی تەسلیم کرد بۆ ئەوەی خەسارەتی گەورە بۆ خەڵکەکە نەیێتە پێش. یا دەبوو ڕابکا، یا دەبوو ئەوی حکوومەت بڵێ قەبووڵی بکات.

* بەڵام پێشەوا قازی دەیزانی کە دەکوژرێ!

– بەڵێ، لەبەر ئەوەی چوو، وەك ئەوەی بەسەر تەورێز هات، بەسەر میللەتی سابڵاخ نەیێت. ئەو خۆی کرد بە قوربانی میللەتی کورد بەگشتی‌و میللەتی سابڵاخ بەتایبەتی.

* دیارە ئەو پیشبینی‌و دووربینییەی پێشەوا زۆر موئەسیر بوو.

– مەلا مستەفا زۆر هەوڵی لەگەڵ دا کە بڕوا، زەبیحی زۆری هەوڵ دا کە لەگەڵی بڕوا، قەبووڵی نەکرد؛ گوتی من میللەتی سابڵاخ بەجێ ناهێڵم. ئەوە شتێکی ئاشکرا بوو، هەموو کوردی سابڵاخ ئەوە دەزانن.

* ئێستا ٨٥ ساڵ لە تەمەنت گوزەراوە، گەورەترین ئارەزووت لە ژیاندا چییە؟

– ئەوەیە هەموو پارچەکانی کردستان یەك بگرن. کورد ئازاد بێ. ئەوە نەك ئارەزووی منە، هی هەموو کوردێکی دڵسۆزە.

* پەشیمان نیت لەو هەموو ڕەنج‌و زەحمەت‌و جەفایە؟

– ئەگەر دوای مردن زیندوو ببمەوە، هەر ئەو ڕێگایە دەگرم" ئەو ڕێگایەی کە خزمەتی کوردو کوردایەتییە.

* ناخۆشترین خاتیرەی ژیانت چییە؟

– خەبەری مردنی باوکم، باوکم نەدیوە، عائیلەی خۆم نەدیوە، هەموویان مردوون. ئەمن لە مەراسیمی هیچیان حازر نەبووم.

## محەمەد شاپەسندی
## لە زمانی خۆیەوە*

### سدیق ساڵح

دایکی باپیرم ناوی "شاپەسند"و ژنێکی موحتەرەم بووە. باپیرم ناوی "سەعید"و خەیات بووە، لەناو گەورکانەوە هاتووە بۆ مەهاباد. بابم لە سابلاغ لەدایک بووە؛ برایەکی تریشی هەبوە، بە گەنجی ئەمری خوای بەجێ هێناوە. دایکم، "ئامینە ڕەحیمی چاوڕەشان"و سابلاغییە. بابم، ١٣ی ڕەشەمەی ١٣٤٦ی شەمسی (١٩٦٧) مردووە، دایکم پێشتر. بابم تا ١٣١٦ خەیات بووە، ئەوساڵە کە لافاوێکی وێرانگەر سابلاغی وێران کرووە، ئیشەکەی گۆڕیوە بە کووتاڵفرۆشی.

بەینێکی کەم چوومە حوجرە، لای مەلا خەلیلی موئەزینی مزگەوتی سەیید نیزام هێندێ قورئانم خوێندووە. ڕۆژێ بردمیانە لای بابم، گوتیان کوڕەکەت گەیشتۆتە مریشکە ڕەشە، بێنە. بابم قورئانخوێنێکی باش بوو، ئیمتیحانی دام، هیچم نەزانی، نەیدا.

صەفی پێش ئەووەڵم لە مەدرەسەیەك خوێندووە بەرامبەر بە مزگەوتی سەیید نیزام، ئەوە ساڵی مەلا خەلیل (١٣٠٧). ساڵی ئەووەڵم چوومە مەدرەسەیەکی نزیکی ماڵی عەزیز ئاغای قوڕمیشیان، نزیکی مزگەوتێك بوو. ئەوساڵە قازی محەمەد ڕەئیسی مەعاریف بوو. دوو صنفم لەوێ خوێند. صنفی سێیەم دیسان هاتمەوە نزیك مزگەزنی سەیید نیزام. ڕۆژهەڵاتی مزگەوت ماڵێك هەبوو، پێیان دەگون مەلا ناسر، کرا بە مەدرەسە. لەوێم خوێند. صەفی چوارم لەوێ تەواو کرد. صەفی پێنج و شەش هاتمەوە مەدرەسەی (سەعادەت)، کە لە ماڵی صاڵحی موهاجیری بوو لە گەڕەکی سەیید حەسەن.

مەهاباد، هەر مەدرەسەی سەعادەت و پەهلەویی تێدا بوو. ئیبتیدائی بوون. ناوەندیی لێ نەبوو. ساڵی ١٣١٣-١٣١٤ سەرەتاییم تەواو کرد. بابم پێی خۆش نەبوو بیمە موەزەف، نەیهێشت بچمە (ڕەزائییە) کە ئەوسا دانیشسەرای لێ بوو، لەوێ

* ئەم بیرەوەریانەی شاپەسندی ڕۆژانی دووشەممەو چوارشەممەی ڕێکەوتی ٢١و ٢٣/٥/٢٠٠١، بەندە لە ماڵی خۆیان لەنزیکی مزگەوتی گەورە (پشت چاپخانەی نەورەس)ی کاك شێخ نەورەسی سەیید ئیبراهیمی حەفید لەسەر شریتی کاسێت بۆماوەی ٣,٥ سەعات تۆمارم کردووە. تەنیا وەڵامەکانی وەرگیراون. لە هەر جێیەك دووبارەبوونەوەیەکی تەواو هەبووبێ، لابراوە.

دەبوویە موعەللیم. ڕەفیقە تەلەبەم ڕەحمان حەلەوی، هاشمی شیرازی، سوڵتانی ئۆتەمیشی، ڕەحیمی ئۆتەمیشی ... بوون.

دوایی چوومە لای تاجرێکی تەورێزی (ئازەری)، میرزا زەینەلعابدین حوسێنی، ئاشنامان بوو. دوو ساڵ میرزایی ئەوم کرد، فێری مونشیگەری بووم. ١٣١٦ کە سێڵاو هات، وەزع تێك چوو، مەجبوور بووم دەست بە کاسبی بکەم. لە ١٣١٩ بەدواوە هاتوچۆی تەورێزم دەکرد، کووتاڵم دەناردەوە بۆ بابم؛ بۆ خەڵکیش دەمنارد بە حەقوسەعی، لە تمەنێك چوار شاییم دەستاند، پێیان دەگوت عەباسی. لەوێ لەگەڵ زەبیحی یەکترمان دۆزییەوە. پێشتر یەکترمان دەناسی. ئەو، سکرتێر (ژ. ك) بوو، "نیشتمان"ی لەوێ چاپ دەکرد. نمایندەی کۆمەڵەش بوو لای کونسولگەریی سۆڤێت.

دڵشادی ڕەسووڵی ڕەفیقم بوو؛ ئەسڵیان مەهابادی بوو، بەڵام بەینێکی زۆر لە عیراق مابوونەوە. حەولم دا بەهۆی دڵشادەوە داخلی (ژ. ك)م کا، داخل نەدەکرام، لەبەر ئەوەی زۆر منداڵ بووم. لەوێوە عەلاقەتم دەستی پێ‌کرد. لەگەڵ عەلی ڕیحانیو محەمەدی یاهوو ... عەلاقەم هەبوو. لە ژمارە (٥)ی "نیشتمان"ەوە لە چاپکردیدا بەشدار بووم. ئێمە هەر حرووفچینیمان دەکرد. دەمانبردە چاپخانەی خەلیفەگەریی ئەرامینە، موساعەدەیان دەکردین. ژمارەی وا هەبوو مانگێك زیاتری خایاندووە. هەر ژمارەی دەوری ٧٠٠-٨٠٠ی لێ چاپ دەکرا. ئیدی دەبرایەوە سابلاغ، لەوێو لە ئەغلەبی شارو دێهاتی کوردستان دابەش دەکراو لێی دەبرایە کرماشانو ئەو جێیانە. ئەمن هەر لەئەووەڵەوە لەگەڵ زەبیحی یەك ئامێزیمان هەبوو. زەبیحی زڕدایکی هەبوو. شتی سکرتاریەتی کۆمەڵەی هەر لە ماڵی ئێمە دادەنا. ئەمن لەوێ نامەکانی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدم دەدیت لەسەر کاروباری حیزبی.

ئێمە تا ئاخر ژمارەی "نیشتمان" لە تەورێز ماینەوە. کە لەگەڵ زەبیحی گەڕاینەوە بۆ سابلاغ، چاپخانەیەکی چووکی دەستیمان هێنا، دامانمەزراند. کە زەبیحی گیرا، ئەو چاپخانەیەم ئیستیغلال کرد، مەجەللەیەکم دەرکرد بەناوی "ئاوات". خۆم حرووفچینیم کرد، کاغەز لە سابلاغ نەبوو، چوومە میاندواو هێنام، بەشی ٥٠٠ دانەم هێنایەوەو طەبعم کرد. نیوەم لە سابلاغ دابەش کرد، محەمەدی ئەنوەری میرمەحموودی بۆی فرۆشتم. (٨) دانەم بە محەمەدی یاهوودا بۆ لیژنەی ناوەندی نارد، گوتیان شتێکی خراپت کردووە. دوایە جوابیان نارد دەست ڕابگرم. "ئاوات" هەر پارەی کاغەزەکەی تێ‌چوو.

که چاپخانه تازەکه هاته مەهاباد، نیو بەتاڵ بوو، دوو موهەندیسی چیکۆسلۆفاکی هات، نزیکەی دوو مانگێك خەریکی بوون تا جووریان کرد. نەیاندەهێشت کەس هاتوچۆیان بکا. که تەواو بوون، ئیشیان پێ کردو ڕۆیشتن. چاپخانەکەی بۆکان بچووك بوو، وەك ئەوە بوو که "ئاوات"م پێ چاپ کرد.

ئێمه یەکێکمان دەست کەوت لای خوالێخۆشبوو حوزنی موکریانی ئیشی کردبوو، ناوی سەدیق بەکری بوو؛ پێم وایه خەڵکی لای خۆمان بوو، ئەو مەکینەکەی بەڕیوه دەبرد. منیش تەقریبەن ۱۰ کەسم فێری حرووفچینی کرد. بۆ خۆشم سەروبەندی جەریدەکەم دەبەستو جێبەجێ مەقالەکمانم هەریەکه له جێی خۆی دادەنا. جگه لەوە، ئەوراقی حکوومی و بەیاننامەو هەموو بڵاوکراوەکانی دیکه لەوێ چاپ دەکرا.

ڕۆژنامەی "کوردستان" تیراژی دەگەییه ۲۰۰۰ دانه. سەیید محەمەدی حەمیدی کوردایەتیی زانایانی ئیسلامی له "کودرستان"دا دەرخست. مەلا قادری مودەڕریسی که مودیری چاپخانەکه بوو، دەوری باشی له هۆشیارکردنەوەی خەڵکدا بینی، وەك ئەولادی خۆی ڕەفتاری لەگەڵ کارگەرانی چاپخانەدا دەکرد، شتی بۆ شەرح دەکردن. ئەمن بۆ خۆم فێری زۆر شت بووم له مەلا قادرەوە. دوو ساڵ له پێنجو شەشدا موعەللیمی من بوو.

شەوو ڕۆژ له چاپخانه ئیشمان دەکرد، مووچەو شیری بەیانیانمان هەبوو. به خلووسی نییەت ئیش دەکرا. ئێمه تا چەند ڕۆژێ پێش ئەوەی ئازەربایجان تەسلیم بێ، زانیمان که کار تەواو بوو، دەستمان له ئیش هەڵگرت. بەڵام من هێندێ حرووفم هەڵگرتو بردمه ماڵێ، گوتم موحتاج دەبین. ساڵێکی تەواو دوای شەهیدکردنی قازی مامەوە. جارێ نۆرەمان نەهاتبوو.

ئەمن که له تەورێز بووم، زوو زوو به سەردان دەهاتمەوە. جارێك بابم گوتی ژنێکم بۆ نیشان کردووی، پێم سەیر بوو. خوشکی شەهید "ڕەسووڵی نەغەدەییان" بوو. ئەمن حەزم له یەکی تر دەکرد، پوورزایەکم هەبوو، حەزم لێ دەکرد. گوتم نامەوێ. گوتی چۆن دەبێ، قسەم داوە. ئەو وەختە وابوو، پیاوی گەورە که قسەی دا، هەر ئەوە بوو. گوتم دەبێ ببینم. بردیانم بۆ ماڵەکەیان، چای بۆ دانام. گوتم نامەوێ. بەینێکی تریش خۆم ڕاگرت، ئاخری تووشیان کردم؛ ناوی "فاتمه"و کچی نەسروڵڵاو شوهرەتیان "نەغەدەییان" بوو. ئەوە کچێکم لێ بوو، ناوم نا "حوسنی"، دەمێکه شووی کردووە به "سەلاحەددین عەلی".

دوای ئەوە بە حوکمی ئەوەی لەناو ئازەریان ڕەفیقمان زۆر بوو، لەگەڵ ئافرەتێکی ئازەری ڕێك کەوتمو هێنام، ناوی "طەییبە" بوو، ئافرەتی ماڵو بێسەواد بوو. ئەوسا وەك لە سابلاغ ئازەری زۆر بوو، سابلاغی نەبوو ئازەری نەزانێ. ئەمن بە جوورێك ئازەریم دەزانی کە کەس فەرقی پێ نەدەکرد کوردم. پاش بەینێك خەسووم گوتی با سەری ماڵی بابت دەینەوە. ماڵی بابم نەیدەزانی. هەڵم گرتن، بردمنەوە سابلاغ. خێزانی ئەووملم تووڕە بوون، دەستیان کرد بە هەڕەشە. بەڵام لە ماڵ وەدەر کەوتم، گوتم ناگەڕێمەوە ماڵەوە تا ئەو ژنەم تەڵاق نەدابێ. ڕۆژی دوایی تەڵاقمان دا. ژنە ئازەریەکەش، کە جەمهووریی کوردستان دامەزرا، لەگەڵمان دانەنیشتەوە. ئەوسا ناوبانگی کورد لەناو ئازەری خراپ بوو. هەندێکیش دەترسا. ناعیلاج ئەویشم تەڵاق دا.

منو غەنی هەردوو مەشمووڵی عەسکەری بووین، مەجبوور هاتینە ئەمدیوی عیراق. کۆتایی ڕەشەمەی ١٣٢٦ لە مەهابادەوە ئێوارەیەك دەرچووین، چووینە (قازیاوا) لەپەنا مەهاباد. ڕۆژی دوایی خەڵکمان لەگەڵ خۆمان دێنا، چووینە دێیەکی تر، بۆرە خزمایەتییەکمان لەگەڵ ئاغایەکەی هەبوو، ٢-٣ شەو لەوێ ماینەوە. وڵاغی داینێ چووینە (گەزگەزگ)، دێی شێخ تەهای شێخ عەلادین. بەینێ لەوێ بووین، تا ڕۆژی پێش نەورۆزی ١٣٢٧ (١٩٤٨/٣/٢١) شەو لەگەڵ قاچاخچییان هەڵستاین هاتین بۆ (خەلان). پێنج شەش کیلۆمەتری مابوو بۆ خەلان، برادەرەکان گوتیان ئەوانە ئەمنییەی ئێرانن، نەمتوانی بڕۆم. کە چووین دابەزینە خوارەوە، دێیەکی یەکماڵی هەبوو، من ئەو شەوە لەوێ مامەوە. غەنیو ئەوان ڕۆیشتن. بەیانی هەستام نانو چام خوارد، چوومە نوقتەی عیراق. گوتم دەچم بۆ زیارەت، ئیزن درام کە بەوێدا بگەڕێمەوەو بمبینن. چوومە لای شێخ عەلادینی خەلان.

تەقریبەن ٢٠ ڕۆژێك ماینەوە. شێخ نەیهێشت هەردوکمان پێکەوە بڕۆین. من بە تەنیا ڕۆیشتم. شێخ گوتی "زەبیحی"ت دۆزییەوە، تەلەفۆن بکە، "غەنی"ت بۆ دەنێرین. هاتمە هەولێر. شێخ ڕۆنی پێدا ناردبووم بۆ "عەبدوڕەحمان"ی کوڕی کە ئەوسا دەیخوێند. ئەو شەوە لە ماڵی "گیو موکریانی" مامەوە. ڕۆژی دوایی هاتمە کەرکووك. تەماشام کرد ٤٠-٥٠ ئێرانیی پەناهندە لەوێن، چوومە ناویان. حەمە سەرشکاوو حوسێنی شەریف زادەو هێندێ لادێییو ژنو منداڵیان لەگەڵ بوو، حکوومەتی عیراق لە خانێکی دانابوون. ئەو شەوە لەناویان مامەوە. ڕۆژی دوایی هاتم بۆ سلێمانی. نابەڵەد بووم، لای (مزگەوتی گەورە) تووشی "عوسمان دانش"*

* لەبارەیەوە بڕوانە: ڕۆژنامەی کوردستان ١٣٢٤-١٣٢٥ی هەتاوی (١٩٤٦)، ل٢٠.

بووم، له سابلاغەوه دەمناسی. گوتم زەبیحی له (ناسرییه) رای کردووەو هاتوەتەوه، له (سیتەك)ـه، دەمەوێ بچمه لای. گوتی: ناتەوێ زیارەتی قەبری "محەمەد قودسی"و "مستەفا خۆشناو" بکەی؟ گوتم: با. چووینه "گردی سەیوان)، زیارەتمان کردن.

دوایه لەگەڵ عوسمان دانش چووینه سیتەك. زەبیحیم دۆزیەوه. دانش، شەو لەلامان مایەوه، عەرزوحاڵنووس بوو، بەیانی گەڕایەوه. ئەو وەختە هەر زەبیحی له سیتەك بوو، قزڵجی لەوێ نەبوو، له بەغدا بوو. هەر گەیشتمه سیتەك، تەلەفۆنم بۆ "عەبدولقادر"ی کوڕی شێخ عەلادین کرد، گوتم غەنی بنێره، ئیتر غەنی هات‌و هەرسێکمان یەکمان گرتەوه. کەسی ترمان لەگەڵ نەبوو.

غەنی بلووریان که دەڵێ قزڵجی لەوێ بوو، بۆ ئەوەی بیکاته هاوبەشی مەسەلەی "ڕێگا". ناکرێ داوا له سکرتێری حیزبێکی ناسیۆنالیستی بکەی گۆڤارێکی کۆمۆنیستی چاپ بکات! ئەوسا کۆمۆنیستی له سابلاغ نەبوو، موستەواکه ئەوه نەبوو. "ڕێگا"، ئەو کلیشەو شتەی ڕاست نییه، له سابلاغ ئامادە کراوه. له سیتەك دەرنەکراوه. فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان له تەورێز بۆی چاپ کردوون. هێناویانەتەوه له سابلاغ تەوزیعیان کردووه، تا بڵێن له سابلاغ چاپ کراوه. غەنی تا گەڕانەوەی بۆ سابلاغ پێشتر هیچم لێ بەدی نەکردبوو، کوردێکی پاك بوو. له گەڕانەوەدا تێوه گلا، چووه پاڵ حیزبی توودە.

غەنی له (ئاڵەکۆك)دا دەڵێ: گوایه شێخ لەتیف نامیلکەیەکی هێناوه، ویستوویەتی ئێمه بۆی چاپ کەین دژی پارتی. ئەمن شتی وام بەبیردا نایه. ئەوه قەت نەبوه. شێخ لەتیف زۆر سادە بوو، بەڵام ئەوەندە درشت نەبوو داوای شتی وا له ئێمه بکات، دەیزانی ئێمه ئێرانین‌و موداخەلەی شتی وا ناکەین. دەڵێ زەبیحی له نامیلکەکه تووڕە بوو، "ڕێگا"ی بۆ چاپ نەکردم. شتی وا نەبوه. مەبەستی ئەوەیه که ئێمه هاتووینه عیراق بیروڕامان چەپ بووه، لەکاتێکدا ئەو تێفکرین‌و لیاقەتەمان نەبوو چەپ بین. دەڵێ سازمانی جەوانان زووتر له (ژ. ك) دامەزرا. ئەوه ڕاست نییه. دەیەوێ بەوه خۆی بنوێنێ‌و گەورە بکا. هەرچی گۆڤاری "ڕێگا"یه، هی ڕەحیمی سوڵتانیانه که (کۆمەڵەی کۆمۆنیستی کوردستان)ی داناوه. غەنی که گەڕایەوه تێکەڵی ئەوان بوو. هەروەها دەڵێ حەسەن قزڵجی موعاوینی بووه. ئەسڵەن قزڵجی لەوێ نەبوو، له بەغدا بوو. هەر من‌و زەبیحی‌و غەنی لەوێ بووین. کوڕێکی تری

ئێرانیی "حەمەکەریم" ناوی برای "تەڵا خان"یش لەوێ بوو، بەڵام ئەو لەگەڵ ئێمە نەبوو، موداخەلەی شتی وای نەدەکرد.

کەسی دیکە لە سیتەك نەمابوو. شێخ لەتیفی حەفید لەوێ بوو. ئەمن لە نیهایەتی مانگی نەورۆز لە سیتەك بووم. ۲-۳ ڕۆژ ماینەوە. زەبیحی گوتی: دەڵێی چی "نیشتمان" زیندوو بکەینەوە؟ گوتم: ئامادەم. گوتی: دەتوانی مەطبەعەیەك دروست بکەی؟ گوتم: بەڵێ دەتوانم. شەو یەك بە یەك ئەندازەم گرتبوو، دەزگاکە دەستیو نیوە میکانیکی بوو. شێخ لەتیف سەرکارێکی مەلا عەلی ناوی باوکی زاهیر عەلیی هونەرمەندی ئێستاو مەمکەخۆرەی ئەوسای هەبوو، دەگەڵی خستم. چووینە بازاڕی ئاسنگەرەکان، لای "شێخ حوسێنی ئاسنگەر"*، کە شیوعیو پیاوێکی باش بوو. شاگردێکی "ڕەحیم" ناوی هەبوو. مانگێکی پێوە بووین تا دروست کرا. حرووفەکان، شێخ لەتیفو زەبیحی جێبەجێیان کرد، لە بەغداوە بۆمان هات. پارتی، زۆر شتی وەك مەرەکەبو نینیو شتی وامان لێ وەرگرتن. حرووفی زیادیان نەبوو. تەقریبەن دوو سەفحە دوو سەفحە حرووفچینیمان دەکردو چاپمان دەکرد. چاپەکەی زۆر مەرغووب نەبوو. ژمارە (۱۰) ۲٤ یا ۲٦ لاپەڕە بوو، ٦۰۰ یا ٦٥۰ دانەمان لێ چاپ کرد. قیسمێکمان بە قاچاغی لێ ناردەوە. دوایە کە غەنی گوتی دەڕۆمەوە، ئەووەلی (ئابان) مانگی هەشت بوو، قیسمێکمان لە "نیشتمان" بەودا ناردەوە.

---

* شێخ حسێن کوڕی شێخ سەعیدو ساڵی ۱۹۰۰ لە دێی (حاجی مامەند)ی قەزای شارباژێڕی ناوچەی سلێمانی لەدایك بووە. بە مناڵی هەر لە حاجی مامەند لەگەڵ شێخ حەسەنی مامیدا دەستی داوەتە ئاسنگەری. کە مامی وازی لەو ئیشە هێناوەو هاتوەتە شارو بووە بە عەللاف، ئەویش بووەتە هاوکاری مامیو هاتوچۆی دیوی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی کردووە بۆ هێنانی دەغڵودان. پاشتر دەستی لێ هەڵگرتووەو کەوتوەتەوە ئاسنگەری کردن. هاوزەمان لە قوتابخانەی (زانستی)دا چووەتە بەر خوێندن. دوایی ئەو پیشەیەی لە دروستکردنی داسو تەورو تەوراسو شتی واوە گۆڕیوە بە دەرگاو پەنجەرەی ئاسن دروستکردنو تاسەر درێژەی پێداوە.

شێخ حسێن وەك تێکەڵی بنەماڵەی شێخان بووەو پەیوەندییەکی خۆشی بە شێخ لەتیفی حەفیدەوە هەبوە، بە بیرکردنەوە شیوعی بووەو چالاکیی لەناو حیزبی شیوعیی عیراقیدا نواندووەو زۆر خزمەتی وەك هێنانو بردنی بەیاننامەو بڵاوکراوەو هی تری هەبوەو لەوپێناوەدا دەردیسەرییەکی زۆری دیوە.

شایانی باسە، شێخ حسێن کە ڕۆژی ۱۹۹۲/۱۲/٤ کۆچی دوایی کردووە، لە "عائیشە ڕەسووڵ محەمەد"ی هاوسەری، کە ئەویش هەر حاجی مامەندی بووە، ئەیووبو لەتیفو جەزاو شەمسەو ئەمنەو ڕووناکی هەبوە.

(سوپاس بۆ کاك جەزای کوڕی کە ئەم زانیاریانەی دامێ. سوپاس بۆ مامۆستا شێخ باقر کەریمیش کە ئەو بنەماڵەیەی بۆ دیمەوە)

له ژماره (١٠)ی "نیشتمان"دا ئەمن یەك نووسینم هەیە بەناوی "ئازاد". "غەنی"ش یەك نووسینی هەیە. باقیەکەی، هەمووە زەبیحی جێبەجێی کرد. شیعری تێدا بوو، هی وك هەژار. کلیشەی "نیشتمان"م بە لاستیك دروست کرد، جیاواز بوو. ١٩٤٨، مانگی پێنج چاپخانە ساز کرا؛ مانگی ١ی ١٣٢٧، من بەتەنیا گەیشتمە سیتەك؛ غەنی مانگی ٢ی ١٣٢٧ گەیشتە ئەویٚ. "نیشتمان"، تەمووزی ١٩٤٨ لە (سیتەك) دەرکرا؛ بەشێکی لێرە (کوردستانی عیراق) بلاّو کرایەوە، زەبیحی لێی دایە ئیبراهیم ئەحمەد؛ بەشێکی بە غەنیدا نێردرایەوە بۆ مەهاباد؛ بەشێکی دیکەشی مابوو، دەترساین بگیریٚ، دوای غەنی ناردمانەوە بۆ ئەودیو.

دوای ڕۆینەوەی غەنی، دوو مانگی پیٚنەچوو خەبەر درا کە حکوومەت پێی زانیوە شێخ لەتیفی حەفید بەعزیٚ ئێرانیی ڕاگرتووەو شت طەبع دەکەن. مەلا عەلی خەبەری بۆ هێنایین. زەبیحی گوتی: تۆ لەپێشدا بڕۆ بۆ بەغدا. چوومە کەرکووك لای سەیید ئەحمەدی سەیید تەهای شەمزینان، کە زابت بوو و لەئێرانەوە هاتبوە ئەویٚ. زەبیحی لەگەڵ ئەو هاتبوە عیراق. پێم گوت موحتاجی هەویەیەکم، هیچم پیٚ نییە، نەوەك لە ڕێگا بمگرن. هەویەیەکی دامیٚ بە ناوی "عەدۆ سمۆ"، واتە عەبدوڵلا ئیسماعیل. لەگەڵ خۆم بردمو چووم بۆ بەغدا. ناسیاوی ئێرانیمان هەبوو، دۆزیمنەوە. ڕۆژی دوایی بردیانم بۆ مەطبەعەیەك. "حەمەی عەزیز" سابلاّغی بوو، دەمیٚ بوو هاتبوو" بردمی لە چاپخانەی (الشعب) لە (باب الآغا) دایانم. دوو جەریدەی "الأمة"و "الشعب"ی لیٚ بوو. لە یەکیٚ لەو جەریدانە ئیشم دەکرد. نووسینەکەیان دەدامیٚ، دەمخوێندەوەو مانام نەدەزانیٚ، دەیانزانی کوردی ئەودیوم. چاپخانەکە هی جوولەکە بوو. بەیانیان بەرچاییو ئێواران نانو شەویش نانم بۆ دەهات. هەر لەویٚ دەمامەوە. پاکەتێکیشیان دەدامیٚ. ئیتر پارە نەبوو. سەرەوەی چاپخانە چۆڵ بوو، چادرێکی لیٚ بوو، شەوانە دەچوومە ناوی. دوایی گوتم ئەوە دەری نایێنیٚ. پارەی ئەو خواردنانەم بدەنیٚ. بۆیان کردم بە ڕوبعە دیناریٚ. وا مامەوە. پاشان وردە وردە زمانم کرایەوە. دەچوومە چاپخانەکانی تر بە ئۆڤەر تایم ئیشم دەکرد.

کابرایەك پێم فێر بوو، شاعیرێکی شیوعیو ئەسڵی کورد بوو، نەمدەزانی ئەوە ئیشی حیزبی شیوعییە. لەویٚ ئیشیان پیٚ دەکردمو پارەیان دەدامیٚ بە سیڕڕی. دەیانگوت بە کەس مەڵیٚ. ٥–٦ دینارم کەوتبوە لایان، ئەو کابرایە تەفرەی دەدام؛ بۆ من زۆر بوو، سەروەتێك بوو و ئاخریەکەی لێم ئەستاند. بەو موناسەبەتەوە، مەطعەم

عەبدوڵڵا هەبوو، وزەراو پیاوە گەورەکانی عیراق دەچوونە ئەوێ، نیوەڕۆ لەوێ نانمان خوارد، یەکی دینارێك و دووسەد فلس بوو، زۆر بوو. ئەوسا پانتۆڵەکەم پینەی گەورەی پێوە بوو، گوێم نەدەدایە.

برادەرێکی کوردم هەبوو، ناوی عەبدولکەریم فەتحوڵڵاو دەوڵەمەندێکی شارەزووری بوو، لە شەریکەی نەوت ئیشی دەکرد؛ جارجارە دەرسی عەرەبی و جوبران خەلیل جوبرانی پێ دەکوتم. کە حیزبی شیوعی فەهدو سەرکردەکانی ئیعدام کران، چاپخانەو ڕۆژنامەکانی ئیشم لێ دەکردن، داخران. ناعیلاج بەینێك چووم میوەفرۆشیم دەکرد. لەپشت (حەیدەرخانە) هۆدەی ئاشنایەکم گرت، مانگی بە دوو دینار. عەرەبانەیەکم بە ٣ دینار کڕیبوو. دەمردم هەتا بەیانیان دەچوومە عەلوە لەولای ساحەی (السبع) لە بەغدا، شتم دەکڕی و دەمهێناوە. وجوودم زۆر زەعیف بوو. وا ماوەوە. تەماشام کرد ئەوە بۆ من نابێ، ناژیم بە جوورە. دراوسێیەکم هەبوو، کۆنە لاجانی بوو؛ "جەلیل شەریف" ناوو ضابط بوو. کوتی دەڵێی چی بتنێرم بۆ (دیوانییە). کوتم هەر جێگایەکی پێت خۆشە، دەچم؛ ناردمی.

بەغدا هەژارو قزڵجیو... زۆری دیکەی لێ بوو، وەختی بێکاری دەمدیتن. لە (دیوانییە) گیرسامەوە. بەینێك فەشافیش (سیو جگەر)م دەفرۆشت. کابرای موتەعەهید ناوی کە زانیی ئیشکەرم و شتم لەدەست دێ، کردمی بە کاتبی حانووت، مانگی بە حەوت دینارو نیو. شەوو ڕۆژ لەوێ بووم، لەوێش دەخەوتم. پاش بەینێك چاوم کرایەوە، ڕاتبەکەم بوو بە پانزە دینار. هی تریشم دەست دەکەوت. مەسەلەن جگەرەی عەسکەریم بە هەرزان دەکڕیو لە حانووت دەمفرۆشتەوە. وەزعم باش بوو. دوایی ژنخوشکێکی ئەو عەبدولکەریمەم هێنا، ناوی "قومرییە حاجی ساڵح کەریم" و موالیدی ١٩٣٨ بوو؛ ماڵیان لە دیوانییە بوو، باوکی پیرو دوو کوڕی هەبوو: یەکیان ناوی عەبدوڵڵاو خەیاتو خەلفە، ئەوی تر محەمەدو لەگەڵ من کاتب بوو لە حانووت. ٢٩ی مانگی موحەڕڕەم بوو کە ساڵی ١٩٥٥ ژنم هێنا.

ساڵی ١٩٥٧ ئەمن لە ماڵێکدا بووم، خۆم ناونووس کرد بەناوی "عەبدوڵڵا محەمەد صالح". ئیتر ساڵی ١٩٦٠ تەسکەرەم بۆ دەرچوو. پاشان چوومە کەرکووك و لەگەڵ جەریدەی "ئازادی" هاتمە بەغدا، کە لە چاپخانەی (الوفاو) ی ئەودیوی کۆلانێکی (شارع الرشید) بوو. محەمەدی مەلا کەریم و نافع یوونس و محەمەد کەریم فەتحوڵڵا ئیشیان تێدا دەکرد. وەزعم باش بوو لەگەڵیان، تا لە ١٩٥٩دا داخرا. کە "خەبات" ئیجازەی درایەو کەوتە گەڕ، مەسئوولییەتی چاپم تێدا وەرگرت.

چاپخانەیەکی گەورەی نیو بەتاڵو لاینۆ تایپێکمان هەبوو، لە ماڵێکی گەورەی (بەتاوین) بوو، هەر بەشی "خەبات"ی دەکرد. ژێرخان بوو، سەرەوەی مەقەڕ بوو. ئەوی مەکینەکەی دەگێڕا ناوی "سەفەر"و فەیلی بوو. کوڕێکی عەرەب لاینۆ تایپەکی ئیش پێدەکرد. ڕۆژێ جەریدەکەی تەرتیب دەکردو بەجێی دەهێشت. دوای نوێژیان خۆم دەچووم تا ١٢ی شەو دەمدا بە مەکینەکە. خۆشم لە پەنایەك پاڵ دەکەوتم تا ڕۆژ دەبۆوە. بەیانیان وەختی مەلا بانگدان دەگەڕامەوە بۆ ماڵێ. ماڵم لە (تەل محەمەد) بوو. بەو جوورە ڕاماندەبوارد. (١٠) منداڵم هەبوو.

حیلمی تەعلیقی سیاسیی دەنووسیو لەگەڵ زەبیحی بەسەر چاپخانەکەدا ڕادەگەیشت. مامۆستا برایم سەرمەقالەکانی دەنووسی. مام جەلال ستوونێکی باریکی هەبوو بە ناوی (العلم نبراس الحیاة)، ضددی شیوعی دەینووسی بەناوی "پیرۆت". تا دوا ژمارە لەوێ بووم. کە جەریدەی "خەبات"یان داخست، چاپخانەکەمان پێچایەوەو گوێستەوە بۆ (کولاج) نزیکی (باب الشیخ). ئەوێیان بۆ چۆڵ کردین. لەوێ منو زەبیحی دامانمەزراند. گوتمان ئیشی تری تیجاریی پێ دەکەین. دراوەر (کلیشە)یەکی زۆرمان دروست کرد، بۆ ئەوەی (دیوانی بێکەس) چاپ بکەین. لەوێش زۆری پێنەچوو دەریانپەڕاندین. خەریك بوو بمانگرن. بەجێمان هێشتو حکوومەت مەطبەعەکەی داگیر کرد. ئەوسا شۆڕش سەرەتای بوو. بەینێك لە چاپخانەی (النجوم) مامەوە، بە سەعات ئیشم دەکرد. چاپخانە نییە لە بەغدا من ئیشم تێدا نەکردبێ. هر چاپخانەیەك چووبم، چونکە سەرڕاست بووم لەگەڵیان، ئیش هەبوە بۆ من. هەر لە "اتحاد الشعب"و "الأنسانیة"وە بگرە تا "الزمان"و هی تر، ئەمن ئیشم تێدا کردووە.

ڕۆژێك "عەبدولموحسین فەیلی" هات، گوتی: بۆ نایەی، داوایان کردووی بچیەوە کوردستان. پێش ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی، گوتیان دەبێ چاپخانەیەك ساز کەیو حرووف پەیدا کەی. هێنام چاپخانەیەکی دەستیم ساز کردو حرووفم پەیدا کرد. چاپخانەکە باگردێنێك بوو، بەسەر حرووفەکانمدا دێنا، تەبعی دەکرد. ئەمما تەرتیباتێکم بۆ کردبوو، هەموو وەك یەك دەردەچوو. بەناوی مەطبەعەکانی ئێرە (سلێمانی) حرووفو هەرچیم لازم بایە، دەیاندامێ، ئیعتیبارم هەبوو. ئەو چاپخانەیە پارچە پارچە هێنرایەوە بۆ سلێمانی. "نووری ئەحمەد تەها" نیشانەی دامێ چۆن بچمە سلێمانی، چونکە باش بەڵەدی نەبووم. گوتی کە چووی، لە نەقلیات جەریدەیەك بەدەستەوە بگرە، یەکێك دێت دەتبا. چوومو وام کرد. کوڕێك هات

بردمی، ناوی "ئەحۆل" بوو، پێم وایە ئێستا لەدەرەوەیە. چەند شەوێك لەماڵیان بووم، کە نزیکی سەرەوەی خانەقای مەولانا خالید بوو. کوتیان مەطبەعەکە براوەتە ماڵی "ئەحە بچکۆلی خەیات" لە گەڕەکی (سەرگۆل) پشت خانەقا.

لە ژوورێك بوو، کەس فەرقی پێنەدەکرد. تاقەیەکیان هەبوو، قاعیدەکەی موتەحەریك بوو. جێگا دەبووەوەو دەچوومە ژوورێ. پەنجەرەو دەرگای لەسەر نەبوو. کاك نووری ئەحمەد تەها مەسئوولی سلێمانی بوو، هاتوچۆی ماڵی ئەحە بچکۆلی دەکرد. شەویش لەو ماڵە دەمامەوە. نووری لەوباوەڕەدا نەبوو ئەمن بەو باگردێنە جەریدە دەرکەم. هەمیشە پێدەکەنی. دە ئاخریدا ئەووەڵ ژمارەی "خەبات"م بۆ دەرکرد. هەزار نوسخەیەك بوو بە حەجمی نیو بەتاڵ. پێم وایە بە کوردی بوو. لەو ماڵە یەك ژمارەمان پێ دەرکرد. جاری وابوو مانگێك دەوەستام بۆ مەقالی ئیفتیتاحییەیەك ماموٚستا برایم بینووسێ. لەسەر ئەوە مەحتەلیان دەکردین، دەنا دەمتوانی مانگی ٣-٤ ژمارە دەرکەم. کە ژمارەکە دەرهات، زەبیحی کاغەزێکی بۆ نووسیم، ئەوسا ئەو مەسئوولی کەرکووك بوو. نووسیبووی من دەڕۆم بۆ (کۆیە). بۆ کۆنگرەی مەلا مستەفا، پێم خۆشە بێی. حەفتەیەك ماینەوە، میوانی مەلا مستەفا بارزانی بووین. شەوانە دەچووینە ماڵی سەعیدێ حەمەقالە کە ناوی لە (ژ. ك)دا هەیە.

پاشان ئەمرم بۆ هات، کوتیان دەبێ لە سلێمانی دەرچی. چاپخانەکە برایە دەرێ. ئەوە ئاخری جەژنی قوربانو بەهاری ١٩٦٢ بوو. حاجی دەهاتنەوە. ڕۆژێك حەمی مەلا عیززەتی برای مەحموودە مەلا عیززەت کەشیدەیەکی بۆ هێنام، کوتی خۆت بکە بە حاجیو بڵێ من گەڕاومەوە لە حەج، قسەت لەگەڵ ناکەن. شەوێك لەگەڵ ٣٠ کەسێکی تر بە (گردی سەیوان)دا دەرچووین. لەوێ نوقتە هەبوو، بەناویاندا دەرچووین، پارەمان دانێ. شەو لە (بناویلە) مامەوە لە چاپخانەیەك. بەیانی بە (سیتەك)دا ڕۆیشتم بۆ (مالوومە). شەو گەیشتم. ماموٚستا برایمم دی. دووسێ شەو لەوێ بووم. ئێرانیم دیتن، لەوانە قادر شەریفو جەماعەتەکەی کە تەقریبەن ٢٥ کەس دەبوون. "حەسەنی ڕستگار"یان لەگەڵ بوو.

دوایە کوتیان دەبێ بچی بۆ (ئەشکەوتی گردە ڕەش)، لەوێ چاپخانە سازکەی. (...؟) هات بە سواری ئەسپ، هەمەکارە بوو، هەموو وەسائیلی حیزب ئەو سازی دەکرد. گوتی با بڕۆین. بە سواری پێشم کەوت. جا وەرە من بە حەیاتم بەپێیان نەڕویشتووم، بە پێی ئەو ولاغە دەرچووم. ئەویش هێندە بێویژدان بوو نەیدەکوت

وەرە سوارت کەم. تا گەیشتمە (ژاژڵە) هەموو قاچم ئاوسا. لەوێ چووینە هۆدەیەك پێشمەرگەی لێ بوو. خۆم بە عەرزیدا داو کوتم برۆ، نایەم. ئیتر ئەو شەوە لەوێ بووم. بۆ بەیانی بە (هەنجیرە سوورە)دا چوومە (عیساوێ).

لە (عیساوێ) بوو، یا (خەزێنە)، کاك "حیلمی"م دۆزییەوە. یەکدوو شەو لە خەزێنە مامەوە. شتەکانمان ناردە سەرەوە. هەووەڵ جار کە سەر کەوتم بۆ ناو ئەشکەوتی (گردە ڕەش)، کوتم تا شۆڕش تەواو نەبێ نایەمە خوارێ. وام لێ هاتبوو گۆشتیان لێ نابایە دەمزانی، یەکسەر دەچوومە خوارێ. ٥-٦ هۆدەمان لێ دروست کرد. جگە لەوە، ١٥٠ میتری لێ مابوەوە. ئەووەڵەن مەکتەبی سیاسی لەوێ بوو. دوایە دابەزینە خوارێ بۆ (ئاوکورتێ)و ئەوناوە.

ئەوێ گەورە بوو، لاسلکیو ڕادیۆو چاپخانەی لێ بوو. بەینێکی زۆر لەوێ مامەوە. میوانی شیوعیمان زۆر بوو: وەك سامی عەبدوڕەحمان، ساڵح حەیدەری. خەڵکی تریش اەوێ بوون، وەك جەلال ئەترووشیو عومەر دزەییو شێخ حسێن قەرەداغیو سدیق ئەترووشیو زوهێر عەبدولمەلیکی ڕۆژنامەنووسی فەیلیو حەمید باخەوانی کۆییو لەتیف بەرزنجیی خەڵکی چەمچەماڵو عوسمان عوزێریو عەبدولخالق مەعرووفو حەبیب محەمەد کەریم. مام ڕەسووڵ سێوکانی کارگێڕی ئەشکەوتەکە بوو. مستەفا ڕابەر دوایی لە هەولێرەوە هاتبوو، دایاننابوو یارمەتیم بدات. کوڕێکی تری فەیلیشم لەلا بوو. لەگەڵ ئەو برادەرانە هەموو جومعەیەك دادەبەزین بۆ دێی (باساوێ) بەودیوی (گردە ڕەش)دا، دەچووین بۆ مریشك خواردن.

ئەو ئێرانیانەی کە لەوێ بوون، هەموو میوانی حیزب بوون، حیزب مەسرەفی دەکێشانو زۆر یارمەتیی دەدان. ڕۆژێك مەکتەبی سیاسی ناردی بەشوێنمدا، کوتیان ئەو ٣ یا ٤ کەسە هاتوون، یەکیان عەبدوڕەحمانی ناو بوو، لە مەطبەعەی (پیرەمێرد) کتێبم بۆ چاپ کردبوو. ئەوانە هاتبوون بەرگی یارمەتییان بۆ چاپ کەم: ١٠، ٥٠، ١٠٠ تمەن. ئەمن ١٠٠ هەزار تمەنم بۆ چاپ کردن لە شکڵی پارەی ئەسکەناس، وەك وەسڵ لێم نووسیبوو.

لەوێ جگە لە "خەبات"، بەیاننامەشمان چاپ دەکرد. جەریدە هەزار دانە کەمترمان چاپ نەدەکرد. ئەمن قاوەی خۆم هەبوو. ئەو برادەرانە دەهاتن، یەك یەك، دوو دوو قاوەمان ساز دەکردەوە. دوو ڕۆژ ئیشم کردبایە، دەربەست نەبووم. ماڵو منداڵم لە سلێمانی بوو؛ لە خانووی حاجی فەتاحی حەڵواچی"دا بووین، نزیکی حەمامەکە. گەڕەکەکە هەموو خزمەتیان دەکردین.

که "خەبات" دەست پێ کرا، منو مستەفا ڕابەرو کوڕێکی دیکەی فەیلی بووین لە چاپخانە. هەموو جارێك کە "خەبات"م چاپ دەکردو تەسلیمم دەکرد، خۆم ئیجازە بووم. دەڕۆیشتم، نزیکەی ٢٠ شەو مانگێك نەدەهاتمەوە، دەچوومە سلێمانی. جارێك خەریك بوو خۆم پێك دێنا کە بڕۆم، ئێوارە بوو. ئێسترێکمان هەبوو، ناوی "عەمماش"ی قائیدێکی بەعسیان لێ نابوو؛ هێنایانو بارە جەریدەکەمان لێ نا. هێندە نەڕۆیشتبوو لەو بەرزاییەوە خلۆر بۆوە. بەشوێن جەریدەدا گەڕاین، نیوەیمان بۆ کۆنەکرایەوە.

بەشی مەکتەبی سیاسی کە دامدەنا، عەناوینەکە کە عادەتی مەرەکەبی ڕەشم دادەنا، بەعزە عینوانێکم دەسڕیەوە، مەرەکەبی سوورم لێ دەدا. کە طەبعم دەکرد عینوانەکان بە سوور دەردەچوون. ئەوانەی کە دەیاندی، پێیان وابوو ئیمکانیەتێکی زۆرمان هەیە. ئەوانە ئەغلەب بۆ ئەوروپا دەنێردران. هەتا ئەوروپاییش چەند جارێك هاتن، ڕەسمی مەطبەعەکەیان دەگرت.

ئەمن تا هاتنە سەرمان لەوێ بووم. ٤-٥ عەدەدم دەرکردووە. تیراژەکەی هەزار دانە و هەشت لاپەڕە بوو. موشکیلەی گەورەم بێمەوادی بوو. مامۆستا برایم ئەحمەد بە مانگێك مەقالی ئیفتیتاحییەی دەدامێ.

دوایە مەکتەبی سیاسی لەوێ نەما، چووە (گولان)، شاخێکە لەپشتی (ماوەت). بەینێك لەوێ بوون. ئەمن لایەنگری باڵی مەکتەبی سیاسیو بەشداری کۆنگرەی ماوەت بووم. مامۆستا عەباسێکی کەرکووکی، کە لە کەرکووك چوومەتە ماڵی، ئەو لەجێی مەکتەبی سیاسی دانرابوو. ئەوان چووبوونە ئەودیو، نەیانویست شەڕ بکەن. مومکینە نەسیحەت کرابن کە شەڕ نەکەن. شوێك لە مەکتەبی سیاسی بووم، ئیشم نەمابوو. لە ١٢ی شەودا کوتیان دەبێ بچی مەطبەعەکە بێنی. کاك عەباس کوتی بەڕێی دەکەین بۆ ئەودیو. چووین ٣-٤ گوێدرێژیان بۆ پەیدا کردین. بەو نیوەشەوە مەطبەعەکەم خڕ کردەوە، یەکسەر درایە مەکتەبی سیاسیو ئەویش ڕەوانەی کرد بۆ ئەودیو. ئێمە کە پەڕینەوە ٥٠٠ کەس دەبووین.

ڕۆژی دوایی کە چوومە سەر ئاوەکە بپەڕمەوە، مام جەلال لەگەڵ ڕەئیس حەمەدەمین لەوێ بوو، خستمیە ناو بەلەمێکی پلاستیکیو پەڕاندمیەوە. چووینە ئەوبەر، دێیەکی ٣-٤ ماڵیی لێ بوو. پێنج شەش کەس بەشوێنماندا هات، تەقوتۆق بوو، ئەمما هیچ نەبوو. مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی لەگەڵمان بوو، کە سەر کەوتین،بە

حوزووری خۆم یەکسەر چوو خۆی تەسلیمی سوڵوطاتی ئێرانی کرد؛ گوتی: هاتوچۆم پێ ناکرێ بەکلاو بەولادا. لە (بەردان) بووین تا شەو. ۳-٤ سەعاتی شەو ڕۆیشتبوو، گوتیان هەستن. مام جەلال و قالەسوور(قاچی سەقەت بوو)مان لەگەڵ بوو. لێمان دا بە (گەناوێ)دا بۆ (بێتووش)، دامەزراین. ئێرانیی لێ بوو. ئەمن موتەرجیم بووم. بۆ ئەغڵەبی شتەکان کاک حیلمی موراجەعەی دەکردو من تەرجەمەم دەکرد. ضابطێکی گەورەیان هەبوو لە من ظەنین بوو، دەیکوت تۆ ئێرانیت! گوتم بابە من نەجەفیم، وەك تۆ قسە دەکەم. بیست شەو لە بێتووش ماینەوە.

ڕۆژێك كاك برایم بانگی کرد، مام جەلال و چەند کەسی دیکەی خەڵکی سلێمانیش لەوێ بوون، کوتی دەبێ بڕۆیەوە بچیە لای زەبیحی، بەتەنیا لە بەغدایە، ئیشی لەگەڵ بکەی. ئەو شەوە چووینە (بارێ). ڕۆژی دوایی لە بارێوە گەڕاینەوە بۆ سلێمانی. تەماشا دەکەم "یەدوڵڵا فەیلی" کە یەکێك بوو لە لیژنەی ناوەندیی پارتی، چووبوە ماڵێ، هەڕەشەی کردبوو کە دەبێ "حاجی" بێت ئیشمان لەگەڵ بکا، "خەبات" دەربێنێ. هەر ئەو شەوە لە ماڵ بووم. ڕۆژی دوایی یەکسەر لێم دا بۆ بەغدا. لەگەڵ زەبیحی یەکترمان گرتەوە. دوایی خەڵکم نارد، ماڵ و منداڵەکەیان بۆ هێنامەوە.

ئەوسا نووری شاوەیس و عەلی عەبدوڵڵا لە بەغدا بوون، لەوێ لیژنەیەکیان لەگەڵ زەبیحی پێك هێنا، ئیشمان دەکرد. دوو گۆڤارمان دەردەکرد، بە کوردی و عەرەبی و سیڕی بوون. من ڕۆنیۆکەم لەلا بوو، هێشتا مەطبەعەمان دروست نەکردبوو. عەلی کەمال بەگ دائیرەیەکی هەبوو بۆ ئەرازیی خۆی. عوسمان عزێری لەلای بوو. ئەمن ستێنسلم دەبردە لای، بەدزییەوە لە تابیعەی دەدا، ئەمن لە ماڵێ ڕامدەکێشان. ناویان "باهۆز"و "بۆ پێشەوە" بوو.

ئەوسا زەبیحی تەقریبەن سکرتێر بوو، ئەسبابی سکرتاریەتی، هەمووی لە ماڵی من بوو. ماڵمان لە (زەعفەرانییە) بوو. لەوێ نەبزووتم تا خانوویەکم کڕی. لە بەغدا نزیکەی شەش ماڵم کردووە، لە هەموویاندا مەطبەعەم پێ بوو، تا هاتمەوە بۆ سلێمانی.

عوسمان عوزێری موزیعی ڕادیۆ بوو لە (گردە ڕەش). ئیزاعەکە لە خوارێ بوو، لەناو ئەشکەوتەکە، دەنگی باش نەدەهات. دوایە بردمانە سەر شاخەکە. ماڵی عوسمان لە (هەڵگورد) بوو. نیوەڕۆیەك هەموومانی دەعوەت کرد، مەجلیسێکی خۆش بوو. جەلال ئەترووشی لە ڕادیۆ بوو. حەبیب محەمەد کەریم لە ڕادیۆ قسەی دەکرد. جەماعەتی لاسلکی دوو کەس بوون، تەنیا شێخ محەمەد ناوێکم لەبیرە.

باهۆز، پێم وایه ۲-۳ ژمارەمان لێ دەر کردووه. تیراژی ٥٠٠ زیاتر نەبوو. له بەغدا تەنزیمات هەبوو. زۆر جار بەیاناتم له ماڵێ چاپ کردووه، خێزانم هەڵی گرتووەو بەیەکەوه چووینەته ماڵی عەلی مام ڕەزا، قەڵادزەییەیه؛ ماڵی له ئەووەلی (مەشتەل) بوو. جاری وابوو کاك عومەر دەبابه دەهات، به سەیارەکەی خۆی که جێگای شك نەبوو، دەیبرد، یا کاغەزم پێویست بوو، بۆی دێنام. باهۆز به حەجمی ڕۆنیۆ بوو، له فولسکاب بچووکتر بوو.

له ١٩٦٦دا زەبیحی به (بەسره)دا ڕۆیشت، چووه (ئابادان) که جەماعەتی مەکتەبی سیاسی بهێنێتەوه. لەلایەن حکوومەتەوه ئیجازه درابوو. پێوەندی گرتن به مەکتەبی سیاسییەوه هەر لەڕێگای زەبیحییەوه بوو. من شفرەی مەکتەبی سیاسیم لەلابوو. که نامەی هەبایه شفرەکەی دەبردو جێبەجێی دەکردو دەیدامەوه. زەبیحی هیچی لێ نەدەشاردمەوه، بەڵام شەرت نەبوو شتی زۆر ناسك به من بڵێ.

مام جەلال و ئەوان که دێنەوه سلێمانی، له ماڵی ئەحه بچکۆلی خەیات خۆیان دەشارنەوه. ڕۆژێك لەگەڵ زەبیحی دانیشتبووین له ماڵیان که له ئەووەلی (تەل محەمەد) بو، نزیك گەڕاجی ئەمانەی ڕەقەم ۳؛ ژێرخانێك بوو، قاتی سەرەوەی ساحێب خانوەکەی لێ بوو، ئیجارەکەی مانگی ۸ دینار بوو. مام جەلال و حیلمی و عەلی عەسکەری وەژوور کەوتن، چووم نانم بۆ هێنان.

ورده ورده کاروبار ساز کرایەوه، دەست به ئیش کرایەوەو جەریدەی "نور" بڵاو کرایەوه. ئیشم له "ڕووناکی"دا کردووه، که کوردیەکەی "نور" بوو، هەزار دانەی لێ چاپ دەکرا. "نور" له چاپخانەی تایمس چاپ دەکرا. یەك مەقالەم له "ڕووناکی"دا هەیه*.

ساڵی ١٩٦٩ مام جەلال "تیمسار بەختیار"ی دیبوو، پێشتر شەخصی دووەمی ئێران بوو، داوای لێ کردبوو بزانێ ئەگەر بێته عیراق کوردان موساعەدەی دەکەن یا نا، ئەوسا ضددی شا بوو. عیراقیش وەعدیان دابووێ که ڕێی بدەن و تەسهیلاتی بۆ بکەن لێره بمێنێتەوه. زەبیحی ڕۆژێك پێی کوتم دەتوانی لەگەڵ "بەختیار" ئیش بکەی؟ گوتم ئاخر ئەوه ئەو هەموو کوردەی کوشتووه! گوتی با هەوه، ئەمما سیاسەت ئەوه قەبووڵ ناکا. ئەوسا دوژمنمان بوو، ئێستا دوژمنی دوژمنمانه. گوتم ئەگەر تۆو حیزب پێتان باشه، با وابێ. ڕۆژێك موعەرەفییان کردم. پێم وایه زەبیحی و عومەر

---

* هەردوو ژمارەکەیم پشکنی، هیچم به ناوی ئەوەوه تێدا نەدی. جا مەگەر ناوەکەی خواستراو بووبێ.

دەبابەو یەکی کۆییش لەوێ بوون. بەختیار داوای لێ کردم جەماعەتێکی موسەللەحی بۆ سازکەم. بەختیار دەستو پێوەندی خۆی هەبوو لە بەختیاریەکان. لێرەو لە جنووبی عیراق موسەللەحی هەبوو، هەموو ئێرانی بوون. ئەوسا بڵاوەمان بە پێشمەرگە دەکرد، هەندێکم ناواخن کرد، بە ناوی ئێرانییەوە تەسجیلم دەکرد. قەولم دا ١٥٠٠ موسەللەحی بۆ سازکەمو کردم لە هەڵەبجەو سەیید صادقو خانەقین. هەم پارەمان لە حکوومەتی عیراق وەردەگرت، هەم بەختیار دەیدا. ئەوانەمان دامەزراندن. ساڵو نیوێك تەدریبمان پێ دەکردن. ضابطی عیراقی تەدریبی پێ دەکردن، دوو ئەفسەری پەیوەندیمان لەلا بوو.

ئەمن وا ناوی "بەختیار"م بیستبوو کە خوێنخۆرە، ئەوسا وانەبوو، ئینسانێکی موسالیمو بێوەیو نوێژکەرو ڕۆژووگر بوو، گۆڕابوو. هەموو حەفتان لە نەجەفو کەربەلا بوو، دەچوە لای خومەینی. بەوشێوەیە لە ١٩٧١ بەدواوە بەرەیەکمان لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی هەبوو، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانئ ئەوانی تریشی تێدا بوون. حدکا لە لایەنی ئیعلامیدا دەوری هەبوو، چەکداری نەبوو. جەریدەیەکمان هەبوو بە ناوی "راه اتحاد- ڕێگای یەکێتی- اتحاد یولی" بە کوردیو فارسیو تورکیی ئازەری. من مەسئوولی ئەوە بووم بە مەطبەعەی خەڵكو حکوومەت دەری کەم. ڕادیۆیەکمان هەبوو. دائیرەیەکی باشمان هەبوو، ئەووەڵەن تزیك قەصری جەمهووری، دوایە چووینە (کەڕادە) نزیکی موستەشفای (الراهبات) لە عیمارەتی (الزهراء). مەسئوولی ئەرشیفو بەڕێکردنی جەریدە بووم بۆ خاریج بە بەریددا. هەتا مەسئوولی ماڵی بووم. ئەو توودەییانە بەسەری ڕادەگەیشتن.

دکتۆر موراد بە ئەسڵ کوردو کرماشانییە، زابتی توودەیی بوو. دوایە چووە ناو فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان. کە ڕووخا، ڕای کرد بۆ باکۆ. کە ئینقیلابی ١٩٥٨ دەستی پێ کرد، سۆڤیەت ناردیەوە بۆ ئێرە. لە موئتەمەری پارتیدا مەلا مستەفا هەڵی بژارد بە ئەندامی لیژنەی ناوەندی*.

ڕۆژێك لە (باب الشرجي) بووم، خالید دلێر دیمی، گوتی ئاگات لێیە بەختیار تیرۆر کرا. ئەو هەمیشە دەچوە ڕاو. چوومە لای زەبیحی، پێش من زانیبووی. قەرار

---

* مامۆستا شاپەسندی پێش کۆچی یەکجاریی، وتی دکتۆر موراد لە ١٩٨١دا موخابەراتی عیراق لە ئیسپانیا غافڵکوژی کرد.

درا بەیانی زوو بچینە لای کە بریندار بوو. من و زەبیحی و عومەر دەبابە بە سەیارەکەی کاك عومەر چووینە (معەسکەر ڕەشید)، لەوێ ڕایانگوێستبوو. ئیتر هەر ئەو گومبوونە بوو. کوشتنی بەختیار موئامەرەیەکی دەولی بوو، عیراق و ئێران و ڕووسیا دەستیان تێدا بوو.

ئێستا بەختیار مابوو، توودەیی هاتبوونە ئێرە، ئیشیان لەگەڵ بەختیار دەکرد. ئەوەندەی پێ نەچوو ژەنراڵ مەحموودی پەناهیان و دوکتۆر مورادی ڕەزم ئاوەر ئیشوکاری بەختیاریان گرتە دەست، بەو ناوە کە تەواوی بکەن. ئەمما سۆڤێت ناردبوونی ئەو ئیشوکارانە تێك دەن، یەك کەسی نەهێڵن. نە من نە زەبیحی پێمان خۆش نەبوو ئیشیان لەگەڵ بکەین. ئەوانە لەگەڵمان ڕێك نەبوون، بەتایبەت مەحموودی پەناهیان کە بە ٢٠٠ کەسی دەیناردنە ئێران و دەیزانی مەخابەراتی ئێرانیان تێدایە، دەگیرێن و دەکوژرێن، بەڵام ئەو بەکوشتی دەدان.

ئەوی کوردستان کە لە معەسکەری نزیك (شەهرەبان) تەدریبمان پێ دەکردن، قیسمەتێکی زۆریان بەڕێ کردن بۆ (ڕەمادی). ١٠-١٢ مەفرەزەمان مابوو، جاروبار دەمانناردن بۆ ئەودیو بۆ دەست وەشاندن.

من کە ساڵی ١٩٧٥ لە ماڵی زەبیحی بریندار کرام، ئیتر نەچوومەوە لای ئەو توودەییانە. ئەوسا زەبیحی کە لە (بێرووت) هاتەوە گیرا، دوو ساڵ حوکم درابوو. ١٨ مانگی تەواو کردو خەریك بوو بێتە دەرێ. عامیلێکم لەگەڵ خۆم بردبوو کە ماڵەکەیم بۆ پاك بکاتەوە و غازو شتی وای بۆ پڕ کاتەوە، بەر چەقۆیانی دام. پێم وایە ئەمن بوو. بردیانم بۆ خەستەخانە.

زەبیحی لە بێرووت بوو. ئەو سەفەرە بەینێك مایەوە، "مام جەلال"ی دیبوو. ئەووەڵەن لە ئوتێلی (الشيخ) بوو، دوایە چووبوو بۆ لای مام جەلال. ئەوە ڕەفیق پشدەری باسی دەکا. کە هاتەوە، ڕەفیق پشدەری چوو بەپیریەوە، خستیە ناو سەیارەی خۆیەوە. ڕەفیق هەموو حەفتانە لە بێرووت بوو، "مام جەلال"یش لەوێ بوو، هاتوچۆی دەکردن بۆ ئەخبار. بەیانی پێش ئەوەی من بگەمە ماڵی زەبیحی، ئەو چووبوو هەڵی گرتبوو، بردبووی بۆ ئەمن، نەك لە مەتارەوە بیبا کە جوان نییە. من و "عەبدوڵڵا کانی مارانی"ش چووین. من ئاگام لە ئەووەڵی موئامەرەکە بوو کە چۆنیان بۆ زەبیحی تێچاندبوو. ئەو لایەنانەم هەموو ئاگا لێ بووە. زانیم ئەوجارە دەیکوژن. کەسی وام شك نەدەبرد کە بتوانێ ئەقەللەن لە کوشتن نەجاتی بدات. پەنام بۆ

خێزانی ژەنراڵ تەیمووری بەختیار برد، بەینم خۆش بوو لەگەڵیان، هاتوچۆم هەر دەکرد. خراپ پەشۆکابووم. گوتی حاجی ئەوە چیتە وا پەشۆکاوی؟ گوتم شتێکی خراپ قەوماوە، ئەگەر نەگەییە سەرمان تووشی شتی خراپ دەبین. هاتووم دەستت ماچ کەم، بەس تەنیا "زەبیحی"م لە کوشتن بۆ نەجات دەی. گوتی: بۆ؟ زەبیحی هاتەوە؟ گوتم هاتەوەو گیرا. لەپێشدا بەر لەوەی زەبیحی بێتەوە، هێندێکم بۆ گێڕابوەوە کە چۆن موعامەلە دەکرێ. ئەغلەب کە دەچوومە لای، ئەوزاعم بۆ دەگێڕایەوە. ژنێکی زۆر باش بوو، زۆر لێی نزیك بووم. هەستا یەکسەر نەیهێشت دەستی ماچ کەم. ڕۆی بۆ هۆدەی تەلەفۆنی سپڕی، لەگەڵ "ئەحمەد حەسەن بەکر" قسەی کرد. عەرەبییەکەی زۆر شکستەو سەیر بوو. ئەو سوێندی دەخوارد کە زەبیحی بێگوناهە، ئەحمەد حەسەن سوێندی دەخوارد کە جاسووسە. شتی وانەبوو، بۆیان تێچاندبوو. ئەمن دەزانم کێ بۆی تێچاندووە، بەڵام ئێستا ناتوانم ناوی ببەم. جارێ زۆر لایەن ماون.

ئەوە نزیکەی نیو سەعات زیاترە لەگەڵ ئەحمەد حەسەن قسە دەکا، نەخێر هەرچۆنێکی بوو ڕازیی کرد بۆ ئەوەی نەکوژرێ، چونکە سوێندی کابرای دا. یەکدوو ڕۆژ بەولاوە تەماشام کرد ڕایانگوێستبوو بۆ (فضیلیة) لە پەنا بەغدایە، هێندێك دوورە. ئەووەڵ ڕۆژ چووم حاشایان لێ کرد، گوتیان نەهاتووە. دووەم ڕۆژ چوومەوە، ئاخری دۆزیمەوە، هەموو گیانی شکابوو ئەوەندەیان لێ دابوو. ئەو شتی کە لازم بوو بۆ سجن، ئەوانەم بۆ جێبەجێ کردو هاتمەوە. کەس نەما، پیاوی دەسەڵاتدارو کوردێ کە شتێکی بەدەس بێ، نەچمە لای. حەتتا "عوبەیدوڵلای کوری مەلا مستەفا"و مەلا عەولا، هەموویان چووم، هیچیان شتیان پێ نەکرا. ئەو مەلا عەولایە بە منی دەکوت: عەریفێکی عەرەب لە من زیاتر دەستی دەڕوا. ئەوە ساڵی ١٩٧٣ بوو.

زەبیحی حەواڵەی مەحکەمەی مەجلیسی قیادەی ثەورە کرا. پێم وایە ئەو ساڵە کەمال موفتی لەو مەحکەمەیە بوو. کەمال تەقصیری نەدەکرد، ئەمما نەیدەوێرا. ڕۆژی موحاکەمە لەوێ حازر بووم. کە هێنایان دوو ساڵیان بەتەنگەدا دا. ئیتر هەر بەو سەیارەی شورتەیە کە هێنابوویان، لەگەڵی چوومەوە بۆ (فضیلیة)، ئەسبابەکانمان هەڵگرت یەکسەر بۆ (ئەبوو غرێب). لەوێ تەحویلم دا، خستیانە قاعەیەکی تەقریبەن ٢٠٠ کەسی تێدا بوو. خەریکی ئەوە بووم ئەوەشم بۆ جێبەجێ کرد، خستیانە هۆدەیەکی دوو نەفەرییەوە، کارایەکی تری لەگەڵ بوو. ئەو بەینە خزمەتم کردووە تا

له دوو ساڵەکە ١٨ مانگی تەواو کرد، چونکە ئەوی لە سجن سلووکی باش بێ لە ساڵەکە ٩ مانگی پێ دەکەن. ئەو ١٨ مانگەکەی تەواو کرد.

ڕۆژێك پێش دەرچوونی، من خەریك بووم بزانم ماڵەکەی چییەتی، کرێکارێکم لەگەڵ خۆم برد پێی خاوێن کەمەوەو ٢-٣ بوتڵی غازی بۆ پڕکەم. کابرا بەر چەقۆیانی دام. ئیتر کە زەبیحی لە سجن هاتە دەرێ، ئەمن لە خەستەخانە بووم. ئێمە ئاشنایەکمان لە بێرووت بوو. بە قسەی ئاشناکە دوایە پێش زەبیحی هاتەوە بەغدا بۆ منی گێڕاوە، زەبیحی کە دەچێتە بێرووت، گوتی گوایە دەڵێ من ساکێك ئەوراق و پارەی تێدایە، لای حاجیم داناوە. بەقسەی کابرا ئەوەی بۆ مام جەلال گێڕاوەتەوە. لە کابرا تووڕە بووم کە بۆی باس کردم، گوتم زەبیحی شتی وا ناڵێ، چونکە زەبیحی بۆ ئەو جووره شتانە سیڕی زۆر قایم بوو. هەمیشەش کە ڕۆیشتووە لە ژێکافەوە تا وەختێك ئەمە لەیەك جیابووینەوە، ماڵی من مەخفیگای ئەوراقی ئەو بووە. شتی وا ناڵێ و قەتم لێ نەبیستووە باسی شتی وا بکا. ئەگەر پارەی هەبووبێ، داویە بە خۆم کە بەجیا هەڵی گرم، نەیخستۆتە ناو ساکەوە. ساك هەمیشە ئەوراقی تێدا بووە.

دوایە کە زەبیحی هاتەوە لە دڵم گران بوو. ئەو کابرایە کە ئەو قسانەی کرد، پیاوێکی باش نەبوو. مام جەلال و زەبیحی و خەڵکی ترو هەمووومان دەمانناسی و دەشمانزانی پیاوێکی باش نییە. ئەو ڕۆژەی کە بریندار دەکرێم و لە خەستەخانە دەبم، ئەو دوکتۆر موراده سایەقێك دەنێرێ بۆ ماڵی ئێمە، دەڵێ ئێمە حاجیمان ناردووە بۆ (بەسرە) تا ٣-٤ ڕۆژی تر نایەتەوە. ئەو کوڕە لەوێ دەبێ، بڕوا بەوە ناکا، دەزانێ ئەمن بۆ بەسرە ناچم و بۆ لای کوردستان دەچم. دوایە وەشوێن سایەقەکە دەکەوێ پێش ئەوەی بڕوا؛ دەڵێ تۆ بۆچی ڕاستی بە من ناڵێی. خۆ من لای کەسوکاری دەنگ ناکەم، حاجی چیی بەسەر هاتووە؟! پێی دەڵێ وەڵڵا بریندارە، مەعلووم نییە بژی. ئەویش بەیانی دەزانێ جانتاکە لەکوێیە، بە ماڵەوە دەڵێ حاجی بریندارە، بڕۆن بیدۆزنەوە، بزانن لە چ خەستەخانەیەکە؟ ماڵ و منداڵ دێنە بەردەرگای خەستەخانەی (طوارئ). سێ ڕۆژ بەو جووره هاتبوون، هەتا نزیك عەسر لەوێ دەبوون و ڕێگایان نەدەدان. ئەمن شورتە لە بەردەرگاکەم ڕاوەستابوو. جا ئەو کابرایە نازانم ڕۆژی ئەووەڵە یا ڕۆژی دووەم بەسەر دیواردا دێتە ژوورەوەو خۆی دەخزێنێتە ماڵەوە، ساکەکە دەردێنێ و پارەکەی لێ دەردێنێ و دەیخاتەوە جێگای خۆی.

که له خەستەخانە بووم، مەلا عەولا هات. ئەمن لەگەڵ مەلا عەولا زۆر تێکەڵ بووم. نزیکەی بیست ڕۆژ مامەوە، چەقۆکە دابوویە سەر جگەرم، نزیکی (١ سم)ی لێ بڕیبوو. نەزیفی داخلیم هەبوو.

دوایە لە "زەبیحی"م پرسی: گوتم تۆ شتی وەهات لای ئەو کوڕە کوتووە کە ساکت لای ماڵی ئێمە داناوەو پارەو ئەوراقی تێدا بووە؟! سوێندی خوارد گوتی شتی وام نەگوتووە. جا من چۆن شتی وا دەڵێم. گوتم مەعقوول نییە کابرا شت بزانێ، ئەگەر تۆ پێی نەڵێی! هەر منو تۆ ئەو مەسەلەیە دەزانین. زەبیحی حاشای کرد.

دنیام لەسەر ئەو کابرایەی کوردی عیراق هێنایە دەنگ، بێفایدە بوو. لە زەبیحیو ئەوانە زۆر گەورەتر بوو. مەلا عەولا کە وەزیر بوو نەیدەوێرا شکایەتی لێ بکا. زەبیحی هەموو جارێك کە شتی لەلای من دادەنا، زوو نەیدەبردەوە؛ هەر وەختێکی لازمی بایە دەیبردەوە. ئەمن کە چاك بوومەوەو لە خەستەخانە هاتمە دەرێ، یەکدوو جار پێم گوت ساکەکەت بۆ بێنمەوە؟ گوتی عەجەلەم نییە، لازمم نییە جارێ مەیهێنەوە. پاش دوو یا دوو مانگو نیو داوای لێ کردم. بەیانی ساکەکەم بۆ بردەوە. ناغافڵ چووزانم دەست لەو ساکە دراوە. لەپێش چاوی خۆم کردیەوە، گوتی وەڵلا پارەی تێدا بووە، نەماوە. گوتم باشە ئەدی تۆ بۆ لە سجن دەڵێی من شتی وام نەگوتووە؟! نەمکوتووە پارەی تێدا بووە! باسی ئەو ساکەم نەکردووە! بێدەنگ بوو. ئەدەبییەن شت لە ماڵی من گوم بێ، ئاگام لێ بێ یا نەبێ من مەسئوولم. گوتم قەیناکە چەندە؟ ئەووەڵ گوتی ٢٧٠٠، دوایە تەئکیدم لێ کردەوە، گوتی وەڵلاهی لە ٢٣٠٠ کەمتر نییە. گوتم ئەمن لەوە ئەمینم ئەو پارەیەت دەدەمەوە، ئەمما ئەوە ئیشتیباهی خۆتە. نامەوێ خەڵك بڵێ لە ماڵی حاجی پارەی ڕۆیشتووە. تۆ لە هەووەڵی بە منت گوتبایە، جێبەجێم دەکرد، لە بەردەستانم نەدەهێشت. خانوەکەم بە ناوی خێزانەکەمەوە بوو، شەهادەی جنسییەی نەبوو. چوومە لای عەبدوڵلا کانی مارانی، لەگەڵ مودیری جنسییە ڕەفیق بوو. ئەو جێبەجێی کرد، شەهادەی جنسییەیان دا بە خێزانم. ئیتر هەرچۆنێکی بوو خانوەکەم خستە عەقارییەوە، خستمە سەر ناوی زاوایەکم. ئەو مەبلەغەی وا داوام کرد ٢٣٠٠ دینار بوو، بۆی وەرگرتم. ئەو ڕۆژەی چەکەکەیان دامێ، بانکی ڕافیدەین نەبوو. بانکێك هەبوو لەتەنیشتی ئەو. پارەکەمان وەرگرت. سەیارەکەی مەلا عەولامان پێ بوو. سایەقەکەی ئەوم بردبوو. لەوێوە وەرمگرتو هاتمە ناو سەیارەکە. پارەکەم دایە سایەقەکە، گوتم برۆ بیدە بە مەلا عەبدوڵلا با بیدا بە زەبیحی.

پارەکەم داوە. لەو ڕۆژانەدا لای عەبدوڵڵا کانی مارانیی موحامی بووم، زەبیحی هات. ئەوە جگە لەوەیە کە حیلمی زۆری حەول دا ئاشتمان کاتەوە، قەبووڵم نەکرد. شتەکە خەتای منی تێدا نەبوو، خەتاو ئیشتیباهی خۆی بوو. ئەو شت لەلای من دادەنێ، بۆ دەبێ لە جێگایەك بیڵێ؟! مەلا عەولاش گوتبووی: بۆ حاجی دەزانین لە خەستەخانەیە، ئەمما بۆ خێزانی عەیبەیە کە لە ماڵێ شت بدزێ! ئەمن ئەوەم پێ سەیر بوو. ئەوە پارەکە دەدەمەوە، من تاوانی ئیشتیباهی زەبیحی دەدەم، عەیبە بۆ بێتە سەر منو خێزانی من؟! وەڵڵا نامەیەکم بۆ مەلا عەولا نووسی، ئەوکاتە وەزیر بوو. گوتم مامۆستا عەولا بیستم باسی عەیبەت کردووە، ئەمما بەلای منەوە هەموو کەس باسی عەیبە بکا، بۆ تۆ نییە باسی عەیبە بکەی! ئەوەی بەلاوە گران بوو. جا لە مەقصەدم تێگەیشتبوو! چووبوە لای حیلمی گلەییی کردبوو، نامەکەشی دابوو بە حیلمی. حیلمی هاتە لام، بە ڕەحمەت بێ، گوتی چۆن شتی وا دەڵێی، ئەوە وەزیرە. گوتم ئەگەر پیاوە با بچێ بە حکوومەت بڵێ شتێکی وای پێ کوتووم، نەچوو.

حیلمی زۆری حەول دا، کوتی ڕێك کەونەوە لەگەڵ زەبیحی، با نەگاتە پچڕان. حەیفە ئێوە چەند ساڵە دۆستن. "عەبدوڵڵای کانی مارانی"ش زۆری حەول دا. ئەمن بەسەر دەممدا هات کوتم ئیدی ڕەفاقەتی ناکەم. "حیلمی"ش ڕاوەستابوو. دەرکەوتم، ئیتر هەر ئەو پچڕانە بوو. لە شارع ڕەشید لەگەڵ زەبیحی یەکترمان دەدیت، قسەمان لەگەڵ یەکتر نەدەکرد. ئەمما ئەو ڕادەوەستا تەماشای دەکردم تا ڕەت دەبووم، زۆر پەشیمان ببۆوە. گوێم نەدەدایە، زوڵمم لێ کرابوو. بۆ من یەکجار زوڵم بوو. ئەمن دوو ساڵ خزمەتی بکەم، وەڵڵاهی بێنانی تێریم نەکردووە. هەرچی ئیشتیای کردووە، بۆم بردووە. خۆمو ماڵو منداڵم لە خزمەتی سجنی "زەبیحی"دا بووین. ئەویش ئەوەی بەسەر هێناین. ئەمە لێك هەڵبڕاین.

زەبیحی لە شەستەکانەوە نیازی بوو فەرهەنگێك ساز کا.

(تەواو)

## سەرەتاکانی ژیانم

تا ساڵی ١٣٠٧ هەتاوی (ساباڵغ - مەهاباد) وەک هەر لە شارەکانی دیکەی
کوردستان دایرەی نفووسی تێدا نەبوو. ئەو بنەماڵانەی کە منداڵیان دەبوو،
لە پشت بەرگی قورئانی پیرۆز یا کتێبێکی وەک گوڵستان و بوستانی
شێخ سەعدی ناوی منداڵەکە و تاریخی لە دایک بوونی دەنووسرا..
تاریخی لە دایکبوونی منیش هەر وا بووە. باوکم دەیگێڕایەوە: ئەو ساڵەی
کە (سمایل ئاغای سمکۆ) ساباڵغی تاڵان کرد، من یەک ساڵە
بووم. لەگەڵ خوشکێکی لە خۆم گەورەتر بە نەخۆشی ئاوڵە [illegible]
لەو جێگادا کەوتبووین، شکاکەکان [illegible] کە لە
سەری کەوتبووین بە تاڵان بردبوویان.. لەم دوایە هەر لە بەر [illegible]
ناهەمواری باری ژیانی کە باوکم ماڵ و منداڵی هەڵگرت و بەرەو
(قاجری) نزیک (سنە) کۆچ دەکات و پاش ماوەیەک دووبارە
هەژاری ناچار دەبێ دیسان بگەڕێتەوە بۆ ساباڵغ.

بەهاری ساڵی (١٣٠٧)ی هەتاوی (١٩٢٨) زایینی دایرەی (نفووس)

ئەو سەردەمەمان بۆ زیندوو دەکاتەوە، و دەڵێ: «جارێک مەلایەکی لادێ لە پرسەیەکدا
هەندێکی قورئان خوێندن دەبێ، کە دەگاتە ئەم ئایەتە: «تتجافى جنوبهم عن المضاجع يدعون
ربهم خوفاً وطمعاً ومما رزقناهم ينفقون» ـ سورة السجدة، آية ١٧ ـ
بە زیکوورت ئامانەی (بولباس) لێ وون دەبێ، وا دەزانێ مەلاکە عەشیرەتی (جاف) دەکات،
لە پڕرا ڕاست دەبێتەوە و دەڵێ: خەڵکینە! چۆن دەبێ خوا لە قورئاندا باسی عەشیرەتی
جاف بکات، بەڵام باسی عەشیرەتی (بولباس) نەکات!؟.. ئەوی ئەوە نیە دەڵێ:
(تتجافى!) ئەوی بۆ نالێ: (تتبولباس)!»

زەبیحی لە ئەوەندەشیدا وەک باپیرە سۆفی مەنیش هەڵکەوتبوو، نوێژکەر و
ڕۆژووگر و پابەند بە ئەرکانی ئیسلام بوو، بۆیە لە بارەی دۆخێکی ئاوادا
باوەڕ ناکەم توانیبێتی دین و سیاسەت لە یەک هەڵاوێرێ!، لە سەر ئەوەشرا
ئەگەرچی نەرمستی ئاینی زەبیحی زۆر زۆر بوو، هەر لە شاری (تەوریز) سارد ببوو،
بگرە لە نوێژ و ڕۆژووش دوور کەوتبووە، بەڵام لە دەروونیدا پاشماوەی هەر
مابوو، ئەوانەت پاش ماوەیەک بیست ساڵی، واتا لە ساڵانی (١٩٦٥ - ١٩٦٦) دا
زمان و فەلسەفەی (شیخ محی الدین عربی) کاریگەریەکی زۆری خستبووە سەر مێشکی»

